محمد في أعينهم

زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

57

یامن الجنة

# محمد صلى الله عليه وسلم

# لە دیدی بیانیەکان دا

وەرگێڕانی

موزەفەر عەولا قەیسەری






# له دیدی بیانیەکاندا

نوسینی: یامن الحجه

وەرگێڕانی: مزەفەر عەولا قەسرێی







# له دیدی بیانیه‌کاندا


| | |
|---|---|
| نووسینی | یامن الحجه |
| وه‌رگێڕانی | مزه‌فه‌ر عه‌وملا قه‌سرێی |
| بڵاوکردنه‌وه‌ی | نوسینگه‌ی ته‌فسیر بۆ بڵاوکردنه‌وه‌و ڕاگه‌یاندن |
| نه‌خشه‌سازی نـاوه‌وه | مصعب ملا یوسف |
| خـه ت | نـه وزاد کۆیـــی |
| بــــــه‌رگ | أمین مخلص |
| نۆره و ساڵی چاپ | یه‌که‌م ١٤٣٥ك - ٢٠١٤ |
| تــــیراژ | ١٥٠٠ دانه |

له به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی گشتی کتێبخانه گشتییه‌کان ژماره‌ی
سپاردنی (٢٦) ساڵی ٢٠١٤ پێدراوه







نوسینگه‌ی ته‌فسیر
بۆ بڵاوکردنه‌وه‌و ڕاگه‌یاندن
هه‌ولێر - شه‌قامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob: +964 750 460 51 22
Tel: +964 750 818 08 66
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com

# پێشەكی

الحمد لله، أحمده وأستعينه وأستهديه وأستغفره..

وأعوذ بالله من شرور نفسي و سيئات أعمالي..

من يهده الله فهو المهتد..

ومن يضلل فلن تجد له وليّا مرشدا.

وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، أرسله رحمة للعالمين، وخاتما للنبيين، وإماما للمتقين، بأوضح دليل، وأفصح تنزيل، وأفسح سبيل، وأيسر تبيان وأبدع برهان.

پاشان:

ڕێسای (لادانی خراپە لەپێش هێنانی چاكەدایە) لەو كتێبەدا بە ڕونی ڕەنگی داوەتەوە.. چونكە دین و دنیا هەندێ سود و بەرژەوەندییان هەن، كە ئەگەر زیانیان لێكەوێت ئەوا سەرەنجامی هەردوكیان بەرەو هەڵدێر دەچێت و، هەندێ زیان و هەڕەشەشیان لەسەرن كە ئەگەر بێنەدی ئەوا هەردو دنیامان لەدەستدەچن..

هەرچی زیان و هەڕەشەكەیە ئەوا نەزانینی ڕاستی (محمد)ی پێغەمبەرمانە (ﷺ)،



کە زۆر جار ڕق و کینەو گاڵتەپێکردن بە کەسایەتییە گەورەو بەڕێزەکەی لێبەرهەم دێت و ترس و دورکەوتنەوەو دژایەتی کردنی ڕێبازەکەی لێ پەیدادەبێت، کە لەڕێی وەحی خوداییەوە بۆی هاتووە.

من وایدەبینم کە لادانی ئەو خراپەیە بە ناساندنی کەسایەتییەکەی دەبێت، بەڵام ئەو ناساندنەم لەڕێی قسەی مسوڵمانان و کتێبەکانیان نەکردووە، بەڵکو لەسەر زمان و پێنوسی بیرمەند و زانا و پزیشك و سیاسەتمەدار و فەیلەسوف و توێژەر و مێژونوس و پیاوانی ئایینی و ڕۆژهەڵاتناس و هەندێ کەسی دی لە نامسوڵمانەکان کەسایەتی ئەو زاتەم ناساندووە.

هەرچی چاکەکەیە ئەوا بانگەوازکردنە بۆ شوێنکەوتنی ئەو پێغەمبەرە گەورەو ڕێزدارە و باوەڕهێنانە بە قورئانە پیرۆزەکەی، ئەمەش وەدی نایەت تا ئەو خراپەیەی باسمان کرد لای نەدەین..

## ئەم کتێبە دەربارەی ئەم بابەتانەی خوارەوە دەدوێ:

یەکەم: خستنەڕوی چەند شایەتییەك لەسەر کەسایەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە تێیدا گەورەیی و هێمنی و خۆبەکەمزانی و زانست و خواپەرستی و زوهد و تەقوا و سۆز و بەزەیی و تەواوی هزر و بیرتیژی و جوانبێژی و ڕەوشت بەرزی و زمان پاراوی و مەجلیس خۆشی و گوفتار شیرینی.. ئەو زاتە باس دەکەین.

دووەم: خستنەڕوی چەند شایەتییەك لەسەر وەلامانی ئەو گومانەی کە گوایە پێغەمبەر قسەی بەدەم خواوە هەڵبەستبێت و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردبێت، ئەو شایەتییانە ڕاستی پێغەمبەرێتی و پەیامەکەی دەسەلمێنن و هیچ گومانێك ناهێڵنەوە، لەو بەشەدا پشتم بە خستنەڕوی پەرجووەکانی پێغەمبەر نەبەستووە، وەکو ئیسراو میعراج و دولەتبونی مانگ، هەروەك بوخاری و موسلیم لە سەحیحەکاندا هێناویانە: (أَنَّ

أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً فَأَرَاهُمْ الْقَمَرَ شِقَّتَيْنِ حَتَّى رَأَوْا حِرَاءَ بَيْنَهُمَا).واتە: خەڵكی مەككە داوایان لە پێغەمبەری خوا كرد بەڵگەیەكیان لەسەر پێغەمبەرێتییەكەی نیشان بدات، ئەویش ئاماژەی بۆ مانگ كرد و دولەت بو بەجۆرێك كە(حیرا) یان لە نێواندا دیاربو.

هەروەها باسی موعجیزەی كانیاوی ژێر پەنجەكانی پێغەمبەرم نەكردووە، هەروەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە: كاتی نوێژی عەسر بو هەموان بۆ دەستنوێژ گرتن بەدوای ئاودا دەگەڕان ، بەڵام ئاویان دەستنەكەوت، پاشان دەفرێكیان هێنایە لای، ئەویش دەستی خستە ناو دەفرەكە و فەرمانی پێكردن كە بێن دەستنوێژ بگرن، بینیم ئاو لەژێر پەنجە موبارەكەكانی هەڵدەقوڵا و هەمویان بەو ئاوە دەستنوێژیان گرت.

هەروەها موعجیزەی هەواڵدانی بە شتە غەیبییەكانی ئاییندەمان نەخستوتەڕو هەروەكو لە هەردو سەحیحەكەدا هاتووە: جارێكیان پێغەمبەری خوا هەمو شتێكی تا كاتی هەڵسانی قیامەت بۆ باس كردین، جا هەركەسێ لە ئێمە لەبەری كردبن ئەوا دەیانزانێت و هەركەسێكیش لەدەستی چوبن ئەوا نایانزانێت، جا هەركاتێ شتێك یان ڕوداوێكم دەدی، كە هەواڵی ئەو ڕوداوەم لەبیر كردبێت ئەوا وەك چۆن كەسێك كەسێك بناسێت و بۆ ماوەیەك نەیبینێت پاشان ببینێتەوە چۆن دەیناسێتەوە ئاواش من ئەو ڕوداوانەم دەناسینەوە.

لەم كتێبەدا پشتم بە خستنەڕوی ئەو موعجیزانە نەبەستووە، چونكە موعجیزەكان بە تەنیا بەڵگەنین لەسەر ڕاستی و دروستی بیروباوەڕ، بەڵكو موعجیزەی گەورە گۆڕینی بارودۆخی گەل و نەتەوەكانە بەبێ موعجیزە، گۆڕینی عەرەب لەوپەڕی نزمی و خراپی بارودۆخ و بەرزكردنەوەیان بۆ ئەوپەڕی بەرزی و شەرەفمەندی لەلایەن ئیسلامەوە و-لە ماوەیەكی كەمدا- كردنیان بە مەزنترین و بەبەزەییترین و دادگەرترین ژیار و شارستانییەت كە مێژو بەخۆیەوە دیبێ لە گەورەترین



موعجیزەکانە..

سێیەم: خستنەڕوی چەند شایەتییەك، کە تۆمەتی چەند ژنی-بە ئارەزوی- پێغەمبەر(ﷺ) دەڕەوێننەوەو لەڕێی چەند شایەتییەك لە سیرە و بەڵگەی عەقڵی وەڵامی ئەو تۆمەتانە دەداتەوە، پاشان چەند دەقێکی تەوراتمان هێناوە کە چەند ژنی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل دەسەلمێنن، کە پێمان دەڵێ ژمارەی هاوسەرەکانی یەکێك لە پێغەمبەران گەیشتوتە هەزار ژن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش نابینی کەسێك تانەو تەشەریان لێبدات یان تۆمەتی ئارەزوبازییان بداتەپاڵ!

چوارەم: خستنەڕوی چەند فەرمودەیەکی پیرۆز کە وەسفی پێغەمبەری خوایان تێدا هاتووەو هەندێ لەو فەرمان و ئامۆژگاری و ڕێنمونی و ئەو شتانەی فێرمان دەکات دەخاتەڕو.

پێنجەم: وەڵامدانەوەی هەندێ لەو گومانانەی دەربارەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وروژێنراون، گومانەکان زۆرن و زانایانیشمان لە زۆر لە کتێبەکانیان وەڵامیان داونەتەوەو تەوژمەکانیان ڕەواندونەتەوە.

شەشەم: خستنەڕوی چەند شایەتییەك لەسەر ئیسلام، کە باسی ئەو شتانە دەکەن کە لە ئیسلامدا هەن و لەگەڵ سروشتی ئێمەی مرۆڤدا دێنەوە و سۆز و بەزەیی و دادگەری و تەواوی و بێ کەموکوڕی ئیسلام دەخەنەڕو و دەیسەلمێنن کە لەهیچ لایەك و بەهیچ جۆرێك گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە.

حەوتەم: خستنەڕوی چەند شایەتییەك کە گومانی(بڵاوبونەوەی ئیسلام بە زەبری شمشێر) دەڕەوێنێتەوەو دواتر ئەوە دەسەلمێنێت کە ئیسلام بە بەزەیی و دادگەری و زانست و ئاشتی بڵاوبوەتەوە، پاشان لەڕێی مێژووەوە چەند شایەتییەکمان بۆدەخاتەڕو کە ڕێبازەکانی دی غەیری ئیسلام چۆن بڵاوبونەتەوە و چۆن جەنگەکانیان پڕبوون لە خوێن ڕشتن و ئەتککردنی ناموس و سوکایەتیکردن بە بەها پیرۆزەکان و بردنی



خێروبێری ولاتان..

هەشتەم: هەڵوەستەیەك دەكەین لەسەر سەرانە(الجزية)، كە-بە پێچەوانەی بانگەشەی دوژمنان- دەیسەلمێنێت كە ئیسلام بۆ ماندوكردن و ناچاركردنی پەیمانبەستووەكان داینەناوە تا بێنە ناو ئیسلام، بەڵكو ئەو سەرانەیە لە بەرانبەر زەكاتی مسوڵمانانە، كە دەكرێ چەند ئەوەندەی ئەندازەی ئەو سەرانەیەبێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە سەرانە لەسەر ژنەكانیان و منداڵەكانیان و هەژار و نەدارەكانیان و ڕاهیب و خواپەرستە لە خەڵوەتدابووەكانیان.. پێویست نەكراوە.

نۆیەم: خستنەڕوی چەند شایەتییەك، كە پێگەی ئافرەت لە ئازادی و یەكسانی و مافی خاوەنداریێتی و..تاد لە ئیسلامدا نیشاندەدات، هەروەها دەریدەخات كە چۆن چەندین ئافرەتی بەتوانا و زیرەك و زانایانی فەلسەفە ومێژو و وێژە و هۆزانڤانی و هەمو بوارەكانی ژیانیان تێدا هەڵكەوتوون..

دەیەم: خستنەڕوی چەند شایەتییەك، كە پێگەی زانست لە ئیسلامدا دەردەخات و دەیسەلمێنێت كە ئیسلام تاكە ئاینە كە هەمو دۆزینەوە زانستییەكان لەگەڵیدا كۆك و هاوتەریبن، سەرەڕای ئەوەی كە شوێنكەوتووەكانی-سەردەمی سەرەتایی- زانستەكانیان لە هەمو بوارەكانی ژیاندا بە ئەورووپاو شوێنەكانی تر ناساند..

پاشان چەند ئایەتێكی پیرۆزمان هێناون، كە بانگەواز بۆ: زانستە سروشتییەكان و زانستی زیندەزانی و مێژو و كۆمەڵایەتی و زانستی گەردونناسی و..زانستەكانی تر دەكەن، پاشان چەند ئایەتێكی پیرۆزمان هێناون كە لەڕاستیدا ڕاستی زانستین و ڕاستییەكەیان سەلمێنراوە.. لەوانە: كشانی گەردون و خولانەوە و جوڵەی زەوی و چینەكانی بەرگە هەوای زەوی و..تاد.

لە كۆتاییدا: بەشێكم بەناوی: (ئەوانە خوا هەڵیبژاردون) داناوە، كە تێیدا بە



کورتی دەربارەی ژیاننامەو چیرۆکی مسوڵمان بونیان دواوم، ئەوانیش: پیاوانی ئایین، زانایان و پزیشکان، سیاسەتمەداران، وەرزشوانان، چەندین کەسی تریش، کە ئیسلامیان کردوتە ئایینی خۆیان.

کتێبەکەم بۆ شەش بەش دابەش کردووە:

**یەکەم: محمد(ﷺ) لە دیدی ئەواندا.**

- بەدڵنیاییەوە ئەو پێغەمبەری خوایە.
- چەند ژنی پێغەمبەر(ﷺ).
- چەند دەقێك کە چەند ژنی پێغەمبەرانی ئەهلی کیتاب دەسەلمێنن.
- بەڵێ..ئەو بەوشێوەیە بو.
- چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت؟!

**دووەم: وەڵامدانەوەی هەندێ گومان لەسەر دوا پێغەمبەر.**

- گومانی ئەوەی کە کتێبە ئاسمانییەکانی پێشو مژدەی هاتنی ئەویان نەداوە.
- گومانی ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بە عەرەبی قسەی کردووە ئەدی چۆن پەیامەکەی جیهانییە.
- گومانی هاوسەرگیری کردنی لەگەڵ کوڕی بەکوڕکراوی خۆی زەیدی کوڕی حاریثە.
- گومانی حەرام کردنی ئەوەی خوا حەڵاڵی کردووە.
- گومانی جەنگانی لە مانگە حەرامەکاندا.
- گومانی ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) گوناهبارە هەروەکو لە قورئاندا هاتووە.



- گومانی ئەوەی کە شەیتان قسەی خزاندوتە نێو وەحییەوە.

**سێیەم: ئیسلام لە دیدی ئەواندا.**

- ئایا ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبوەتەوە؟!

- ئیسلام بە بەزەیی و..دادگەری و..زانست و..ئاشتی بڵاوبوتەوە.

- هەڵوەستەیەك لەسەر سەرانە.

- تۆ.. ئەقڵت لەکوێیە؟!

**چوارەم: ئافرەت لە دیدی ئیسلامدا.**

- حیکمەتی چەند ژنی.

- هەڵوەستەیەك لەسەر چەند ژنی.

**پێنجەم: زانست لە دیدی ئیسلامدا.**

-بانگەوازی قورئانی پیرۆز بۆ زانست و زانیاری.

- چەند ڕاستییەکی زانستی لە ئایەتەکانی قورئاندا.

- چەند ڕویەکی ئیعجازی قورئانی.

**شەشەم: ئەوانە.. خوا هەڵیبژاردون.**

- پیاوانی ئایین.

- زانایان و پزیشکان.

- بیرمەندان.

- سیاسەتمەداران.

- وەرزشوانان.



- هەندێ کەسایەتی دی.

لە خوای پەروەردگار دەخوازم کە کردارەکانم بە دڵسۆزی وەربگرێت و لە کەموکورتییەکانم ببورێت، هەر ئەوە تەنیا کەسم و هەر ئەویشە پشت و پەنام و سەرکەوتن و متمانەشم هەر بەدەست ئەوە.

یامن الحجه

دیمەشق: ٧ی جەمادی یەکەمی ١٤٣١

کۆچی ٢٠ی نیسانی ٢٠١٠زایینی.

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ سبا: ٢٨

واته: ئێمه ته‌نها بۆ هه‌مو خه‌ڵکی نه‌بێت، تۆمان ڕه‌وانه نه‌کردووه، له کاتێکدا که تۆ مژده‌ده‌رو ترسێنه‌ری بۆیان، به‌ڵام زۆربه‌ی خه‌ڵکی به‌م ڕاستییه نازانن...

* * *

((ده‌بێ مرۆڤایه‌تی شانازی به‌وه‌وه بكات كه كه‌سێكی وه‌كو محمدی تێدا هه‌ڵكه‌وتووه)).

شێریل

ڕاگری كۆلێژی ماف له ڤییه‌ننا

# محمد(صلى الله عليه وسلم) له ديدى بيانيه‌كاندا...

* ((گوستاف لوبون))Gustave le bun پزيشك و ميژونوسی فه‌ره‌نسی، له كتێبی ((حضارة العرب)) دا ده‌ڵێت: ((ئه‌گه‌ر پیاوان به كاره گه‌وره‌كانیان بپێورێن ئه‌وا((محمد)) گه‌وره‌ترین پیاوه كه مێژو به‌خۆیه‌وه بینیبێ)).لا ١١٥ .

هه‌روه‌ها ده‌ڵێ: ((محمد توانی ببێته پێشه‌وایه‌كی به‌رزی گه‌لانی عه‌ره‌بی، كه له‌پێشدا كه‌سی وایان تێدا هه‌ڵنه‌كه‌وتبو، تا له‌م داهێنانه‌دا گه‌وره‌یی محمد به‌دیارده‌كه‌وێ)) لا ١١٦ .

پاشان لوبون ده‌ڵێ: ((ئاینه‌كه‌ی محمد له هه‌مو ئاینێكی دی كاریگه‌ری له‌سه‌ر ده‌رونه‌كان زیاتره، ئه‌و گه‌له جیاوازانه‌ی قورئانیان كردوته ده‌ستور و پێشه‌وا تا ئێستاش كار به حوكمه‌كانی ده‌كه‌ن، وه‌ك چۆن به‌ر له سێزده سه‌ده كاریان پێده‌كرد))لا ٤١٧ .

هه‌روه‌ها له كتێبی ((دین الاسلام))دا ده‌ڵێت: ((محمد به‌ر له وه‌فاتی عه‌ره‌بی كۆكرده‌وه و كردنی به یه‌ك گه‌ل و ملكه‌چی یه‌ك ئاین و گوێڕایه‌ڵی یه‌ك پێشه‌وا، بێگومان ئه‌مه‌ش به‌ڵگه‌یه‌كی ڕونه بۆ گه‌وره‌یی ئه‌و)) لا ١٦ .

* (( ویل دیورانت)) Will Durant فه‌یله‌سوف و مێژونوس و نوسه‌ری ئه‌مریكی، له كتێبی ((قصة الحضارة)) دا ده‌ڵێت: ((محمد له گه‌وره‌ترین كه‌ڵه‌پیاوانی مێژو بو، توانی ئاستی ڕۆحی و ڕه‌وشتی گه‌لێك به‌رز بكاته‌وه، كه كه‌ش و هه‌وای گه‌رم و وشكی بیابان خستبویه تاریكایی نه‌فامی و دڕنده‌ییه‌وه...))٤٧/١٣ .

پاشان ده‌ڵێ: ((..له وه‌دیهێنانی ئه‌و ئامانجه‌شیدا سه‌ركه‌وتوبو، به جۆرێك كه له



مێژودا هیچ چاکسازێك نەیتوانی پێشی بکەوێتەوە، کەم وایە مروڤێك ببینین ئەوەی خەونی پێوەدیبێ هێنابێتیەدی))١٣/٤٧.

هەروەها لە کتێبەکەیدا((قصة الحضارة))دا هاتووە، کە ((جۆرج برنارد شۆ))George Bernard shaw – کە نوسەرێکی شانۆگەری ئێرلەندییە و لە ساڵی ١٩٢٥ز خەڵاتی نۆبڵی لە ویژە(ئەدەب)دا وەرگرتووە، گوتویەتی: ((ئەگەر بەوە بڕیار لەسەر گەورەپیاو بدەین کە چەندە کاریگەری لەسەر خەڵك هەیە، ئەوا دەڵێین: محمدی پێغەمبەری مسوڵمانان گەورەترین گەورەپیاوی مێژووە، چونکە دەمارگیری و خوڕافیاتی لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵکێشا و لە سەروی ئاینی جولەکەو گاور و ئاینی کۆنی گەلەکەی، ئاینێکی بەهێز و ڕونی دامەزراند..))١٣/٤٧.

* مارسێل پۆزارM.Poizarبیرمەند و یاساناسی فەرەنسی، لە کتێبی ((انسانية الاسلام))دا دەڵێت: ((لەڕوی مێژوییەوە محمد تەنیا بانگخوازی ئاینێك نەبو، بەڵکو لە هەمان کاتدا دامەزرێنەری سیاسەتێك بو کە ئاراستەی مێژوی گۆڕی و کاری کردەسەر چالاك بون و فراوان بونی بازنەی ئیسلام))لا٤٢.

لە بارەی باس کردنی مێژو بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دا دەڵێت: ((مێژو محمد وەك سەرکردەیەکی مەزن دەردەخات، کە دڵی پڕ لە بەزەیی بێت، هەروەها وەکو پیاوی دەوڵەتی بەرز و بەهێز وێنای دەکا و، وەك خاوەن سیاسەتێکی دروست دەیخاتەڕو، کە لەگەڵ هەمواندا بە دادگەرانە مامەڵە دەکات و مافی هەمو خاوەن مافان وەك یەك دەدات))لا ٤٦.

پاشان دەڵێت: ((..محمد، ئەو پیاوەی زانی چۆن ڕەزامەندی زۆرترین خەڵك بەدەست بێنێت، پێویستە مروڤێك بێت لەسەروی ئاستی مروڤایەتی، هەروەها ئەوە وادەخوازێ یەکێك بێت لە پێغەمبەرە ڕاستەقینەکانی خوا)) لا٤٦.

*فرانز ڕۆزێنسال Franz Rosenthal: توێژەری پێوەندی نێوان جولەکەو



مسوڵمانان و ڕێبازی زانایانی مسوڵمان لە توێژینەوەی زانستیدا، لە کتێبەکەی ((علم التأريخ عند المسلمين)) دەڵێت: ((کەسایەتی محمد هەردەم هێڵی ناوبڕی ڕونی ئاراستەی مێژو بووە)) لا ٤٠.

*لۆسرۆب ستۆدارد Lothrob Stoddard: نوسەرێکی ئەمریکییە کە بە زانیاری زۆری لەسەر پێشهاتەکانی جیهانی ئیسلامی هاوچەرخ بەناوبانگە، لە کتێبەکەیدا((حاضر العالم الاسلام)يدا دەڵێت: ((سروشتە ئایینییەکەی محمد بەهۆی ئەو دڵسۆزییە کەم وێنەیەی هەیبووە هەمو توێژەرێکی وردبینی هەقبێژ سەرسام دەکات)) ٣٢/١.

پاشان هەندێ سیفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەخاتەڕو، دەڵێت: (("محمد"خاوەنی ڕەوشتێکی بەرزو، مەجلیس خۆش و، گوفتار شیرین و، بڕیار دروست و، ڕاستگۆ بو، بەتایبەتی سیفەتی حوکمی بەجێی تێدابو، ڕاشکاوانە دەدوا و، باوەڕی تەواوی بەهەمو ئەو کردار و گوفتارانە هەبو کە ئەنجامی دەدان)) ٣٢/١.

*جۆرج سارتۆن George Sarton: ڕۆژهەڵاتناسێکی بەلجیکییە، کە دکتۆرای لە زانستە سروشتییەکان و بیرکاریدا هەیە، لە کتێبەکەیدا"الثقافة العربية في رعاية الشرق الأوسط"دەڵێت: "محمد" تەنیا پێغەمبەری ئیسلام نەبو، بەڵکو پێغەمبەری زمانی عەرەبی و ڕۆشنبیری عەرەبی بو، بە چاوپۆشین لە ڕەگەز و ئایینی قسەکەرانی زمانەکە"لا ٤٣.

پاشان دەربارەی گشتگیری بانگەوازەکەی دەڵێت: پێغەمبەر"محمد"لە بانگەوازەکەیدا لە هەمو پێغەمبەرانی دی قوڵتر و گشتگیرتر بو"لا ١٤٠.

هەر دەربارەی ئەوەوە دەڵێت: "ئەو زاهید و، شەرع زان و، یاسا دانەر بو و، پیاوێکی تەواو کرداری بو" لا ٣١.



*هێنری سیرۆیاH. Serouya: ڕوژهه‌ڵاتناسێكی فه‌ڕه‌نسییه‌، له‌ كتێبه‌كه‌یدا "فلسفة الفكر الإسلامي"یدا ده‌ڵێت: "محمد" ته‌نیا بنه‌مای یه‌كتاپه‌رستی له‌ ده‌رونی عه‌ره‌بدا نه‌چه‌سپاند، به‌ڵكو شارستانییه‌ت و وێژه‌(ئه‌ده‌ب)یشی فێركردن" لا٨.

*ئیتین دینیێتET. Dinet ڕوژهه‌ڵاتناسێكی فه‌ره‌نسییه‌، مسوڵمان بو و ناوی خوّی گوّڕی بوّ(ناسره‌ددین)، له‌ كتێبه‌كه‌یدا"أشعة خاصة بنور الإسلام" ده‌ڵێت: " ئه‌و كه‌سایه‌تییه‌ی محمد له‌ژێر عه‌باكه‌یدا هه‌ڵی گرتبو ئاسایی نه‌بو و كاریگه‌رییه‌كی گه‌وره‌ی هه‌بو" لا١٥.

هه‌روه‌ها ده‌ڵێ: "پێغه‌مبه‌ری ئیسلام تاكه‌ پێغه‌مبه‌ره‌ له‌نێو هه‌مو پێغه‌مبه‌راندا، كه‌ بوّ ته‌واوكردنی په‌یامه‌كه‌ی پشتی به‌ په‌ڕجو(معجزه‌) نه‌به‌ستوه‌ و كوڵه‌گه‌و چه‌كی ئه‌و ته‌نیا ڕه‌وانبێژی قورئانی پیروزبو" لا١٦.

*ڕوّم لاندوّR. Landau په‌یكه‌رساز و ڕه‌خنه‌گری هونه‌ری ئینگلیزی و ماموّستای زانسته‌ ئیسلامییه‌كانه‌ له‌ سان فرانسیسكو، له‌ كتێبه‌كه‌ی"الاسلام والعرب"دا ده‌ڵێت:"محمد هه‌ر له‌ فیتره‌تدا پارێزكاربو، هه‌روه‌ها به‌بێ هیچ گومانێك ئاماده‌بو بوّ هه‌ڵگرتنی په‌یامی ئیسلام" لا٣٣.

پاشان ده‌ڵێت:"..هه‌روه‌ها محمد باوه‌ڕێكی هه‌بو كه‌ له‌گه‌ڵ یه‌كتاپه‌رستیدا تێكنه‌ده‌گیرا...هه‌روه‌ها نیازی ئه‌وه‌ی هه‌بو، كه‌ هه‌مو شوێنه‌وارێكی بتپه‌رستی، كه‌ له‌نێو بتپه‌رستانی عه‌ره‌بدا بڵاوبو له‌ڕه‌گ و ڕیشه‌وه‌ هه‌ڵكێشێت" لا٣٣.

*هێربێرت جوّرج وێلزH. G. Wells نوسه‌ر و ئه‌دیبی به‌ریتانی، له‌ كتێبه‌كه‌ی"معالم تأريخ الانسانية"یدا ده‌ڵێت: "محمد ساڵێك به‌ر له‌ وه‌فاتی حه‌جی ماڵئاوایی له‌ مه‌ككه‌وه‌ بوّ مه‌دینه‌ ئه‌نجامدا، له‌وكاته‌دا ئاموژگارییه‌كی گه‌وره‌ی پێشكه‌شی گه‌له‌كه‌ی كرد..بڕگه‌ی یه‌كه‌می هه‌مو ڕاوڕوتی و یاخی بون و خوێن ڕشتنی به‌رده‌م مسوڵمانه‌كانی ڕاده‌ماڵی... بڕگه‌ی كوّتاییشی كه‌سی قوله‌ڕه‌شی ده‌كرده‌



هاوتای خەلیفە.." لا/٣٢/٦٤٠.

*لویس سیدیۆ Louis Amelie Sedillot ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسییە، مۆڵەتی مافناسی هەیە، لە کتێبەکەی"تأریخ العرب العام"دا دەڵێت: "ئیتر کاتی ئەوە هاتووە سەرنجی مێژوی ئەو گەلە بدەین، کە لە گۆشەیەکی ئاسیادا ون بو و بۆ بەرزترین پایە بەرزبووەوە و ناوی لەگەڵ ئاسۆکانی دنیادا بەرزبۆوە...سەرچاوەی ئەو موعجیزەیەش تەنیا پیاوێك بو، ئەویش: محمد بو"لا١٥.

هەروەها لەبارەی وەسفکردنی پێغەمبەر"ﷺ"دەڵێت: "..هێمن و ئارامگربو، هەژار و نەدارانی دەهێنایەماڵەوە تا خواردنەکەیان لەگەڵدا بەشبکات، بە هێمنی و ڕوخۆشییەوە پێشوازی لەهەمو ئەو کەسانە دەکرد، کە دەیانویست پرسیاری لێبکەن، هەمو ئەو کەسانەی قسەیان لەگەڵ دەکرد، بەهۆی ڕووە نورانی و خەندە جوانەکەی توشی سەرسامی دەبون، هەرگیز لە گفتوگۆی دوورودرێژ بێزارنەدەبو، کەم قسەی دەکرد، قسەکانی هەرگیز خۆ بەزلزانییان پێوەدیارنەبو.."لا١٠٢.

*هێنری ماسیH. Masseۆ ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسییە، ڕێکخراوی یونسکۆ بۆ لیژنەی ڕۆژهەڵاتناسان هەڵیبژارد، لە کتێبی"ئیسلام"دا دەڵێت: " بەهۆی چاکسازییە ئایینی و سیاسییەکانی محمد، کە لە بنچینەدا بۆ یەکخستنەوەبو، عەرەبەکان هۆشیان هاتەوەبەر و خۆیان دۆزیەوە و لە تاریکی نەفامی و گێرەشێوێنی ڕزگاریان بو.." لا٥٥.

پاشان دەڵێ: " محمد یاسا دانەری سروش بۆهاتوبو و دامەزرێنەری یەکێتی ئایینەکانی نێوان گەلان بو..سادەبو، بەڵام لەهەمان کاتدا وردبین و دووربین بو"لا ٥٩.

*ولیام مونتگۆمری وات W. Montgomery Watt ڕۆژهەڵاتناسێکی هاوچەرخی بەریتانییە و ڕاگری بەشی توێژینەوەی عەرەبییە لە زانکۆی "ئەدنبرا"، لە کتێبەکەی"محمد فی مکّة" دەڵێت: " ئامادەباشی ئەو پیاوە لەوەدابو، کە لەپێناو بیروباوەڕەکەی بەرگەی هەمو چەوساندنەوەیەکی دەگرت، سروشتی ڕەوشت بەرزی



وای لە شوێنکەوتوانی کرد باوەڕی پێبێنن و بیکەنە پێشەوا و سەرکردەی خۆیان، سەرەڕای دەستکەوتە ڕەها و مەزنەکانی، هەمو ئەوانە بەڵگەن بۆ دادگەری و پاکی ڕەسەن لە کەسایەتییەکەیدا" لا ٩٤.

هەروەها دەڵێ: "هەرکە بیر لە مێژوی محمد و مێژوی سەرەتای هاتنی ئیسلام دەکەینەوە، توشی سەرسوڕمان دەبین لە بەرانبەر ئەو کارە گەورەیەدا، ئەگەر پێغەمبەر نەبوایە، ئەگەر پیاوی شیاوی دەوڵەت و بەڕێوەبردن نەبوایە، ئەگەر متمانەی بە خوا نەبوایەو باوەڕی تەواوی نەبوایە کە خودا ڕەوانەی کردووە، هەرگیز نەیدەتوانی بەشێکی گرنگی مێژوی مرۆڤایەتی بنوسێتەوە!" لا ٥١٢.

پاشان دەڵێ:"..من هیواو متمانەم بەوە هەیە، کە ئەو لێکۆڵینەوەیە بتوانێ یارمەتیدەربێ بۆ دوبارە گرنگیدان بە پیاوێك، کە گەورەترین پیاوی نەوەی ئادەمە" لا٥١٢.

*جاك ریسلەرJ. S. Restler توێژەرێکی فەرەنسی هاوچەرخە، لە کتێبی"حضارة العرب"دا دەڵێت:" لەسەر محمد پێویست بو بەزوترین کات سەرکەوتنی گەلی عەرەبی بخاتەڕو، دوای ئەوەی خوا نیعمەتی بەسەردا باراند و ئایینێکی بەرز و سادەو ڕونی بۆ نارد، ڕێبازێك کە یەکلاییکەرەوەبو لە ڕوبەڕوبونەوەی دڵەڕاوکێی بەردەوامی بیروباوەڕە ئایینییەکان" لا٣٧.

پاشان دەڵێت: "..دوای ئەوەی زانیمان کە ئەو کارە گەورەیە بەئەنجام گەیەنرا و لە کەمترین کاتدا گەورەترین هیوای بۆ مرۆڤایەتی بەدەستهێنا، ئەوا ئەوکاتە پێویستە دان بەوەدا بنێین، کە محمد یەکێکە لەو گەورەپیاوانەی مێژوی گەل و ئایینەکان شانازی پێوە دەکەن" لا٣٧.

*لامارتینAlphonse de Lamartine مێژونوس و سیاسەتمەدار و هۆزانڤانێکی فەرەنسییە، لە کتێبەکەی"السفر الی الشرق"دا دەڵێت: "گەورەترین



ڕوداوی ژیانم ئه‌وه‌یه، كه به هۆشیاری له‌ژیانی محمدم كۆڵیوه‌ته‌وه و توانیومه درك به‌و گه‌وره‌یی و نه‌مرییه بكه‌م كه له‌ژیانیدا هه‌بووه" ل٢٧٧.

پاشان ده‌ڵێت:" ڕه‌فتاری ئه‌و له‌كاتی سه‌ركه‌وتن و ئاره‌زوی گه‌یاندنی په‌یامه‌كه‌ی و نوێژه درێژه‌كانی و گفتوگۆ ئاسمانییه‌كه‌ی، هه‌مو ئه‌وانه نیشانه‌ن بۆ باوه‌ڕێكی پته‌و، كه یارمه‌تی ده‌ربو بۆ جێگیر كردنی پایه‌كانی باوه‌ڕ" ل٢٧٧.

پاشان وه‌سفی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌كات، ده‌ڵێت: "..پێغه‌مبه‌ر وتاربێژ و یاسا دانه‌ر و ڕزگاركه‌ر و چاكسازی بیرو باوه‌ڕه‌كانی دی بو، په‌رستشێكی هێنا، كه له‌سه‌ر گه‌وره ڕاگرتنی وێنه‌و په‌یكه‌ر دانه‌مه‌زراوه، ئه‌ویش: (محمد) ە" ل٢٧٧.

پاشان لامارتین ده‌پرسێ: "كێ ده‌توانێ پیاوێك له مێژودا به محمد بچوێنێ؟! به‌پێی هه‌مو پێوه‌ره‌كانی پێوانی گه‌وره‌یی مرۆڤ، كێ له محمد گه‌وره‌تره؟!"ل ٢٧٧.

*ئه‌و پرسیاره‌ی لامارتین له‌ساڵی ١٨٥٤ز له پاریس كردویه‌تی، دكتۆری ئه‌مریكی (مایكل هارت)Michel hart وه‌ڵامی ده‌داته‌وه، كه ئه‌ندامی كۆمه‌ڵه‌ی فه‌له‌كناسی زانستی هه‌ساره‌ناسییه و یه‌كێكه له زانا متمانه‌پێكراوه‌كانی فیزیای كرده‌كی، له كتێبه‌كه‌یدا(١٠٠ كاریگه‌رترین كه‌سی مێژو) The 100:a ranking of the most influential persons in history كه تێیدا پێغه‌مبه‌ری خوا محمد(ﷺ)ی له سه‌روی لیستی گه‌وره‌ترین پیاوی مێژوی مرۆڤایه‌تی داناوه، ده‌ڵێت:

"هه‌ڵبژاردنی محمد له‌سه‌روی لیستی كاریگه‌رترین پیاوی مرۆڤایه‌تی، له‌وانه‌یه هه‌ندێ خوێنه‌ر توشی سه‌رسوڕمان بكات و له‌وانه‌یه هه‌ندێكیان پێی ڕازی نه‌بن، به‌ڵام به ڕاشكاوی ده‌ڵێم ئه‌و تاكه پیاوی مێژووه، كه سه‌ركه‌وتنێكی به‌رچاوی له هه‌ردو ئاستی دینی و دنیایی به‌ده‌ستهێنابێت" ل ١٩.

پاشان د.هارت ده‌ڵێت: "محمد گه‌وره‌ترین ئایینی جیهانی هێنا و بڵاوكرده‌وه و



بووه یەکێك لە پێشەوا سیاسیە جیهانیە گەورەکان، ئا لەو ڕۆژگارەداو دوای تێپەڕبونی نزیکەی سێزدە سەدە بەسەر وەفاتیدا، کەچی هێشتا کاریگەریەکی بەهێز و گەورەی هەیە"لا ١٩.

*ئیڤلین گۆبۆڵد Lady. Gobold ئافرەتێکی خانەدانی ئینگلیزییە، کە بوەتە مسوڵمان، لە کتێبەکەی "البحث عن الله"دەڵێت: "بەرلە هاتنی محمد عەرەب گەلێکی بێڕێز و کەم بایەخ بو، هۆز و کۆمەڵەکانی هیچ بەهایەکیان نەبو، بەڵام کاتێك محمد هات سەرلەنوێ ئەو گەلەی زیندو کردەوە، بەجۆرێك کە دەکرێ بڵێین ئەو کارەی لە موعجیزە نزیك بو" لا ٥١.

پاشان دەڵێت:" پێغەمبەر ئەوکاتە توانی موعجیزەو کاری سەرسوڕهێنەر ئەنجامبدات، ئەوکاتەی توانی ئەو گەلە سەرڕەق و پێداگرە والێکات دەستبەرداری بتەکانیان بن و یەکتاپەرستی قەبوڵ بکەن...بەمەش لە تاریکی و نەفامی دەریهێنان و بەرەو ڕوناکی و فامکردن ڕێنوێنی کردن" لا٦٦-٦٧.

یەکێك لەو بڕگە خۆشانەی تێیدا وەسفی پێغەمبەری خوا محمد(ﷺ) دەکات دەڵێت:"ئەو بیری لە نازناو نەدەکردەوە و هەوڵی نەدەدا بە نازناوەکەی ماڵ و سامان وەدەستبێنێت، بەڵکو تەنیا بەوە وەستا کە پێغەمبەری خوایە و خزمەتکاری مسوڵمانانە! خۆی ماڵی خۆی پاك دەکردەوە، خۆی پێڵاوەکەی دەدورییەوە، بەبەزەیی و بەخشندەبو، وەکو شنەبا وابو، هیچ هەژار و دەستکورتێك داوایان لێنەدەکرد، کە لەوەی هەیەتی پێی نەبەخشێت، ئەوەی هەشی بو زۆرکات بەشی خۆیشی نەدەکرد" لا ٦٧.

*نەسری سەلهەبN. Salhabمەسیحییەکی لوبنانییە، کە بە دیدی بابەتیانەی و گەڕان بەدوای ڕاستیدا ناسراوە..لەکتێبەکەیدا"في خطا محمد"دا دەڵێت:"مەلوتکەیەك چاوی بەدنیا هەڵێنا، کە لەکاتی لەدایکبونیدا هەرگیز بەبیری



دایکیدا نەدەهات، کە دەبێتە گەورەترین پیاوی جیهان، بەڵکو گەورەترینی مێژو، نا گەورەترین پیاو بە هەمو پێوەرەکان" لا ٤٢.

هەروەها ئاماژە بۆ دەستکەوتەکانی پێغەمبەرمان دەکات و دەڵێت:"هەرکەسێ بە وردی سەرنجی ژیاننامەی ئەوپیاوە بدات، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە ددان بەوەدا بنێت، کە ئەو دەستکەوتانەی وەدەستی هێناون، لە دنیایەکی تری جیاواز لەو دنیایە بووە، کە مرۆڤ دەیناسێ" لا ١٩٥.

پاشان دەربارەی ئەو موعجیزەیەی محمد خولقاندی، بەوەی بە ماوەیەکی کەم عەرەبی لە پەراوێزی مێژو بۆ بونیادنەرانی مێژو بەرزکردەوە، دەڵێت:"گەورەیی محمد لێرەدایە، بەو ماوە کەمە توانی شەریعەتێکی پڕ ڕەوشتی گیانی و کۆمەڵایەتی، کە لەمێژودا هیچ کەس نەیتوانیوە بەو خێراییە سەرسوڕهێنەرە ئەو کارە گەورەیە بەئەنجام بگەیەنێت"لا ١٩٦.

پاشان دەڵێت:" محمد تەنیا پێغەمبەر نەبو، کە خەڵك بەرەو باوەڕ ڕێنمونی بکات، بەڵکو پێشەواو سەرکردەی گەلێك بو و، هەوڵیدا لەو گەلە باشترین و بەرزترین گەلی دنیا دروستبکات و لەکۆتاییشدا توانی ئەوە وەدی بێنێت" لا ٤٠٩.

*تۆماس کارلیلThomas Carlyle نوسەر و مێژونوس و فەیلەسوفێکی ئینگلیزییە، لە کتێبی"الأبطال وعبادة الأبطال"دا دەڵێت:" بەدرێژایی ژیانی خاوەن باوەڕێکی جێگیربو، هیممەتێکی بەرزی هەبو، خەمخۆر بو، بەخشندە و چاکەکار بو، بەبەزەیی و خواپەرست بو، خاوەن پیاوەتی و ئازاد بو، کۆڵنەدەر و دڵسۆز بو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەجلیس خۆش بو، خوڕەوشتێکی نەرم و نیانی هەبو، ڕوخۆش و شادمان بو، خۆش ڕەفتار و گوفتار شیرین بو، دەتوانین بڵێین گاڵتەشی دەکرد، بەگشتی خەندەیەکی درەوشاوە لەڕویدا بەدیدەکرا، کە لە دڵ و دەرونێکی ڕاستگۆوە سەرچاوەی گرتبو.. بیرتیژ و هۆشیاربو.. هەر لە فیترەتدا گەورەپیاو بو، لە قوتابخانەدا



ڕۆشنبیری وەرنەگرتبو، لەسەر دەستی هیچ مامۆستایەك وانەی پێنەدرابو، ئەو هیچ پێویستی بەوە نەبو.."لا ٥٠-٥١.

هەروەها دەربارەی خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڵێت: "من محمدم خۆشدەوێ، چونکە سروشتی ئەو دوربو لە خۆ دەرخستن و خۆتواندن.. تەنیا پشتی بەخۆی دەبەست، هەرگیز بانگەشەی شتێکی نەدەکرد لەخۆیدا نەبێت، لوتبەرز نەبو، بەڵام لەبەرانبەریشدا نزم و کەساس نەبو.. ئازادانە لەگەڵ قەیسەری ڕۆم و شای عەجەمدا دەدوا، پێی ڕاگەیاندن، کە لەسەریان پێویستە چی بکەن بۆ ژیانی دنیا و دواڕۆژیان، بەڕاستی ئەو پێگەی خۆی دەزانی" لا ٦٤.

*د.نەزمی لوقا Dr. N. Lukaمەسیحییەکی میسرییە، کە بە دیدی بابەتیانەو دڵسۆزی بۆ ڕاستی بەناوبانگە، لەکتێبی "محمد الرسالة والرسول"دا دەڵێت: "..محمد وەکو هیچ تاکێکی خەڵك نەبو لەڕوی ڕەوشت و لێهاتوییدا، خەسڵەتی پێغەمبەران و هیممەتی پاڵەوانانی تێدا کۆبوبووەوە، بۆیە لەسەر مرۆڤی حەقدۆست پێویستە دان بە پێشەوایی ئەودابنێت و بە گەورەپیاوی ببینێت" لا ٢٨.

پاشان دەربارەی گەورەیی و خۆبەکەمگری و ڕەوشتی بەرزی دەڵێت: "..تاکە پیاوبو، زوبانی ئاسمان بو، تەنیا خوای لەسەرو بو و گشت بەندە باوەڕدارەکانی مسوڵمانانیشی لەژێر دەستدابون، بەڵام ئەوپیاوە ڕەتی کردەوە توشی خۆ بەزلزانی ببێت، بەڵکو لەبەرانبەردا بەبەزەیی و بەخشندەبو.."لا ١٧٩.

پاشان دەڵێ: "...خۆ ئەگەر ئەو پێغەمبەرە بەهۆی زۆری ئەوانەی –خودا– لەسەردەستی هیدایەتی دان و بەهۆی وەدیهاتنی ئەو گەورەیی و دەسەڵاتەو، جێگیربونی دەسەڵات، ئەگەر بەهەمو ئەوانە ستەمی کردبا یان فیزی لێدابا، ئەوا هیچ تاوانێکی لەسەر نەبو، چونکە ئەوکات بەهۆی بەهایەکەوە ستەمی دەکرد و بەهۆی ڕەوشتێکی بەرز و بەڕێزیش لافی لێدەدا"لا١٧٩.



لەسەر باسی خۆبەکەمگری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "هاوەڵانی پێیاندا هەڵدەگوت، کەچی پێی دەفەرمون: ئەوەندە بەسەرمدا هەڵمەڵێن و بەوئەندازەیە گەورەم مەکەن، هەروەك چۆن گاورەکان عیسای کوڕی مەریەمیان گەورەکرد، بەڵکو بڵێن:بەندەی خوا و پێغەمبەری خوا)، یان ئەوکاتەی دەچێتە نێو کۆمەڵێك لە هاوەڵانی و ئەوانیش لەبەری هەڵدەستن، ئەویش لۆمەیان دەکات لەسەر ئەو کارەو پێیان دەفەرموێت: (وەکو عەجەمەکان مەکەن، یەکتری بەبەرز ڕامەگرن و لەبەر یەکتر هەڵمەستن)" لا ١٨٠.

هەروەها لوقا لە کتێبی "محمد في حیاته الخاصة"دەڵێت: "باوکی قاسم-واتە محمد(ﷺ) -ئەو پیاوەی، کە بە ملیۆنان خەڵکی لە بتپەرستی دەرهێنان و بەرەو پەرستنی خوای جیهانیانی بردن، هەروەها لە لەدەستچون و لاوازی بەرەو بەرزی و باوەڕی بردن"لا١٢.

*د.نەسیم سوسە Dr. A. N. Sousa ئەندامی کۆمەڵەی زانستیی عێراقی، کە بوتە مسوڵمان، لە کتێبی"في طریقي الى الإسلام"دا دەڵێت: " پێغەمبەری ئیسلام کەسایەتییەکی مێژویی مەزن بو، ژیانی ئەو پێغەمبەرە تەنیا زنجیرە ڕوداوێکی ڕاستی مێژویی گەورە و ئامانجدارن، کە تێیاندا پێگەی گەورەی مرۆڤایەتی ئەو پێغەمبەرەی تێدا دەردەکەوێت"١/١٧٤.

پاشان دەڵێت:"محمد بە مێژو و ژیاننامەکەی و ڕاستی باوەڕی و چەسپاوی باوەڕی، پێشەوای مرۆڤایەتی و نمونەیەکی بەرزی دەستپاکی و دڵسۆزی و بەردەوامی بو و، ئەو قوربانییانەی لەپێناو گەیاندنی پەیامەکەیدا پێشکەشی کردن دیارترین و باشترین نمونەن بۆ بەرزی خود و کەسایەتی ئەو و گەورەیی ئامانجەکەی و پیرۆزی پەیامبەرێتییەکەی"١/١٧٤-١٧٥.

پاشان دەربارەی ئەو قوربانییانەی لەپێناو پەیامەکەیدا پێشکەشی کردون دەڵێت:"



مێژو پێمان دەڵێت، کە محمد هەمو شتێکی کردوتە قوربانی پەیامەکەی، بەجۆرێك زۆرجار هەلی هەڵبژاردنی دو کاری بۆ هەڵکەوتون:

یەکەمیان: ژیانی ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندی-بەرانبەر وازهێنانی لە بانگەوازەکەی.

دووەمیان: ژیانێکی ئەستەم و پڕ دەردەسەری بەهۆی بڵاوکردنەوە و گەیاندنی پەیامەکەی.

بەڵام ئەو دووەمیانی هەڵبژارد، چونکە باوەڕێکی پتەوی بە پەیامەکەی هەبو، هەروەها سروشی خودایی بۆ هاتبو، کە پەروەردگار ئەوی هەڵبژاردووە بوتەوەی ئەو پەیامە بگەیەنێتە هەمو مرۆڤایەتی، ئەوەش ڕویدا، کە خودا بۆی دیاریکردبو و بۆی ویستبو"٢/١٣٠.

*د.فیلیپ حیتی Philippe Hitti بەرەچەڵەك لوبنانییەو، بەرەگەزنامە ئەمریکییە، لە کتێبی"الاسلام منهج حیاة"دەڵێت: "..محمد، کەڵەپیاو و مامۆستاو وتاربێژ و پیاوی دەوڵەت و تێکۆشەر(مجاهد)، زۆر بەڕونی دەتوانین یەکێك لە گەورەترین و پایەدارترین پیاوی مێژو ببینین..ئاینێکی بڵاوکردەوە کە ئیسلامە، دەوڵەتێکیشی دامەزراند کە خیلافەتە، بەردی بناغەی ژیار و شارستانییەتێکیشی دانا کە ژیاری عەرەبی و ئیسلامییە، ئوممەتێکیشی دروستکرد کە ئوممەتی عەرەبییە، ئەو تا ئەمڕۆش هێزێکی زیندو و کارای نێو ژیان و ژیاری ملیوتان خەڵکی جیهانە.."ل٥٦.

*عەبدوڵڵا کویلیمKwelem بیرمەندێکی ئینگلیزییە، کە بوتە مسوڵمان، لە کتێبی"العقیدة الاسلامیة"دا دەڵێت:" محمد لەوپەڕی بەرزی و گەورەییدابو، لەڕوی سروشتی جوان و ڕەوشتی بەرز و لوتکەی شەرم و حەیا و هەستیاری لەڕادەبەدەری..ئەو هێزێکی درك پێکردنی سەرسوڕهێنەری هەبو، زیرەکییەکی بێ وێنەی هەبو، هەست و سۆزێکی جوان و ناسکی هەبو، بەڕاستی ڕەوشتی بەرز و جوان



بو، لەهەستیدا خەسڵەت و سیفاتی ناوازەت بەدی دەکردن"لا٩٦-٩٧.

هەروەها لە کتێبی"أحسن الأجوبة"دا دەڵێت: "ئەو-واتە پێغەمبەرمان محمد (ﷺ)- بەرێگایەکی دروست هەمو پێداویستییەکانی مروڤایەتی تەواوکردن و زۆر بەخێرایی بونەوەری گەیاندە لوتکەی خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی"لا٢١-٢٢.

پاشان دەڵێت:" گەیشتنی شوێنکەوتوانی بە بەرزترین ئاستی ژیار و شارستانییەت ئاقڵ و بیرمەندانی توشی سەرسوڕمان کرد، هۆکارەکەیشی تەنیا ئەوەبو، کە فەرمان و قەدەغەکردنەکانی لەگەڵ عەقڵدا دەهاتنەوە و لەگەڵ داناییدا تێکنەدەگیران".لا ٢٢-٢٣.

*ئیبراهیم خەلیل ئەحمەدIbrahim Khalil Ahmad کە پێشتر قەشەبو و بڕوانامەی بەرزی لە بواری ئایینناسی(لاهوت)ی کۆلێژی ئایینناسی میسری هەیەو پێشتر مامۆستای کۆلێژی لاهوت بو لە ئەسیوت، بوەتە مسوڵمان، لە کتێبی"محمد في التوراة"دەڵێت: "ئەوە ڕاستییەکە مێژو دەیسەلمێنێت: کاتێك جیهانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بە فەلسەفە نەزۆکەکانیانەوە لە تاریکی هزری و پەرستنی بێ بنەمادا دەژیان، لە مەککەوە و لە خودی کەسایەتی محمدەوە ڕوناکییەك پەیدابو، کە هەمو جیهانی تەنی و بەرەو ئیسلام ڕێنمونی کرد"لا ٤٧.

*لۆرا ڤیسیا ڤاگلێریL. Veccia Vagliery توێژەرێکی ئیتاڵییە، لە کتێبی "دفاع عن الاسلام"دا دەڵێت: "محمد، ئەو پیاوەی بەردەوام دەستی بە بنەما خواییەکان گرتبو، هەردەم لێبوردە و بەخشندەبو، بەتایبەت لە بەرانبەر ئایینە یەکخواپەرستەکاندا"لا ٧٣.

پاشان دەڵێت: "پێغەمبەری عەرەبی بە دەنگێکی پڕ لە پەیوەستی بە پەروەردگارییەوە بانگەوازی کرد، بتپەرستان و شوێنکەوتووانی هەردو ئایینی



شێوێنراوی مەسیحی و جولەکەی بەرەو پاکترین بیروباوەڕی یەکتاپەرستی بانگەوازکرد، هەروەها بەوەش ڕازی بو، کە هەندێ ململانێی ئاشکرا لەگەڵ ئەو کۆمەڵ و دەستانەدا بکات، کە مرۆڤ بۆ ئەوە پەلکێش دەکەن، کە هاوبەش بۆ خوای تاك و تەنها بڕیاربدات"لا٤٣.

*کلۆد کاهنClaude Cahenڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسییە، سەرۆکی کۆمەڵەی ئاسیاییە، لە کتێبی"تأريخ العرب والشعوب الاسلامية"ـــیدا دەڵێت: " کەسایەتی محمد خەسڵەتی مێژویی وای تێدابون، کە لەوانەیە لە دامەزرێنەرانی ئایینە گەورەکانی تر نەبێت" ١٤/١.

پاشان دەڵێت: " پێویستە بە گەورەیی و ڕێزەوە لە محمد بڕوانین، بەهۆی بەرزی ئیلهامی و توانای بەسەر پەڕاندنی کۆسپ و تەگەرە مرۆڤایەتییەکان بە گشتی و سەرکەوتن بەسەر نەهامەتییەکانی کەسایەتیدا بەتایبەتی"١٨/١.

*ئیمیل دێرمێنگهەمE. Dermenghemڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسییە، لە کتێبی "حياة محمد"دا دەڵێت: "دەسەڵات و سەروەت و سامان و سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام بەهیچ کام لەوانە مەغرور نەبو و، مسوڵمان بونی کەسێکی پێ لەهەمو دەستکەوتێك چاکتر و گەورەتر بو"لا ٣٦٠.

*پاشان دێرمێنگهەم قسەی ڕۆژهەڵاتناس و مێژونوسی ئەمریکی (واشنتۆن ئەرفەنج) دێنێت، کە ئەمە دەقەکەیەتی: "محمد کۆتا پێغەمبەربو و گەورەترین پێغەمبەربو، کە خوا بۆ بانگەوازی خەڵك بەرەو یەکخوا پەرستی ڕەوانەی کردوە" لا ٧٢.

ئەرفەنج وەسفی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات کاتێك مەککەی ڕزگارکرد، دەڵێت: "ڕەفتارەکانی محمد لە مەککەدا ئەوەیان نیشاندەدا کە پێغەمبەری خوایە، نەك سەرکردەیەکی سەرکەوتو، چونکە سۆز و بەزەیی بەرانبەر هاونیشتیمانییەکانی



نیشاندا، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی که گه‌یشتبووه پێگه‌یه‌کی به‌هێز، به‌لاّم ئه‌و تاجی سوّز و به‌زه‌یی له‌سه‌ری سه‌رکه‌وتنه‌که‌ی نا"لا ٧٢.

پاشان ده‌لّێت: "سه‌ره‌ڕای سه‌رکه‌وتنه سه‌ربازییه‌کانی (محمد)، ئه‌و سه‌رکه‌وتنانه به‌هیچ جوّرێك توشی خوّبه‌زلزانی و مه‌غرورییان نه‌کرد، چونکه ئه‌و له‌پێناو ئیسلامدا ده‌جه‌نگا، نه‌وه‌ك له‌پێناو سودێکی تایبه‌تی، ته‌نانه‌ت له لوتکه‌ی سه‌رکه‌وتنیشیدا پێغه‌مبه‌ر پارێزگاری له ساده‌یی و خوّبه‌که‌مزانییه‌که‌ی خوّی کرد و ئه‌و خه‌سلّه‌ته‌ی له‌ده‌ستنه‌دا"لا ٣٠٢.

يهتدي به من استهدى به سبل      الرشد و يعمى عنه من تعامى

واته:

هه‌رکه‌سیٚ ئه‌و به پێشه‌وای    خوّی بزانیٚ هیدایه‌ت ده‌دریٚ

هه‌رکه‌سێکیش خوّی له‌ئاسق    کوێربکات ڕێگای لیٚ ون ده‌بیٚ!

*** 

## گومان لەوەدا نییە، کە ئەو پێغەمبەری خوایە!

﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ * لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ * ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴾
[الحاقة: ٤٤ – ٤٦]

* * *

وكـيف يدرك في الدنـا حقيقته          قوم نيام تسلّوا عنه بالحلم؟

چۆن لەدنیادا قەدری دەزانێ و درك بەڕاستی دەكات
گەلێك کە تەنیا بەخەون ئەویان وەبیر دێتەوە؟!

* * *

من دەنگم هەڵدەبڕم و تکادەکەم بۆ ئەو ڕۆژەی مەسیحییەکان تێیدا ڕێز لە"مەسیح" دەگرن، ئەویش بەوەی ڕێز لە محمد بگرن، گومانیش لەوەدا نییە، کە مەسیحی ڕاست ئەوکەسەیە، کە ددان بە ڕاستی محمددا دەنێ و پەیامەکەی بەڕاست دەزانێ".

توێژەری ئینگلیزی لایتنەر

* مارسێل پوزار M.Poizar بیرمەند و یاساناسی فەرەنسی، لە کتێبی ((إنسانية الاسلام)) دا دەڵێت: ((..محمد، ئەو پیاوەی زانی چۆن ڕەزامەندی زۆرترین خەڵك



بەدەست بێنێت، پێویستە مرۆڤێك بێت لەسەروی ئاستی مرۆڤایەتی، هەروەها ئەوە وادەخوازێ یەکێك بێت لە پێغەمبەرە ڕاستەقینەکانی خوا)) لا ٤٦.

هەروەها دەڵێت: "محمد پێغەمبەرێك بو، نەوەك چاکسازێکی کۆمەڵایەتی، پەیامەکەیشی گۆڕانکاری بنچینەیی لە کۆمەڵگای عەرەبی ئەوسا ئەنجامدان، کە لەئێستادا کاریگەرییەکەی لە کۆمەڵگای ئیسلامی هاوچەرخدا دەبینرێن"لا ٦١.

*مۆریس بۆکای Maurice Bucaille پزیشکێکی گەورەی فەرەنسییە، بوتە مسوڵمان، لە کتێبی"قورئانی پیرۆز و تەورات و ئینجیل و زانست"دا دەڵێت: "چۆن مرۆڤێکی نەخوێندەوار دەتوانی پەی بەو ڕاستییە زانستییانە ببات، لەکاتێکدا هیچ مرۆڤێکی ئەو سەردەمە توانای ئەو کارەی نەبووە، بەبێ ئەوەی لەو ڕوانگەیەوە قسەکانی هیچ هەڵەیەکیان تێدابێت؟"لا ١٥٠.

*ڕۆجێ گارادی Roger Garaudy بیرمەندێکی بەناوبانگی فەرەنسییە، هەروەها یەکێکە لە گەورە پێشەوایانی پێشوی حیزبی شیوعی فەرەنسی، بوەتە مسوڵمان و لە کتێبی"عهود الاسلام"دا دەڵێت: "بەهۆی دو بنچینە سەرەکییەکانی ئیسلام: بنچینەی دەسەڵات تەنیا بۆ خودایە، ئەو بنچینەیەی بەهۆیەوە هەمو دەسەڵاتێکی کۆمەڵایەتی ڕێژەییە، هەروەها بنچینەی ڕاوێژ(شورا)، کە هەمو هۆکارێکی نێوانی گەل و خودا ڕادەماڵێ و هەر سەرکێشییەکی ڕەها کە پیرۆزی دەداتە دەسەڵات و وا لە سەرکردە دەکات ببێتە خودایەك لەسەر زەوی، ئەوا لە یەك کاتدا هەردوکیان لەناو دەبات" لا ٣٦.

*جۆرج سارتۆنGeorge Sarton: ڕۆژهەڵاتناسێکی بەلجیکییە، کە دکتۆرای لە زانستە سروشتییەکان و بیرکاریدا هەیە، لە کتێبەکەیدا"الثقافة الغربية في رعاية الشرق الاوسط"دەڵێت: "پێغەمبەر لە دەوروبەری ساڵی ٦١٠ز، کە ئەوسا تەمەنی چل ساڵ بو بانگەوازی ئاشکرای دەستپێکرد، وەکو برا پێغەمبەرانی دی، بەڵام زۆر

له‌وان باشتربو..ئه‌و خواپه‌رست و زانا و یاسا دانه‌ر بو، پیاوێکی ته‌واو کرداری بو"لا ٢٩-٣١.

پاشان ده‌ڵێت: "محمد" ته‌نیا پێغه‌مبه‌ری ئیسلام نه‌بو، به‌ڵکو پێغه‌مبه‌ری زمانی عه‌ره‌بی و ڕوٚشنبیری عه‌ره‌بی بو، به چاوپوٚشین له ڕه‌گه‌ز و ئاینی قسه‌که‌رانی"لا ٤٣.

* ((گوٚستاف لوٚبوٚن))Gustave le bun پزیشك و مێژونوسی فه‌ره‌نسی، له کتێبی ((حضارة العرب)) دا ده‌ڵێت: "خه‌ریکه زانایانی ڕوٚژئاوایی ڕاشکاوانه ده‌رباره‌ی محمد ده‌دوێن، هه‌رچه‌نده ده‌مارگیری ئاینی چاوی زوٚر مێژونوسی کوێرکردووه، که ددان به گه‌وره‌ییدا بنێن" لا ١١٥.

*ئیمیل دێرمێنگهه‌مE. Dermenghem ڕوٚژهه‌ڵاتناسێکی فه‌ره‌نسییه، له کتێبی "حیاة محمد"دا ده‌ڵێت: "..محمد له مارییه‌ی قیبتی ئیبراهیمی بو، به‌ڵام هه‌ر له منداڵیدا وه‌فاتی کرد، ئه‌ویش زوٚر بوٚی دڵته‌نگ بو، به چاوی پڕ فرمێسکه‌وه خستییه ژێر گڵ، له‌و کاته‌شدا خوٚرگیران ڕویدا، مسوڵمانان گوتیان: خوٚر له‌به‌ر مردنی ئیبراهیم گیراوه، به‌ڵام محمد به ده‌رونه به‌رز و باڵاکه‌یه‌وه وه‌ڵامی دایه‌وه گوتی: (خوٚر و مانگ دو وه‌دیهێنراو و نیشانه‌ی ده‌سه‌ڵاتی په‌روه‌ردگارن، هه‌رگیز بوٚ مردنی هیچ که‌س ناگیرێن..)، بێگومان قسه‌یه‌کی ئاوا له ده‌می که‌سێکی دروٚزن ده‌رناچێت.." لا ٣١٨.

*د.نه‌زمی لوقا Dr. N. Luka مه‌سیحیه‌کی میسرییه، که به دیدی بابه‌تیانه‌و دڵسوٚزی بوٚ حه‌ق و راستی به‌ناوبانگه، له‌کتێبی "محمد الرسالة والرسول"دا ده‌ڵێت: " چی ماوه‌ته‌وه بوٚ که‌سێ، که بانگه‌شه‌ی ناڕاستی محمد ده‌کات؟ باوه‌ڕێك به‌رله‌وه‌ی سه‌رکه‌وێ، به چه‌ندان به‌ڵا و ده‌رده‌سه‌ری تاقی کرایه‌وه، سه‌رکه‌وتنیش بوٚ بانگخوازێکی یه‌کتاپه‌رستی له پایته‌ختی بت و بتپه‌رستاندا شتێکی چاوه‌ڕواننه‌کراوبو.. پاکی ئه‌و زاڵ بو به‌سه‌ر هه‌مو سوده‌کاندا، به‌رزییه‌که‌ی پاکتربو له هه‌مو باق و بریقی دنیا، لێبورده‌ییه‌ك به‌هیچ جوٚرێك لوتبه‌رزی و خوٚ به ده‌سه‌ڵات فشکردنه‌وه‌ی تێنه‌ده‌که‌وت"لا ١٨٣-



.١٨٤

پاشان دکتۆر لوقا هەندێ لەو کارانە دەخاتەڕو، کە کەسێکی خەڵەتێنەر و درۆزن، کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات ناتوانێت ئەنجامیان بدات، چونکە ئەوکەسەی تەنیا بە زوبان بانگەشەی ئەوانە دەکات هەوڵ بۆ دەسەڵات دەدات و هەوڵدەدات ماڵ و سامان و دەسەلاتێکی زۆر بۆ نەوەکانی جێبێڵێت، بەلاّم پێغەمبەری ئیسلام بۆ هیچ کام لەمانە هەوڵی نەداوە، هەروەها لوقا دەڵێت:"..هیچ خۆشی و دەسەلاّتێکی دنیای بۆ نەوە و خێزان و هۆزەکەی جێنەهێشت، زۆر شتی لەخۆی حەرام کرد، کە بۆ شوێنکەوتووانی حەلاّڵ کردبو، هەروەها هیچ کام لەو سەروەریانەی نەهێشت، کە هۆزەکەی لە سەردەمی نەفامیدا بەسەر هۆزەکانی تردا هەیبو، بەجۆرێك کۆیلەو بەندەکانی هێنانە ئاستی گەورە پیاوانی قورەیش، هەروەها بەهۆی نەفامییەوە خزم و کەسانی دەسەلاّتێکی ناڕەوایان دەستکەوتبو، بەلاّم هەمو ئەوانەی لەگەڵ زەوی تەختکردن، چ دەسەلاّتێك دەتوانێ بەسەر ئەو سەرفرازییە بەرزە و ڕاستگۆییە حاشا هەڵنەگرەدا زاڵ بێت؟!..

ئەو پێغەمبەرە لە خۆیەوە نەدواوە.. هەرگیز نەڕێی ڕاستی لێ ون بووە نە بیر و باوەڕی پروپوچی هەڵگرتووە.. ئەگەر ئەو پێغەمبەرە ڕاستگۆی دەستپاك نەبێت ئەوا هیچ کەسێ ڕاستی نەگوتووە و دەستپاك نەبووە" لا ١٨٥-١٨٦.

*لایتنەر Lightner توێژەرێکی ئینگلیزییە، دکتۆرای لە شەریعە و فەلسەفە و ئاینزانی هەیە، لە کتێبی(ئایینی ئیسلام)ی جۆزێف شاختدا دەڵێت:" بەهۆی ئەو زانیارییەی لەسەر هەردو ئایینی جولەکەو دیانەکان هەمە دەڵێم: ئەوەی محمد فێری بووە و گوتویەتی وەرگێراو نییە، بەڵکو سروشی بۆ هاتووە" لا ٤.

لایتنەر بەڵگەی لۆمەی سروش دەهێنێتەوە، کە لەسەر پیاوێکی کوێر لۆمەی کراوە، هەروەك لە سورەتی"عبس"دا هاتووە:"..جارێکیان سروشێکی پڕ لۆمە و



گلەیی کردن بۆ پێغەمبەر هات، چونکە ڕوی لە پیاوێکی کوێری هەژار وەرگێڕاوە و ڕوی لە کەسێکی دەوڵەمەندی خانەدان کردووە، ئەو سروشەش بڵاوبوەتەوە و لە قورئاندا هەیە، ئەگەر وەك هەندێ کاڵفامی دیان دەڵێن ئەو درۆزن بوایە ئەوا هەرگیز ئەو سروشە بونی نەدەبو"لا ١٣٢-١٣٣.

*هێنری دی کاستریH. De. Castriesئەفسەرێکی لەشکری فەرەنسییە، لە کتێبی(الإسلام:خواطر و سوانح)دا دەڵێت: "بەبەڵگە سەلمێنراوە، کە محمد هیچ کتێبێکی پیرۆزی نەخوێندوتەوە و لە ئایینەکەیدا پشتی بەهیچ ڕێبازێکی پێشین نەبەستووە"لا ١٦.

پاشان دەڵێت: "..پیاو عەقڵی بەوە سەرسام دەبێت، کە چۆن ئەو ئایات و بەڵگانە لە پیاوێکی نەخوێندەوار دەردەچن، لەکاتێکدا خۆرهەڵات بە گشتی دانیان بەوەداناوە، کە ئایاتی پەرجو(موعجیزە)ن، کە عەقڵی مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ وەك ئەوان دابنێت، چ لەڕوی وشەکارییەوە یان لەڕوی واتاسازییەوە..ئەو ئایاتانەی کاتێ "عوتبەی کوڕی ڕەبیعە" گوێی لێیان بو لە بەر جوانی و کاریگەرییان ڕاچڵەکی..ئەو ئایاتانەی چاوەکانی نەجاشی فەرمانڕەوای حەبەشەیان پڕ کرد لە فرمێسك، کاتێ جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ئەو ئایەتانەی لەسورەتی (مریم)دا دەربارەی لەدایکبونی مەسیح هاتون بەسەریدا خوێندنەوە"لا١٨-٢٠.

لەشوێنێکی تردا دەڵێت: " لە سەردەمی یەکەمدا-سەردەمی مەککە- ناتوانین نکوڵی لە تەواوی باوەڕ و دڵسۆزی و ڕاستگۆیی محمد بکەین، بەڵام هەرچی لە سەردەمی دووەمیدا-سەردەمی مەدینە-دا باوەڕەکەی هیچ کەم و زیادی تێنەکەوتن، سەرەڕای ئەو سەرکەوتنانەی تۆماری کردن، کە دەبوایە لەسەر باوەڕ گەرم و گوڕتری بکەن و باوەڕی بەهێزتر بکەن، بەڵام باوەڕەکەی گەیشتبووە ئاستێك، کە جێی زیاد و کەمی تێدا نەدەبووەوە و هیچ کەموکوڕی تێدا نەبون، ئەوەی دەدرێتەپاڵی



هیچ کاریگەری لەسەر ژیانی پاك و بێخەوشی ئەو نییە"لا٢٤.

پاشان دی کاستری چەند لایەنێکی گەورەیی لە کەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەخاتەڕو، دەڵێت: "..محمد مەیلی لە باق و بریقی دنیا نەبو، کەسێکی چاوتەنگ و ڕژدیش نەبو، خۆی بۆخۆی مێگەلەکەی دەدۆشی، لەسەر خۆڵ دادەنیشت، خۆی جلوبەرگ و پێڵاوەکانی چاك دەکردنەوەو دەدورینەوە و بە پینەوە دەبەری دەکردن، کەسێکی بە قەناعەت بو، ئەو دنیایەی بەجێهێشت تەنانەت بۆ جارێکیش لە نانی جۆ تێرنەبو، هەرگیز تەماعکار نەبو، توانی بگاتە بەرزترین پێگەی وڵاتانی عەرەب، بەڵام هەرگیز پەنای نەبردە بەر ستەمکاری، خۆی دورەپەرێز نەگرتبو، وەزیر و دارودەستەی بۆخۆی بڕیارنەدابون.. گەیشتە لوتکەی دەسەڵات بەڵام هیچ نیشانەی فەرمانڕەوایی و میرنشینی نەبون، جگە لە ئەنگوستیلەیەکی زیو، کە لەسەری نوسرابو:محمد رسول الله"لا ٢٤.

*لۆریا ڤیشیا فاگلێری L. Veccia Vaglieriتوێژەرێکی ئافرەتی ئیتاڵییە، لە کتێبی (دفاع عن الاسلام)دا دەڵێت:" زۆر لە دوژمنانی ئیسلام، کە ڕق و کینە کوێری کردبون، هەوڵیاندا هەندێ تۆمەتی درۆینەو هەڵبەستراو بدەنەپاڵ محمد!.. ئەوەیان بیرچوبو، کە محمد بەرلەوەی پەیامی ئاسمانی بۆبێت بەهۆی دەستپاکی و داوێنپاکییەوە لەلای هاونیشتیمانیانی جێگای ڕێز بووە و بەگەورەیی سەیرکراوە"لا٣٧.

پاشان هەندێ پرسیار دەورووژێنێ، کە واپێویست دەکات لەسەر ئەو عەقڵەی پێوایە محمد(ﷺ) لەلای خوداوە نەهاتووە بەخۆیداچێتەوە، دەڵێت: "..ئەوەی لەلام سەیرە ئەوەیە، کە ئەوانە ئەو ئەرکەش ناکێشن، کە لەخۆیان بپرسن: ئەگەر محمد پێشتر پیاوێکی درۆزن بوبێت چۆن ئەو ئازایەتییەی بەخۆی داوە، کە بەڵێنی ئاگری تاهەتایی بداتە ئەو کەسانەی کە پەیامەکەی بەدرۆ دەزانن یان تەنیا بەڕوبینی باوەڕ دەهێنن؟ ئایا ئەو بەو سروشتە سادەیەوە و سەرەڕای بێزڕیکردنی



هاونیشتیمانیانی چۆن توانی مژدەی خۆشگوزەرانی(بەهەشت) بداتە یار و یاوەرانی، ئەگەر هێزێك نەبێت لەپشت ئەو بەڵێنانەیەوە؟

چۆن توانی ململانێیەکی-شێوە بێهیوا- دروستبکات؟..ئەگەر باوەڕێکی پتەوی بە پەیامەکەی نەبوبێت چۆن توانی لە مەککەدا بۆ ماوەی دە ساڵ لەو ململانێیە بەردەوام بێت، لەکاتێکدا کە سەرکەوتنێکی کەمی بەخۆیەوە دیبو، سەرەڕای دەرد و مەینەتی بێ شومار؟

چۆن ئەو ژمارە زۆرەی مسوڵمانان، لە پیاوانی خانەدان و ژیر و بیرمەند باوەڕی پێهێنن و پشتگیری بکەن و خۆیان بکەنە تاکی کۆمەڵگایەك، کە زۆرینەی کۆیلە و بەندەی ئازادکراو و هەژار و نەدار بون، ئەگەر لە وشەکانیدا ڕاستگۆیییان بەدی نەکردبێت؟..

پێویست بەوەناکات چیتر درێژە بەو قسانە بدەین، خەریکە ڕۆژئاواییەکان کۆدەنگییەك لەسەر ئەوە دەکەن کە ڕاستی محمد و پەیامەکەی بێگومانە" لا ٣٧-٣٨.

*تۆماس کارلیلThomas Carlyle نوسەر و مێژونوس و فەیلەسوفی ئینگلیزی، لە کتێبی"الابطال و عبادة الابطال"دا دەڵێت:"..محمد هەرگیز وانەی لای هیچ مامۆستایەك نەخوێندووە، هەروەها ئەوسا نوسین لەنێو گەلی عەرەبیدا تازە داهاتبو، ئەوەی لای من ڕۆشنە ئەوەیە، کە محمد خوێندنەوە و نوسینی نەزانیوە و جگە لە ژیان و بارودۆخی بیابان هیچی دی فێرنەبووە، هەرچییەکیش کە توانیبێتی بیزانێت لەڕێی دیدگایەوەبووە و لەڕێی دەرونییەوە لەو گەردونە شت وەربگرێ و تێبفکرێ، بەڵێ، ئەو هیچی لە جیهانی پان و بەرین و زانستەکانی نەزانیوە، تەنیا ئەوەی بە دڵ و دەرونی بینیویەتی، یان لە تاریکی بیابانی عەرەبەوە بەگوێدا چرپابێت"لا ٥.

پاشان دەڵێت:"ئەو درۆ و دەلەسانەی بەهۆی خوێن گەرمییەوە و بە نیاز پاکییەوە دەربارەی ئەو پیاوەوە دەیانڵێین، تەنیا بەخراپە بەسەر خۆماندا دەشکێتەوە"لا ٤١.



تۆماس کارلیل وای دەبینێ، کە ئەو درۆ و دەلەسانەی بۆ پێغەمبەری ئێمە(ﷺ) هەڵی دەبەستن، جا چ بەنیاز پاکی بێت وەك خۆی دەڵێت، یان بە درۆ و نەزانی بێت وەك(فریدریك نیچە) دەڵێت کاتێك وەسفی پیاوانی کڵێسا دەکات، لە کتێبی(عدوّ المسیح)، دەڵێت: "ئەوان لەهەر ڕستەیەك کە دەیڵێن هەڵە ناکەن، بەڵکو درۆ دەکەن، ئەوان ئیتر ئازادنین لەوەی بە نیازپاکی درۆ بکەن یان بە نەزانی"لا ٣٨.

ئەو ددان بەوەدا دەنێت، کە ئەو قسانەی دەیکەن هەڵبەستراو و درۆ و دەلەسەن، کە بۆ پێغەمبەر محمد(ﷺ) هەڵیان بەستون، ئەو پێغەمبەرەی –بە قورئان و دانایيەکەی–پەرستش و ڕەوشت و زانستی پاك و بەرزی وای پێشکەشی مرۆڤایەتی کردن، کە هیچ کەسی دی پێشکەشی نەکردون و تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان زانایان لەسەری دەنوسن و مسوڵمانان و نامسوڵمانان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی ڕوناکی لێوەردەگرن و ڕێگایان ڕۆشن دەکاتەوە..

پاشان کارلیل دەڵێت:"نەنگی و شورەیيەکی گەورەیە لەسەر هەر کەسێکی دینداری ئەم سەردەمە، کە گوێ بۆ ئەوەڕادێرێ، کە ئیسلام درۆیەو محمد فێڵباز و خەڵەتێنەرە و، لەسەرمان پێویستە دژی ئەو قسە پڕوپوچ و شەرمەزارکەرانە بوەستینەوە"لا ٤٢.

پاشان دەڵێت: "..ئەو پەیامەی ئەو پێغەمبەرە هێناویەتی تا ئێستا و بۆ ماوەی دوازدە سەدەیە چرای ڕوناکی نزیکەی دوسەد ملیۆن مرۆڤی وەکو ئێمەیە، وەدیهێنراوی هەمان ئەو خودایەن کە ئێمەی وەدیهێناوە.. ئایا ئێوە لاتان وایە، کە ئەو پەیامە–کە بە ملیۆنان خەڵك لەسەری ژیاون و مردون–درۆ و دەلەسەیە؟!"لا ٤٢.

پاشان دوای تێڕامان وەڵامی خۆی دەداتەوە و دەڵێت:"من هەرگیز ناتوانم بەو جۆرە بیر بکەمەوەو ئەو ڕایەم هەبێت، چونکە ئەگەر درۆ و فێڵ و تەڵەکە ئەوەندە لەلای بونەوەری خودادا ڕەواجیان هەبێت و بەو جۆرە پێشوازی لێبکەن و بەڕاستی

بزانن، ئەوا خەڵك جگە لە گێل و شێت هیچی تر نین و، ژیانیش جگە لە شتێکی بێمانا و بێنرخ هیچی تر نیەو هەر بونی نەبوایە چاکتر و شیاوتر بو"لا ٤٣.

پاشان دەڵێت:"..ئەوەی ڕای ئەو کەسانە پوچ دەکاتەوە، کە دەڵێن پەیامەکەی محمد ڕاست نەبووە..ئەوەیە کەئەو تەمەنی لاوێتی خۆی لە ژیانێکی هێمندا لەگەڵ خەدیجە بەسەربرد، لەو ماوەیەشدا هیچ دەنگۆیەکی نەنایەوە، کە بوتی ناوبانگ و پایەو دەسەلاتی لێبێت.. ئەو باسی هیچ شتێکی نەکرد، تا پیری هات، ئەوکاتە ئەو گرکانەی خۆی قەتیس دابو تەقیەوە و، ئەوکاتە بانگەوازی بۆ بابەتێکی گەورە و ڕێبازێکی پیرۆزکرد"لا ٥١.

پاشان دەڵێت:"..لە دڵ و دەرونی ئەو پیاوە بەرز و بەرێزەی پەروەردەی چوڵەوانی..ئەو پیاوەی نەفس بەرز بو.. دڵ و دەرونی پڕبو لە سۆز و بەزەیی و چاکەکاری و دانایی و بیرۆکەی داماڵراو لە تەماعی دنیایی و، نیازی بەدەر لە هەوڵدان بۆ پێگەو دەسەلات.. بەڵام کەسانی دی دەبینین، کە بە دەستەواژەی درۆینە ڕازی دەبن و لەسەر بیرۆکەی ناڕاست دەڕۆن، لەبەرانبەردا دەبینین، کە محمد بەوە ڕازی نەبووە، کە بە درۆ و قسەی ناڕاست وەسف بکرێ، ئەو لە نەفس بەرزیدا تاك بو، لە درك پێکردنی ڕاستی شتەکان و بونەوەریشدا بەهەمان شێوە.. ئەو جۆرە دڵسۆزییە بەدەر نییە لە واتایەکی خودایی پیرۆز.. ئیتر دوای ئەوە هەر قسەیەك، کە دەکرێ قسەی پوچ و بێمانایە!"لا ٥١-٥٢.

*دیوۆرا پوتەرD. Potterژنە ڕۆژنامەنوسێکی ئەمریکییە، کە بوەتە مسوڵمان، لە کتێبی(رجال ونساء أسلموا) دەڵێ:".. محمد، ئەو پیاوە نەخوێندەوارەی لە ژینگەیەکی نەفامیدا پێگەیشتووە چۆن توانی پەی بەو پەرجو(معجزة)انە بەرێت، کە قورئان باسی کردون، کە تائێستاش زانستی هاوچەرخ هەوڵی دۆزینەوەیان دەدات؟!.. هیچ چارەیەکمان نییە جگە لەوەی ددان بەوەدا بنێین، کە ئەو قورئانە لەلای



خوداوەیە"٨/١٠٩.

*ڕۆم لاندۆR. Landau پەیکەرساز و ڕەخنەگری هونەری ئینگلیزی و مامۆستای زانستە ئیسلامییەکان لە سان فرانسیسکۆ، لە کتێبەکەی"الاسلام والعرب"دا دەڵێت:"موحەممەد کارێکی گەورەی گرتبووە خۆی، کە کەسێکی بانگەشەکاری درۆزنی خۆپەرست ناتوانێ بە هەوڵی تاکەکەسی خۆی هیچ ئومێدێکی بە سەرکەوتنی هەبێت، ئەو دڵسۆزییەی محمد، کە لە کاتی گەیاندنی پەیامەکەیدا دەرکەوت و باوەڕی پتەوی شوێنکەوتوانی بەو پەیامەی بۆی هاتووە و، بارودۆخ و کەین و بەیبی ڕۆژگار و..هەمو ئەمانە وادەکەن، کە بڵێین شتێکی بێ ماناو نا ژیرانەیە ئەگەر محمد بەهیچ جۆرە فێڵ و تەڵەکەبازییەك تۆمەتباربکرێت.."لا٣٣.

پاشان (لاندۆ) ئاماژە بەوە دەکات، کە لەمێژودا نەبووە فێڵبازێك فێڵ لە خەڵك بکات و خەڵك بخەڵەتێنێت و فێڵ و تەڵەکەی بەردەوام بوبێت، دەڵێت:"مێژو باسی هیچ کەسێکی تێدا نەهاتووە، کە فێڵ و تەڵەکەبازی لە خەڵك کردبێت و بەردەوامیش بوبێت، ئیسلامیش وا نەبێت کە تەنیا بۆ ماوەی نزیکەی هەزار و سێسەد ساڵ بەردەوام بوبێت، بەڵکو هێشتاش شوێنکەوتوی نوێی پەیدا دەبن و بەرەو فراوانبونە، لەکاتێکدا لاپەڕەکانی مێژو تاکە نمونەیەکیشمان ناخاتە بەردەست، کە فێڵبازێك توانیبێتی پەیامەکەی بوبێتە هۆکاری بنیاتنانی ئیمپراتۆرییەتێك، کە یەکێك بێت لە ئیمپراتۆرییەتە گەورەکانی جیهان، یاخود شارستانییەتێکی وای بەرهەمهێنابێت، کە لە بەرز و بەرێزترین شارستانییەتەکانی جیهان بێت)لا٣٤.

هەروەها دەربارەی ئەو گۆڕانکارییەی پێغەمبەرمان(ﷺ) بەهۆی بانگەوازەکەیەوە توانی ئەنجامی بدات دەڵێت: (ئەرکی محمد بریتی بو لە نەهێشتنی ئەو سیستەمە خێڵەکییەی هۆکاری سەرەکی شەڕوشۆڕی نێوان عەرەبەکان بو و، قەرەبوکردنەوەی دەسەڵاتداری بە ملکەچ کردن بۆ فەرمانەکانی خودا، بەجۆرێك،



که به‌سه‌ر هه‌مو پێوه‌ندییه خێزانییه‌کان و ڕق و کینه لاوه‌کییه‌کاندا باڵاده‌ست بێت، بۆ ئه‌مه‌ش واپێویستی ده‌کرد، که یاسایه‌کی وا بداته به‌ر ده‌ستی خه‌ڵك، که عه‌ره‌به‌کان–به‌تایبه‌تی یاخییه‌کان–بتوانن قه‌بوڵی بکه‌ن و ملکه‌چی بن..

له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ر پێویست بو هه‌ندێ کوت و مه‌رج به‌سه‌ر ئه‌و کۆمه‌ڵگایه‌دا فه‌رز بکات، که له‌سه‌ر بنچینه‌ی خێڵایه‌تی و خوێن ڕشتن و جۆره‌ها سته‌مکاری دامه‌زرابو..

له‌سه‌ری پێویست بو له شوێنی دڕندایه‌تی مرۆڤایه‌تی و له‌جێگای بێ به‌رنامه‌یی یاسا و دادگه‌ری له‌جێگای هێزو سته‌مدا به‌رپا بکات)لا ٣٤.

لێره‌دا به پێویستی ده‌زانم وته‌ی زانای پایه‌به‌رز(ئیبن خه‌لدون)ی دامه‌زرێنه‌ری زانسته کۆمه‌لأیه‌تییه‌کان بخه‌مه‌ڕو، که له به‌شی بیست و حه‌وته‌می (مقدمة)ه‌که‌ی دا ده‌ڵێت: ده‌رباره‌ی ئه‌وه‌ی، که عه‌ره‌ب به هۆکارێکی ئایینی وه‌ك پێغه‌مبه‌رایه‌تی یان خیلافه‌ت نه‌بێت ده‌سه‌لأتداری به‌که‌س ناده‌ن، ده‌ڵێت: (به‌هۆی ڕه‌وشتی دڕندایه‌تییان له‌ڕوی گوێڕایه‌ڵی یه‌کتر له هه‌مو گه‌لان یاخی تر و سه‌رکێش ترن، ئه‌مه‌ش به‌هۆی ڕق ئه‌ستوری و لوتبه‌رزی و بێهیممه‌تی و کێبڕکێکردن له‌سه‌ر فه‌رمانڕه‌وایه‌تیدا.. به‌لأم ئه‌گه‌ر باسه‌که ئایینی و خه‌لافه‌ت بێت، ئه‌وا ڕه‌وشتی لوتبه‌رزی و ڕکابه‌ری فڕێ ده‌ده‌ن، به‌مه‌ش کۆکردنه‌وه و جڵه‌وگیرییان ئاسان ده‌بێت.. بۆیه ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌رێك یان خه‌لیفه‌یه‌کیان له‌ناودابێت، که فه‌رمانی خودایان پێڕابگه‌یه‌نێت، ئه‌وا ڕه‌وشته خراپه‌کان فڕێ ده‌ده‌ن و، ڕه‌وشته چاکه‌کان وه‌رده‌گرن و بۆ سه‌رخستنی حه‌ق یه‌ك ده‌نگ ده‌بن..)١/١٥١.

لێره‌دا زانستی کۆمه‌لأیه‌تیش شایه‌تی بۆ پێغه‌مبه‌رمان محمد(ﷺ) ده‌دات، که پێغه‌مبه‌ری خودایه، چونکه ئه‌گه‌ر وانه‌بووایه نه‌یده‌توانی عه‌ره‌به‌کان یه‌کبخات و یه‌کده‌نگیان بکات و ڕه‌وشته خراپه‌کانیان پاك بکاته‌وه و گه‌وره‌ترین نه‌ته‌وه‌ی جیهانییان لێ دروستبکات.

## چەند ژنێی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

﴿ لَا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ رَّقِيبًا ﴾ الأحزاب: ٥٢. واتە: هیچ ژنێکی ترت بۆ حەڵاڵ نییە و بۆیشت نییە بیانگۆڕیت بە ژنی تر، واتە یەکێك یا زیاتریان تەڵاق بدەی و لەباتیی ئەو ژنی تر بهێنی هەر چەند جوانیشیانت زۆر بە دڵ بێ، مەگەر ئەو کەنیزەکانەی بن بە موڵکی خۆت، خوا ئاگای لە هەموو شتێکەو هیچی لێ ون نابێ، کەواتە لەو سنوورە لامەدە، کە ئەو بۆی دیاری کردووی.

* * *

مێژو و کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیان راگەیاندوین، کە پێغەمبەر(ﷺ) لە نێو گەلەکەیدا ـ پێش بونی بە پێغەمبەر ـ بەدەستپاکی و داوێنپاکی ناسرا بو، لە کاتێکدا دورگەی عەرەبی کەوتبونە نێو ئارەزوبازی و داوێنپیسییەوە!

هەرچی دەربارەی فرەژنی پێغەمبەرە(ﷺ)، ئەوا هۆکار و ژینگە و مەبەستی کۆمەڵایەتی و سیاسی و یاسایی خۆی هەن.

بەڵام بە هیچ جۆرێك بە مەبەستی ئارەزوبازی نەبو، وەك هەندێ دوژمن و رق ئەستور وای دەبینن...

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گومانە، توێژەری ئینگلیزی (لایتنەر) لە کتێبی (دین



الاسلام)دا دەڵێت: ((کاتێك تەمەنی گەیشتە بیست و پێنج ساڵ هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی تەمەن چل ساڵدا کرد، وەك ئافرەتێکی پەنجا ساڵی لە ئەوروپادا، ئەو ئافرەتەش یەکەم کەس بو، کە باوەڕی بە پەیامەکەی هێنا... بۆ ماوەی بیست ساڵ خەدیجەی لە گەڵدا مایەوەو تا مرد ژنی بەسەر نەهێنا، جا کاتێك تەمەنی گەیشتە پەنجاو پێنج ساڵ یەك لەدوای یەك هاوسەرەکانی تری هێنا... بەڵام بابەتییانە و راستگۆیانە نییە، کە شتێك بدەینە پاڵ کەسێکی گەورە، کە هەمو ژیانی بە داوێن پاکی بەڕێکردووە، گومان لەوەدا نییە، کە هاوسەرگیری کردنی لەو تەمەنەدا هۆکاری راستەقینەی خۆی هەن، جیاواز لەو هۆکارانەی نوسەرانی مەسیحی لەو بارەیەوە باسیان کردون)) ل ١٢-١٣.

ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی ((کلود کاهن claude cahen)) لە کتێبی ((مێژوی عەرەبی و گەلانی موسڵمان))دا دەڵێت:((... لەسەرمان پێویستە بە چاوی گەورەیی و رێزەوە سەیری محمد بکەین، بە هۆی ئەو هەستە بەرزەی هەیبووەو، بەهۆی ئەو توانایەی بەرانبەر برینی کۆسپە مرۆییەکان و زاڵ بوون بەسەر نەهامەتییە تایەتییەکانی خۆی هەیبووە... لەوانەیە بەدیدی سەردەمیانەی ئێمە هەندێ لایەنی ژیانی هەندێ دودڵیمان لا دروست بکات، زۆر قسەی درۆینەو نابەجێ لەسەر ئارەزووەکانی پێغەمبەر کراون و زۆر لەسەر نۆ هاوسەرەکانی دواون، ئەوانەی دوای خەدیجە کردوینەتە هاوسەری خۆی، بەڵام لە راستیدا هەر یەکێك لەو پێوەندییە خێزانییانە مەبەستی سیاسییان لە پشتەوە بون، و بەمەبەستی بە دەستهێنانی پشت و پەنای چەند سەرۆك و سەردارێك ئەنجامدرابون، کلتوری عەرەبیش، ئەگەر وەك خۆی بەکار بێت، مرۆڤ بەو شێوەیەی خوا دروستی کردووە پەروەردە دەکات)) ١/١٨.

ژنە توێژەری ئیتاڵی (لۆرا فیشیا فاگلێری) لە کتێبی (دفاع عن الاسلام)دا دەڵێت: (محمد، بە درێژایی تەمەنی لاوی، کە تێیدا غەریزەی جنسی لە لوتکەدایە، سەرەڕای ئەوەیش، کە لە کۆمەڵگەیەکی وەکو کۆمەڵگەی عەرەبیشدا دەژی .... کە فرە ژنی



تێیدا کلتور بوو تەڵاقیش زۆر ئاسان بو" کەچی ئەو لە ئافرەتێك زیاتری نەهێنا، ئەویش (خەدیجە) بو، کە تەمەنی زۆر لە خۆی گەورەتر بو، بەڵام بە درێژایی بیست و پێنج ساڵ هاوسەری دڵسۆز و خۆشەویستی بو، هیچ ئافرەتی تریشی مارە نەکردن، تەنیا دوای مردنی خەدیجە نەبێت، تەنیا دوای ئەوەش نەبێت، کە تەمەنی گەیشتە پەنجا ساڵ)) لا ٩٩.

پاشان دەڵێت: (لە پێش هەر هاوسەرگیریەکی هۆکارێکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی هەبون، بەوەی، کە بەهۆی هاوسەرگیری کردنی لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا مەبەستی ئەوەبو کە ئافرەتە داوێن پاك و بەرێزەکان جیاکاتەوەو رێزیان بگرێت، یاخود بە مەبەستی بنیاتنانی چەند پێوەندییەك لەگەڵ چەند هۆزو عەشیرەتێك بۆ والآکردن و کردنەوەی رێگای نوێ بۆ بڵاوبونەوەی ئیسلام..) لا ١٠٠.

پاشان دەپرسێت: (محمد هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتانێکدا کرد، کە نە کچ بون، نە گەنج بون، نە جوان بون، ئایا ئەوە ئارەزوبازییە؟!..

ئەو تەنیا لەسەر رێبازی پێغەمبەرانی پێش خۆی وەکو (موسا) و ئەوانەی دی رۆیشتووە ئەوانەی تا ئێستا هیچ کەس باسی چەند ژنییان ناکات، ئایا ئەوە لەبەر ئەوەیە، کە وەکو محمد لە ژیانیان ئاگادار نین، لە کاتێکدا هەمو شتێك دەربارەی ژیانی خێزانیی محمد دەزانین؟) لا ١٠٠.

ئەگەر بگەرێینەوە بۆ ((تەورات)) چەند دەقێکی تێدا دەبینین، پێمان دەڵێن، کە کۆمەڵێك پێغەمبەری ئەهلی کیتاب چەند هاوسەرێکیان هەبووە، تەنانەت ژمارەی هاوسەرەکانی یەکێکیان گەیشتۆتە –هەزار– ئەوە بە پێی ئەو کتێبە پیرۆزەی باوەڕیان پێی هەیە، هەروەك دەشزانین هیچ کەسێك ئەوانەی باس نەکردووە، یاخود بە ئارەزوبازیان دابنێت، بەڵام ئەوە لەسەر پێغەمبەری ئێمە(ﷺ) بە زۆر هەژمار دەکەن، لە کاتێکدا لە نێو هەمو پێغەمبەران، تاکە پێغەمبەرە، کە خوای پەروەردگار



ژمارەی هاوسەرەکانی بۆ دیاری کرد بێت، فەرموویەتی: ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ رَّقِيبًا﴾ الأحزاب: ٥٢. واتە: لەمڕۆ بەدواوەو پاش ئەمانەی باسمان کردن هیچ ژنێکی ترت بۆ حەڵاڵ نییە و بۆیشت نییە بیانگۆڕیت بە ژنی تر، واتە یەکێك یا زیاتریان تەڵاق بدەی و لەباتیی ئەو ژنی تر بهێنی هەر چەند جوانییشیانت زۆر بە دڵ بێ، مەگەر ئەو کەنیزەکانەی ببن بە موڵکی خۆت، خوا ئاگای لە هەموو شتێکەو هیچی لێ ون نابێ، کەواتە لەو سنوورە لامەدە کە ئەو بۆی دیاری کردووی.

لە کاتێکدا، کە لەلای پێغەمبەرانی دی بە رەهایی بووە، وەك لەو دەقانەی دواتردا دێینە سەریان.

* * *

# هەندێ دەق، کە چەند ژنی پێغەمبەرانی ئەهلی کیتاب دەردەخەن

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾ الأحقاف: ٩. واتە: تۆ ئەی محمد، پێیان بڵێ: من شتێکی تازە بابەت نیم لەناو پێغەمبەراندا بۆ شتێکتان بانگ بکەم کە پێغەمبەرانی پێش خۆم خەڵکیان بۆ ئەو شتە بانگ نەکردبێ.

***

لە (سیفری تەکوین) بەم شێوەیە باسی یەعقوب پێغەمبەر (عليه السلام) هاتووە: (فقام يعقوب وحمل بنيه وزوجاته على الجمال). واتە: (یەعقوب منداڵ و (هاوسەرەکانی) سواری وشتر کردو...) سفر التكوين ٣١ : ١٧.

ئایا رۆژێ لە رۆژان بیستومانە کەسێك باسی هاوسەرەکانی یەعقوبی پێغەمبەر بکات، یان باسی پاڵنەرەکانی چەند ژنی ئەو بکات؟!.

هەروەها لە (سەمەوئەلی دووەم)، هاتووە، کە داوود(عليه السلام) چەند هاوسەرو کەنیزەکێکی هەبووەو چەند کچ و کوڕێکی زۆری لێ وەپاش کەوتون: (وبعد مجيئه-أي داود-من حبرون اتخذ له جواري وزوجات..وولد له بنون وبنات). واتە:(دوای هاتنی ـ واتە داوود(عليه السلام) ـ. لە حەبرونەوە، چەند کەنیزەك و هاوسەرێکی بۆ خۆی بڕیاردان.. و چەند کچ و کوڕێکی لێ بوون) سەمەوئەلی



دوومم ٥ : ١٣.

سەرەڕای ئەوەش وەك ئەوەی ئەو کارە هەر ڕوی نەدابێت، نابینین هیچ کەس ئەو کارەی داوود(عليه السلام) بە نەشیاو بزانێت و هیچ کەس بە ئارەزوبازی تۆمەتباری نەکردووە!..

هەرچی لە (ملوکی دووەم)ە، هاتووە، کە ژمارەی هاوسەرانی سولەیمان(عليه السلام) بە پێی تەورات گەیشتۆتە هەزار هاوسەر : (ئەو ـ سولەیمان ـ حەوسەد ئافرەت و سێ سەد کەنیزەکی هەبون و دڵیان داگیر کرد بو) الملوك الأوّل ١١ : ٣.

سەرەڕای ئەو هاوسەرە زۆرانەی سولەیمانی پێغەمبەر (عليه السلام) هەرگیز نەماندیوەو نایشبینین، کە بگوترێت سولەیمان بە هۆی ئارەزوبازییەوە هاوسەرگیری لە گەڵیاندا کردووە (حاشا سولەیمانی پێغەمبەر (عليه السلام) ئارەزوباز بوبێ.

بەڵام کاتێك باسەکە لەسەر پێغەمبەری خوا ـ محمد ـ (ﷺ) بێت، ئەوا تانە و تەشەری زۆری لێدەدرێت و پەنجەی رق و تومەتباری بۆ درێژ دەکرێ.

ئەوەی باسمان کرد بە کورتی لەو چەند دێرەدا دەخەینە رو، جا با ئەو کەسەی راستی و سەلامەتی هەردو دنیای دەوێ بە دڵ و عەقڵی دادگەرانە بڕیار بدات:

١- ئەو (ﷺ) بە هیچ جۆرێك بەو شێوەیە نەبووە وەك باسی دەکەن، بەڵکو ئەو قسانە درۆو دەلەسەن و بێ بنەمان، بەڵگەشمان بۆ قسەکانمان ئەو بەڵگانەن:

أ: لە تەمەنی لاویدا، لە مەککەدا بە پاکی و داوێنپاکی ناسرا بو، سەرەڕای ئەوەی هەمو هۆکارێکی ئارەزوبازی لەبەردەستدا بوو، بە ئاسانی دەیتوانی ئارەزوبازی بکات و بکەوێتە نێو خراپەکارییەوە.

ب: هاوسەرگیری لەگەڵ خەدیجەدا ـ رەزای خوای لەسەر بێت ـ کە تەمەنی زۆر لە خۆی زیاتر بو.



ج: تا خەدیجە لە ژیاندا مابو هاوسەرگیری لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی تردا نەکرد.

د: ئەو (ﷺ) دوای تەمەنی پەنجا ساڵی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی دیدا کردووە، نابێ ئەو ئەرکە زۆرانەیش لەبیر کەین، کە لەو تەمەنەدا دەکەونە سەر مرۆڤ بەتایبەتی سەر ئەوی پێغەمبەر.

٢- ئەو (ﷺ) ژمارەی خێزانەکانی بۆ دیاریکرا بو، هەروەکو خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴾ الأحزاب: ٥٢.

واتە: لەمڕۆ بەدواوەو پاش ئەمانەی باسمان کردن هیچ ژنێکی ترت بۆ حەڵاڵ نییە و بۆیشت نییە بیانگۆڕیت بە ژنی تر، واتە یەکێك یا زیاتریان تەڵاق بدەی و لەباتیی ئەو ژنی تر بهێنی هەر چەند جوانییشیانت زۆر بە دڵ بێ، مەگەر ئەو کەنیزەکانەی ببن بە موڵکی خۆت، خوا ئاگای لە هەموو شتێکەو هیچی لێ ون نابێ، کەواتە لەو سنوورە لامەدە کە ئەو بۆی دیاری کردووی.

لەکاتێکدا کە ژمارەی پێغەمبەرانی دی و شوێنکەوتووانیان، وەك لە تەوراتدا هاتووە دیاریکراو نەبووە.

٣- هۆکاری تەشریعی و کۆمەڵایەتی و سیاسی هۆکاری سەرەکی چەند ژنی پێغەمبەر(ﷺ) بون، بەڵام بۆ پێغەمبەرانی دی، کە چەند ژنێکیان هەبووە، هیچ کام لەو هۆکارانە بونیان نەبووە، هەروەکو ـ کتێبی پیرۆز ـ پێمان دەڵێت.

٤- ڕێبازی زانستییانە پێمان دەڵێت، کە باسی چەند ژنی پێغەمبەر (ﷺ) ـ لە ژینگەیەکدا کە چەند ژنی تێدا کارێکی ئاسایی و بڵاوبووە ـ ناتوانرێ بە پێوەری سەردەمییانە بپێورێن، بەو پێوەرانەی لە ژینگەیەکی زۆر جیاواز لە ژینگەی ئەو(ﷺ) هاتونەتە کایەوە.



**پێویستە ئاگاداری شتێکی تریش بین، ئەویش:**

**ئەگەر چەند ژنی پێغەمبەر(ﷺ) کارێکی نەشیاو و نەخوازراو بایەو، تەنیا ئارەزوبازان کردبێتیان، ئەوا بێباوەڕانی قورەیش یەکەم کەس دەبون، کە هێرشیان دەکرد سەرو تانەو تەشەریان لە راستی پەیامەکەی دەدا، بۆچی نا، کە ئەوان هیچ ڕێگایەك نەمابو بۆ ئازاردانی و ڕێگری کردن لە پەیامەکەی نەیگرنەبەر .**

*** * ***

# بەڵێ... ئەو بەو شێوەیە بو...

أكــرِم بخلــق نبي زانــه خلــقٌ بالحسن مشتمل بــالبشر متسم

كالزهر في ترف والبدر في شرف والبحر في كرم والدهر في هِمَـمِ

كە وەقێ ئـــــال و یارانی لــە خدمەتیا دەبن وەك ڕۆح[1]

حەیاتە نــووری چاوە، ئونسی جانە، مەحزی ئیحســـانە

لە ڕوخساری لەتیفی: گوڵێ لە جەعدی عەنبەرینی دڵ

دەجــوّشێت و دەبــارێ، ئەو گــوڵـستان، ئـــەم دڵـــستانە[2]

***

ئەو...

لەهەمو کەس .. ڕەوشت بەرزتر بو.

لە هەمو کەس .. شێوە جوانتر بو.

لە هەمو کەس .. لەگەڵ خەڵکدا ڕەفتار جوانتر بو.

لە هەمو کەس .. سەخی ترو نەرم و نیان ترو ئازاتر بو.

لە هەمو کەس .. زیاتر لە دنیا بێ باك ترو بۆ دوارۆژ بەکردار تر بو.

---

(١) لەبەر ئەوەی بە وەرگێڕانی هوتراوە جوانی و ڕەوانی هوتراوەکە نامێنێ، لە جیاتی وەرگێڕان لە دیوانی شاعیری بەناوبانگی کورد(مەحوی)چەند هوتراوەیەکی جوانم لەجێ داناوە (وەرگێڕ).

(٢) دیوانی مەحوی، قەسیدەی بەحری نور. ل٤٧٣.



لە گەڵ خەڵکدا بە بەزەیی بو، لە ئاراستەکردنیاندا کار بەجێ بو.

لە هەمو کەس بەڕەحم تر بو، لە هەمو کەس ڕاستگۆ تر بو، لە هەمو کەس خۆش مەجلیس تر بو.. دادگەر بو، تەنانەت لەسەر نزیکترین کەسیشیدا شەرعی خوای جێبەجێ دەکرد.

بە پیر ئەو کەسەوە دەچو، کە دەهاتە لای و تامەزرۆیانە گوێی بۆ دەگرت، تاوای هەست دەکرد، کە لە هەمو کەس خۆشتری دەوێ.

کاروباری خەڵکی ڕایی دەکرد و لای ئاسایی بو لەگەڵ بێوەژن و هەژارو نەدارو کۆیلەکاندا بڕوات و کارەکانیان جێبەجێ بکات.

بانگهێشتی ئازاد و کۆیلە و دەوڵەمەند و هەژاری ڕەت نەدەکردەوەو، سەردانی نەخۆشی دەکرد، ئەگەر لەو پەڕی شاریش بوایە پۆزشی کەسیشی ڕەت نەدەکردەوە.

لە هەمو کەس سوکتر نوێژی بۆ خەڵك دەکردو، لە هەمو کەسیش درێژتر بەتەنیا نوێژی دەکرد، تا ئەندازەیەك، کە پێکانی هەڵدەئاوسان.

لە نێو گەلەکەیدا بە ئەمین ناسرا بو، ئەمین لە: گوفتارو کردارو ڕەوشت و ئاکاردا، لەمەشیاندا دوژمن بەر لە دۆست ئەو شایەتییەیان بۆ داوە.

لە گەڵ هەژاراندا دادەنیشت.

هەر کەسێکی دیبا سڵاوی لێدەکرد.

لە کۆتایی مەجلیسدا دادەنیشت، نەك لەسەروی مەجلیس!

لە نەزانی دەبوری و لەسەر ئازارداندا ئارامگر بو.

حەزی نە دەکرد کەس لەبەری هەستێت، هەروەك چۆن نەیدەویست کەس زۆر ستایشی بکات.

ئەگەر منداڵەکەی گریابا، نوێژی کورت دەکردەوە نەوەك دایکی بەخەبەر بێنێت.

بیری هاوەڵانی دەکرد و پرسیاری دەربارە دەکردن و دڵی دەدانەوەو ئامۆژگاری



دەکردن.

لە ناخۆشی و ئازارو مەینەتدا هاوبەشی دەکردن هەروەك چۆن لە خۆشی و یاری و گاڵتەشدا بەشداری دەکردن، بەڵام ڕاستی نەبوایە نەیدەگوت.

زۆر خۆ بەکەمگر بو و لە هەمو کەس لە خۆبەلزانی دور تربو.

لەگەڵ خێزانەکانیدا گاڵتەی دەکرد و یاری و پێشبڕکێی لەگەڵدا دەکردن.

ئەگەر شتێکی لا نەخوازراو بوایە لە ڕوی پیرۆزی دیار دەبو.

بەناوی خوا قسەکانی دەستپێدەکرد و کۆتایی پێدەهێنا.

کاتێ دڵخۆش دەبو روی دەدرەوشایەوە و وەك مانگ بریسکەی دەدا.

لەسەر حەسیر پاڵدەکەوت و، بەکەم رازی دەبو.

هەر کاتێ هەواڵێکی خۆشی پێگەیشتبا سوژدەی شوکرانە بژێری بۆ پەروەردگار دەبرد.

هەر شتێك پێوەندی بەوەوە نەبوایە قسەی لەسەر نەدەکرد و تەنیا دەربارەی ئەو شتانە دەدوا، کە چاوەڕێی پاداشتیان لێدەکرا.

زۆر بەسۆز و بەزەیی بو، خراپەی بەخراپە وەلام نەدەداوە، بەڵکو بەخشندەو لێبوردە بو.

خۆی جلەکانی خۆی دەدوریەوەو پیلاوەکانی پینە دەکردو، ئاژەڵەکەی دەدۆشی و خزمەتی خۆی دەکرد.

هەردەم دنیای بەکەم سەیر دەکرد، لە کاتێکدا لەو پەڕی دورگەی عەرەبی تا شامی لەبەر دەستدا بو.

خێرا بو لە رۆیشتندا، رۆیشتنەکەیشی لە هەمو کەس جوانتر و رێکتربو و بە پێلاو و پێخواسیش دەڕۆیشت.



زۆربه‌ی پێكه‌نینه‌كه‌ی خه‌نده بو، ئه‌و په‌ڕی پێكه‌نینه‌كه‌ی ئه‌وه بو، كه ددانه‌كانی ده‌رده‌كه‌وتن.

له كاتێكدا، كه پێشنوێژی بۆ خه‌ڵكی ده‌كرد، كچی كچه‌كه‌ی له باوه‌ش گرتبو، هه‌ركاتێ به‌پێوه با هه‌ڵی ده‌گرت و كاتێ ده‌چووه سوجده دایده‌نا.

چه‌ندان شه‌و به برسییه‌تی سه‌ری ده‌نایه‌وه، خاو وخێزانی هیچیان ده‌ستنه‌ده‌كه‌وت بیخۆن، زۆربه‌ی كاتیش خواردنه‌كه‌یان نانی جۆ بو.

ده‌مێ له‌سه‌ر رایه‌خ ده‌خه‌وت، ده‌مێ له‌سه‌ر كه‌وڵ و هه‌ندێ جار له‌سه‌ر حه‌سیر و هه‌ندێ كاتیش له‌سه‌ر زه‌وی .

مافی خه‌ڵكی پێش مافی خۆی ده‌خست، ده‌یبه‌خشی، كه‌چی مانگێك دو مانگ تێده‌په‌ڕین هێشتا ئاگر له ئاگردانه‌كه‌یاندا بۆ چێشت لێنان نه‌ده‌كرایه‌وه .

ره‌وانبێژترین بونه‌وه‌ری خودا بوو، له هه‌موویان قسه خۆشترو چالاكترو ره‌فتار جوانتر بو، به ئه‌ندازه‌یه‌ك، كه قسه‌كانی دڵی مرۆڤیان داگیر ده‌كرد.

ئه‌گه‌ر قسه‌یه‌كی له كه‌سێك پێگه‌یشتبا و به‌دڵی نه‌با، نه‌یده‌فه‌رمو: فلان كه‌س چییه‌تی، كه ئاواو ئاوا ده‌ڵێت، به‌ڵكو ده‌یفه‌رمو: ئه‌وه هه‌ندێ كه‌س چییانه، كه ئاواو ئاوا ده‌ڵێن؟..

كاتێ ده‌دوا، به ره‌وانی ده‌دوا، به جۆرێك ده‌توانرا وشه‌كانی بژمێردرێن، نه ئه‌وه‌نده خێرا كه له‌به‌رنه‌كرێن، نه بچڕ بچڕ، كه گوێگر تێیان نه‌گات، به‌ڵكو به جوانترین شێوه ده‌دوا.

ئه‌گه‌ر چوبایه ماڵێك ڕاسته‌وخۆ له‌ڕوی ده‌رگا ڕانه‌ده‌وه‌ستا، به‌ڵكو له‌لای چه‌پی، یان ڕاستی.

به رۆژو با یان نا سیواكی ده‌كرد، یاخود كاتێ له‌خه‌و هه‌ڵده‌ستا، یان له كاتی ده‌ستنوێژو نوێژكردندا، ته‌نانه‌ت له‌كاتی چونه‌وه ماڵیشدا.



هەرکاتێ یەکێك لە هاوەڵانی بۆ کارێك رادەسپارد، پێی دەفەرمون: (بشّروا ولا تنفّروا، يسّروا ولا تعسّروا ) رواه أبو داود وصححه الحاكم واته: مژدەی خۆشی بدەن و خەڵك مەتۆقێنن، کارئاسانی بکەن و کارگرانی مەکەن.

کاتێ لە ناشتنی مردو تەواو دەبو، لەسەری ڕادەوەستاو، دەیفەرمو: (استغفروا لأخيكم، وسلوا له التثبيت، فإنّه الآن يسأل). رواه أبو داود وصححه الحاكم واته: داوای لێخۆشبون بۆ براکەتان بکەن و داوای جێگیری بۆ بکەن، چونکە ئێستا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت.

کاتێ لە لای کەسێك رۆژوی شکاند با، دەیفەرمو: (أفطر عندكم الصائمون، وأكل طعامكم الأبرار، وصلّت عليكم الملائكة) مسند أحمد. واته: رۆژووانان لە لای ئێوە رۆژووەکەیان شکاند، مرۆڤی چاك و پاك خواردنەکەتانیان خوارد و فریشتەکانیش دوعاتان بۆ دەکەن.

ئەگەر شتێکی خۆشی دیبا دەیفەرمو: (الحمد لله الّذي بنعمته تتم الصالحات) واته: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی تەنیا بەهۆی ئەوە خۆشییەکان تەواو دەبن و جێبەجێ دەبن.

ئەگەر شتێکی ناخۆشیشی دیبا دەیفەرمو (الحمد لله على كلّ حال) سنن ابن ماجه. واته: لە هەمو باردۆخێکدا هەر سوپاس و ستایشی پەروەردگار دەکەین.

کاتێ شەوان دەچووە سەر جێگای خەوتنی دەستی راستی دەخستە ژێر رومەتی و دەیفەرمو: (باسمك اللّهم أحيا وأموت). واته: خودایا، بەناوی تۆ دەژیم و دەمرم. کاتێك لە خەویش هەڵدەستا دەیفەرمو: (الحمد لله الّذي أحيانا بعدما أماتنا وإليه



النشور) صحيح البخاري. واته: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی دوای مردنمان زیندوی کردینەوە. کاتێ خواردنێکیان بۆ دێنا، دەیپرسی: دیارییە یان سەدەقە؟ گەریانگوتایە: سەدەقە بە هاوەڵانی دەفەرمو بیخۆن و خۆی لێینە دەخوارد، گەر بشیانگوتایە: دیارییە، خۆی خواردنەکەی وەردەگرت و، قۆڵی لێهەڵدەماڵی و لەگەڵیان دەیخوارد (سەحیحی بوخاری).

دەیفەرمو: گوتنی: (سبحان الله، والحمدلله، ولا إله إلاّ الله، والله أكبر) لام لە هەموو شتێك خۆشەویسترە، کە خۆری بەسەردا هەڵاتبێ. (سەحیحی موسلیم).

ئوممەتەکەی خۆشدەویست، بۆی دەپاڕایەوە: (اللهم من ولي من أمر أمّتي شيئاً فشقّ عليهم فاشقق عليه، ومن ولي من أمر أمّتي شيئاً فرفق بهم، فارفق به) صحيح مسلم. واته: خودایا، هەر کەسێ کارێکی ئومەتی منی گرتە دەست و لەسەری قورس کردن و ستەمی لێکردن خودایا ئاستەنگ بخە بەردەم کارەکانی، وە هەر کەسێك کارێکی ئومەتی منی گرتە دەست و ڕەحمی پێکردن، خودایا تۆش ڕەحمی پێبکە.

لە هەمو خەڵك زیاتر دوعای دەکرد و زۆرترین دوعاشی ئەوە بو، کە دەیفەرمو: (اللهم ربّنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النّار) صحيح البخاري. واته: خودایا، ئەی پەروەردگارمان لە دونیاو دوا ڕۆژدا چاکەمان بێنە ڕێ و لە سزای دۆزەخ بمانپارێزە.

## (چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت؟)

وفاتح فتح الله القلوب به والأعين والآذان مِن صَمَم

لەبی رۆحی رەوان و، نێوچەوانی رۆژی لێ دەتکێ

زوبانی تـــا شەکەرڕێژە، دەهانی گەوهەر ئەفشانە[1]

* * *

چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت، لەکاتێکدا ئامۆژگاری کردوم، بەوەی:

١- لە خوا بترسم ... (أوصكم بتقوى الله) سنن الترمذي. واتە: ئامۆژگاریتان دەکەم لە خوا بترسن.

٢- راستگۆ بم... (اصدقوا إذا حدّثتم) مسند أحمد. واتە: کە قسەتان کرد راستگۆ بن.

٣- پەیمان ببەمەسەر... (أوفوا إذا وعدتم) مسند أحمد. واتە: کە پەیمانێکتاندا بیبەنەسەر.

٤- ئەمانەت بپارێزم... (أدّوا إذا اؤتمنتم) مسند أحمد. واتە: ئەگەر ئەمانەتێکتان پێسپێررا بیپارێزن و بیگەیەنن.

---

(١) دیوانی مەحوی، قەسیدەی بەحری نوور ل٤٧٤.



٥- ناپاکی نەکەم ... (کبرت خیانة أن تحدّث أخاك حدیثاً هو لك مصدق وأنت به كاذب) سنن أبي داود. واتە: بەڕاستی خیانەتێکی گەورەیە، تۆ قسەیەك بۆ براکەت بکەی، ئەو باوەڕت پێبکات و خۆشت بزانی درۆیە!

٦- چاودێری هەتیوان بکەم ... (أنا وكافل اليتيم في الجنّة هكذا) وقال بإصبعه السبابة والوسطى) صحيح البخاري. واتە: من و بەخێوکەری هەتیو لە بەهەشتدا ئاواین.. ئاماژەی بۆ هەردو پەنجەی شایەتمان و ناوەڕاست کرد.

٧- لەگەڵ دراوسێ چاك بم... (أحسن جوار من جاورك تكن مسلماً) سنن ابن ماجه. واتە: لە گەڵ دراوسێت باشبە موسڵمانی.

٨- رق و کینەم بخۆمەوە .. ( مامن جرعة أعظم أجراً عندالله من جرعة غيظ كظمها عبد ابتغاء وجه الله) سنن ابن ماجه. واتە: کپ کردنەوەو خواردنەوەی هیچ شتێك لای پەروەردگار لەو رق و کینەیە گەورەتر نییە، کە بەندە لە پێناو خوادا دەیخواتەوەو کپی دەکاتەوە.

٩- دوارۆژم خۆشبوێ ... (أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال لا إله إلاّ الله خالصاً من قلبه أو نفسه) صحيح البخاري. واتە: بەختەوەرترین کەس بە تکا و شەفاعەتی من لە قیامەتدا، ئەو کەسەیە، کە لە دڵییەوە یاخود لە دەروونییەوە بە دڵسۆزییەوە گوتبێتی (لا إله إلاّ الله).

١٠- سڵاو بکەم... (تقرأ السلام على من عرفت ومن لم تعرف) صحيح البخاري. واتە: سڵاو لەهەمو کەس بکە، بیناسی یا نەیناسی.

١١- قسەم نەرم بێت ... (.. فلين الكلام، وبذل الطعام، وسماحُ، وحسن



الخلق) مسند أحمد. واته: .. قسه نەرمی و، خۆراك بەخشین و، بەخشندەیی و، رەوشت بەرزی)

١٢- کاری باش بکەم ... (کلّ عمل بن آدم یضاعف الحسنة عشر أمثالها ألی سبع مائة ضعف..) صحیح مسلم. واته: (بەنی ئادەم هەر چاکەیەك بکات بە دە ئەوەندە تا حەوسەد ئەوەندە بۆی زیاد دەکرێت).

١٣- زۆر هیوا درێژ نەبم ... (هذا ابنو آدم، وهذا أجله، وذاك أمله ...) مسند أحمد. واته: (ئەوە بەنی ئادەمە، ئەمەش ئەجەلەکەیەتی، ئەوەش هیواکەیەتی.

١٤- لە لێپرسینەوە بترسم ... (من نوقش الحساب عُذِّبَ) صحیح البخاري. واته: هەر کەسێ لەسەر تاوانەکانی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ سزا دەدرێ.

چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت لە کاتێکدا ئامۆژگاری کردوم بەوەی:

١٥- .. لە لای هەمو دارو بەردێ یادی خوا بکەم.

١٦- لەسەر هەمو تاوانێك تەوبە بکەم .

١٧- لە رواڵەت و پەنهانیدا دڵسۆز بم.

١٨- لە رەزامەندی و تورەییدا دادگەر بم.

١٩- بەو کەسە ببەخشم، کە پێی نەبەخشیوم.

٢١- سەردانی ئەو کەسە بکەم، کە سەردانم ناکات.

٢٢- بێدەنگیم بیرکردنەوە بێ، قسە کردنم زیکرکردن بێت، روانینیشم پەند وەرگرتن بێت.

٢٣- تەنانەت ئەگەر بکوژرێم یان بسوتێنرێم هاوەڵ بۆ خودا بڕیار نەدەم.

٢٤- چاوم لە ئاست ژنی بێگانەدا دانەوێنم.



٢٥- بێئەمری دایك و باوکم نەکەم.

٢٦- مەی نەخۆمەوە، چونکە سەری هەموو خراپەیەکە.

٢٧- بێئەمری خودا نەکەم.

چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت، لە کاتێکدا ئامۆژگاری کردوم، کە پێنج شتان بەر لە پێنجان بپارێزم:

٢٨- گەنجی بەر لەپیری.

٢٩- لەش ساغی بەر لەنەخۆشی.

٣٠- دەوڵەمەندی بەر لە هەژاری.

٣١- دەست بەتاڵی بەر لەسەر قاڵی.

٣٢- ژیان بەر لەمردن.

* چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت، لە کاتێکدا فەرمانی پێکردوم بە:

٣٣- خۆشەویستی هەژار و نەداران و نزیك بونەوە لێیان.

٣٤- لە کاروباری دنیایدا سەیری لە خۆم نزمتر بکەم، نەوەك لەخۆم بەرزتر.

٣٥- بەهەر جۆرێك بێت صیلەی ڕەحم بە ئەنجام بگەیەنم.

٣٦- فەرمانی پێکردوم، کە داوای هیچ شتێك لە کەس نەکەم.

٣٧- فەرمانی پێکردوم، کە راستی بڵێم، هەر چەندە تاڵیش بێت.

٣٨- فەرمانی پێکردوم، کە لە پێناو خوادا لە قسەی هیچ کەس نەترسم.

٣٩- فەرمانی پێکردوم، کە زۆر بڵێم: لا حول ولا قوّة إلاّ بالله.

* چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت، لە کاتێکدا فەرمانی پێکردوم خۆم بپارێزم لە:

٤٠- هاوەڵ دانان بۆ خودا.

٤١- جادوگەری.



٤٢- كوشتنی بە ناهەق.

٤٣- سو (ربیا) خواردن.

٤٤- خواردنی ماڵی هەتیوان بە ناهەق.

٤٥- پشتهەڵكردن لە خودا و باوەڕداران لە كاتی پێویستدا.

٤٦- بوختان كردن بە ئافرەتە باوەڕداره داوێن پاكەكان.

* چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت، لە كاتێكدا لێمی قەدەغەكردووە كە:

٤٧- جنێو بدەم.

٤٨- بە درۆزن باوەڕ بكەم.

٤٩- راستگۆ بە درۆ بخەمەوە.

٥٠- بێئەمری پێشەوای دادگەر بكەم.

٥١- خراپەكاری لە زەویدا بكەم.

* چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت، لە كاتێكدا، ئامۆژگاریمان دەكات بەوەی، كە دڵەكانمان پێكەوە پێوەند دەكات و دڵ و دەروونمان پاك دەكاتەوەو بەرزمان دەكاتەوە:

٥٢- حەسودی بە یەكتر مەبەن.

٥٣- فیڵ لە كڕین و فرۆشتنی بە (مەزاد) دا مەكەن.

٥٤- رق و كینەتان بەرانبەر یەكتر لە دڵدا نەبێت.

٥٥- پشت لە یەكتر مەكەن.

٥٦- كڕین و فرۆشتن بەسەر كڕین و فرۆشتنی یەكتر مەكەن.

٥٧- هەموتان بەندەی خوداو برای یەكتر بن.

٥٨- مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێنا كات، لەكاتی ستەمدا پشتی تێناكات و، خۆیشی بەسەریدا گەورەو زاڵ ناكات.



* چۆن دەتوانم خۆشم نەوێت، لە کاتێکدا، کە هەر ئەوە ڕێنمونیمان دەکات بۆ ئەوەی، کە بۆمان چاکە:

٥٩- هەرکەسێ بە ناوی خودا پشتی پێبەستێن پشتی بگرن.

٦٠- هەر کەسێ بە خودا ـ بەناوی خوا ـ داوای لێکردن پێی ببەخشن.

٦١- هەر کەسێ بانگهێشتی کردن ـ دەعوەتی کردن ـ بە پیریەوە بڕۆن.

٦٢- هەر کەسێ چاکەیەکی لەگەڵدا کردن پاداشتی بکەن.

٦٣- ئەگەر هیچتان شك نەبرد پاداشتی بکەن، ئەوا دوعای بۆ بکەن تا ئەوکاتەی وادەزانن، کە ئیتر پاداشتتان کردووە.

* چۆن خۆشم نەوێت، لە کاتێکدا، فێری کردوم چۆن دەبم بە: ملکەچترین بەندەو، دەوڵەمەندترین کەس و، باوەڕدارومسوڵمان:

٦٤- خۆت لە حەرامەکان بپارێزە دەبیتە ملکەچترین بەندە.

٦٥- بەوەی خودا بۆتی داناوە رازیبە، دەبیتە دەولەمەندترین کەس.

٦٦- لەگەڵ دراوسێت باشبە دەبیتە باوەڕدار.

٦٧- ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە بۆ خەڵکیشت پێتخۆش بێت دەبیتە مسوڵمان.

چۆن خۆشم نەوێت لە کاتێکدا بەهۆی ئەوەوە بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنمونی کرام و شوێن پێی ئەو کەوتوم..

چۆن خۆشم نەوێت لە کاتێکدا، کە خۆشی ویستوم بێئەوەی بمبینێت یان ببینم..

چۆن خۆشم نەوێت لە کاتێکدا، کە ئەو خۆشەویستی پەروەردگارە ـ جل جلالە ـ.

* * *

## گومانی ئەوەی کتێبە ئاسمانییەکانی پێشو مژدەی هاتنی ئەویان (صلى الله عليه وسلم) نەداوە..

**گومان:**

گومانەکە دەڵێت: پێغەمبەر محمد(ﷺ) لەلایەن خوداوە نەنێردراوە چونکە: کتێبە ئاسمانییەکانی پێشو-تەورات و ئینجیل-مژدەی هاتنی ئەویان نەداوە!

وەڵامدانەوەی گومانەکە:

مژدە بە دو شێوەیە:

١-مژدە لە تەوراتدا.

٢-مژدە لە ئینجیلدا.

یەکەم مژدەکانی تەورات دەربارەی هاتنی پێغەمبەرمان(ﷺ):

سەرەڕای دەستکاریکردن و گۆڕینی تەورات، کەچی هێشتا مژدەی هاتنی پێغەمبەرمانی (ﷺ) هەر تێداماوە، تەنانەت لەلای هەندێك توێژەر و شارەزا گەیشتوتە پەنجا مژدە، بەڵام بە خستەڕوی تەنیا دو دانەیان وازدەهێنین:

**١-مژدەی یەکەم کە لە (السفر التثنية) دا هاتووە:**

(وهذه هي البركة التي بارك بها موسى رجل الله بني اسرائيل قبل موته، فقال: جاء الربّ من سيناء وأسرق لهم من سعير، وتلألأ من جبل فاران)٣٣: ١-٣.

لەو دەقەی پێشودا ئاماژە بۆ سێ هەواڵ و مژدە کراوە:



یەکەمیان: هەواڵی یەکەم دەربارەی موسایە(علیه السلام) کە لە چیای (سینا) سروشی وەرگرتووە.

دووەمیان: هەواڵی دووەم دەربارەی عیسایە (علیه السلام)، وشەی (سعیر) کە لە دەقەکەدا هاتووە گوندێکی نزیك بەیتولمەقدیسە کە عیسا(علیه السلام) پەیامەکەی لەوێدا وەرگرتووە.

سێیەمیان: هەواڵی محمد(ﷺ)، چونکە چیای (فاران) کە لە دەقەکەدا هاتووە ئەو شوێنەیە کە یەکەم جار وەحی تێدا وەرگرتووە، (فاران) شاری مەککەی پیرۆزە، شوێنی لەدایکبون و گەورەبون و بون بەپێغەمبەری پێغەمبەرمانە(ﷺ).

*بەڵگە لەسەرئەوەی کە (فاران) مەککەی پیرۆزە:

دانەرانی کتێبی (فەرهەنگی کتێبی پیرۆز) دەڵێن فاران (ئیلات)ە نەوەك مەککەی پیرۆز.

بەلاّم ئەوە قسەیەکی بێبنەمایە، چونکە هیچ پێغەمبەرێك لە(ئیلات) نەنێردراوە!

فاران مەککەی پیرۆزە و چیای فاران چیای(نور)ە، کە ئەشکەوتی حیرائی لێیە و پێغەمبەرمان لەوێدا وەحی بۆ هاتووە.

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر(کتێبی پیرۆز) دەبینین وشەی(فاران) لە جێگایەکی تریشدا هاتووە، لەباسی چیرۆکی ئیسماعیل و خاتو هاجەرەی دایکی، کاتێ ئیبراهیم(علیه السلام) دوای لەدایك بونی ئیسماعیل ئیسماعیل و دایکی ناردنە زەوی فاران(برية فاران)سفر التكوين: ٢١:٢١.

مەقامی ئیبراهیم(علیه السلام) لە مەککەی پیرۆزە، کە ئیبراهیم و ئیسماعیل ماوەیەك تێدا مانەوە و دیواری کەعبەیان بەرزکردەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ



وَإِسۡمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ البقرة: ١٢٥. واتە (یادی ئەوە بکەنەوە کە خانووی کەعبەی پیرۆزمان کردە مەڵبەندو جێ حەسانەوەی زیارەتکەران بۆ هەرکەس ڕووی تێ بکات، هەروەها کردمانە شوێنێکی پیرۆزی وەها کە زیارەتکردنی هۆی پاداشت بێ وکردمانە شوێنی ئەمن و ئاسایش و هەرکەسێ لەوێ بێ ئەمینە لەوەی دەستدرێژی بکرێتەسەرو، ئەوبەردەی شوێن پێی ئیبراهیمی لەسەرە یا ئەو شوێنەی کە بەردەکەی تێدایەو ئیبراهیم لەسەری ڕاوەستاوەو بانگی خەڵکی کردووە بۆحەج، یاهەموو حەرەم بکەنە شوێن نوێژی خوتان و خودا پەرستی تێدابکەن .یادی ئەو وەختە بکەنەوە کە بەئیبراهیم وئیسماعیلمان وت: خانووی من کەعبەی پیرۆزە، پاکی بکەنەوە بۆ ئەوانەی بە دەوریدا ئەسوڕێنەوەو بوئەوانەی لەوێ ئەمێنەوە بۆخودا پەرستی و بۆ ئەوانەی لە ڕکوع و سجوددان بۆخودا گەورە).

﴿وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ البقرة: ١٢٧.واتە( یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە وەختی خۆی ئیبراهیم وئیسماعیل بناخەی کەعبەیان بەرز ئەکردەوە، ئیبراهیم بینای ئەکردو ئیسماعل بەردو شتومەکی ئەدایە دەست ولەگەڵ بەرزکردنەوەی بیناکەیدا لە خودا ئەپاڕانەوە ئەیانوت: خودایا بەنەوازشی خۆت ئەم کارەمان لێ قبوڵ بفەرموو .بێگومان هەر تەنها تۆی هەموو دەنگێ ئەبیستی و هەر تۆی بەهەموو شت ئەزانی).

## ٢-مژدەی دووەم: ئەویش لە (سفر التثنية)دایە:

(أُقِيمُ لَهُمْ نَبِيّاً مِنْ وَسَطِ إِخْوَتِهِمْ مِثْلَكَ وَأَجْعَلُ كَلامِي فِي فَمِهِ فَيُكَلِّمُهُمْ بِكُلِّ مَا أُوصِيهِ بِهِ.١٩ وَيَكُونُ أَنَّ الإِنْسَانَ الذِي لا يَسْمَعُ لِكَلامِي الذِي يَتَكَلمُ بِهِ بِاسْمِي أَنَا أُطَالِبُهُ)١٨:١٨.

زانایانی مه‌سیحی ده‌ڵێن مه‌به‌ست له‌و مژده‌یه عیسایه(عليه السلام)، به‌ڵام له‌ڕاستیدا ئه‌وه‌ی باسكراوه به‌هیچ جۆرێك له جۆره‌كان به‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ر محمد(ﷺ)دا نه‌بێت جێبه‌جێ نابێت، له‌به‌ر چه‌ند هۆیه‌ك، له‌وانه:

١-ده‌سته‌واژه‌ی (أُقِيمُ لَهُمْ-أي: لبني إسرائيل- نَبِيّاً مِنْ وَسَطِ إِخْوَتِهِمْ) واته:له‌نێو براكانیاندا-نه‌وه‌كانی ئیسرائیل -یه‌عقوب- پێغه‌مبه‌رێكیان بۆ هه‌ڵده‌بژێرم.واته له وه‌چه‌كانی ئیسماعیل-عليه السلام-..ئه‌وه‌ی له (سفر التثنية)دا هاتووه ئه‌و قسه‌یه پشتڕاست ده‌كاته‌وه، كه ده‌ڵێت:٣٤:١٠ (ولم يقم بعدُ نبيٌّ في بني إسرائيل مثلُ موسى الذي عرفه الرب وجهاً لوجه).واته: هێشتا پێغه‌مبه‌رێكی وه‌كو موسا له نه‌وه‌كانی ئیسرائیل نه‌هاتووه كه خودا ڕوبه‌ڕو قسه‌ی له‌گه‌ڵدا كردبێت.

به‌مه‌ش بۆمان ده‌رده‌كه‌وێت، كه ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ی باسكراوه له نه‌وه‌ی ئیسرائیل-یه‌عقوب-نییه به‌ڵكو له نه‌وه‌كانی ئیسماعیله، كه خۆی و دایكی له‌زه‌وی عه‌ره‌بدا-مه‌ككه‌ی پیرۆز-نیشته‌جێبو، ئه‌ویش ئیسماعیلی باپیره‌گه‌وره‌ی -محمده(ﷺ)، وه‌ك زانراویشه عیسا پێغه‌مبه‌ر له نه‌وه‌كانی ئیسرائیل-یه‌عقوب-ه كه‌واته مه‌به‌ست پێغه‌مبه‌ر عیسا نییه.

٢-پێغه‌مبه‌رمان محمد(ﷺ) وه‌كو پێغه‌مبه‌ر موسایه-عليه السلام-هه‌روه‌كو له سیفری ته‌كویندا هاتووه (من وسط إخوتهم (مثلك)). واته: له‌براكانیان (وه‌ك تۆ)ئه‌ی موسا.

له چه‌ند خاڵێكدا ئه‌وه ده‌خه‌ینه‌ڕو، كه پێغه‌مبه‌رمان و موسا له‌یه‌كده‌چن:

*هه‌ردوكیان دایك و باوكیان هه‌بووه و هه‌ردوكیشیان به سروشتی له‌دایك بوون، به پێچه‌وانه‌ی عیسا -عليه السلام- كه به موعجیزه له دایكێكی بێ باوك له‌دایك بووه.

*هه‌ردوكیان هاوسه‌رگیریان كردووه و منداڵیان هه‌بووه، هه‌رچی عیسایه-



عليه السلام- بەدرێژایی ژیانی سەڵت بو.

*هەردوکیان شەریعەت و ئەحکامی نوێیان هێناوە، هەرچی عیسایە- عليه السلام- شەریعەتێکی نوێی نەهێناوە، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە تا شەریعەتی موسا- عليه السلام- تەواوبکات، هەروەکو لە ئینجیلی مەتا هاتووە: (لا تظنوا أني جئت لأنقض الناموس أو الأنبياء..ما جئت لأنقض بل لأكمل)متى١٧:٥.واتە: واگومان مەبەن کە من هاتوم سروش و پێغەمبەران ڕەتبکەمەوە..من بۆ ڕەتکردنەوە نەهاتوم، بەڵکو بۆ تەواوکردن هاتوم.

*هەردوکیان-محمد و موسا-دەسەڵاتی گەلەکەیان لەدەست دابو، بەڵام عیسا دەسەڵاتی گەلەکەی لەدەستدانەبو.

*هەردوکیان بەشێوەیەکی سروشتی وەفاتیان کردووە، بەپێچەوانەی عیسا کە بەپێی بیروباوەڕی مسوڵمانان خودا بوڵای خۆی بەرزی کردوتەوە، لەبیروباوەڕی مەسیحیشدا لەخاچ دراوە.

٣- (وَأَجْعَلُ كَلامِي فِي فَمِهِ فَيُكَلِّمُهُمْ بِكُلِّ مَا أُوصِيهِ بِهِ).واتە: فەرمودەکانی خۆمم دەخەمە دەمییەوە و هەرچی پێی ڕادەگەیەنم بەخەڵکی ڕادەگەیەنێت.

ئەمەش بەسەر قورئانی پیرۆزدا نەبێت جێبەجێنابێت، چونکە قورئان فەرمودەی خودایەو لەرێی وەحییەوە جبریل خستوتیە دەمی موبارەکی پێغەمبەرەوە.

لە قورئانیشدا هاوشێوەی ئەوە هاتووە:

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾ الكهف: ١١٠.واتە (تۆ ئەی پێغەمبەر بڵێ من تەنیا بنیادەمێکم وەك ئێوە و گەزافی ئەوە لێنادەم کە هەمور کەلیمەکانی خودا ئەزانم تەنیا بەوە لەئێوە جیائەبمەوە کە وەحیم بۆتەکرێ و ئەوترێ: کەبەڕاستی خودای ئێوە



خودایێکی تاق و تەنیاو بێ هاوبەشە، دەی هەرکەس بەهیوای ئەوەیە بەسەربەرزی و شادمانی بگاتە حوزووری خودا، باکردەوەی چاك وبەسوود بكات بۆخۆی وبۆخەڵك و، هیچ یەکێ نەکاتە هاوبەشی خودای خۆی).

خوای پەروەردگار فەرمودەکانی خستوتە دەمی پێغەمبەرەوە تا بە خەڵکی ڕابگەیەنێت، لەوبارەیەشەوە ئاماژەیەکی ڕون و ئاشکرا لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ * عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴾ النجم: ٣ – ٥.واتە (٣)لە ئارەزوی نەفسی خۆیشیەوە قسەناکات.(٤)ئەوەی کە ئەو ئەیخوێنێتەوە بەسەرتاندا لە وەحی بەولاوە نییە کەلە خواوە وەحی بۆئەکرێ .(٥)فریشتەیەکی فرە بەهێز کە جیبرەئیلی فریشتەی وەحیە ئەم وەحیەی فێرکردوە کە لەخواوە بۆی ئەهێنێ

.

کەواتە پێغەمبەری خوا لە خۆڕا قسەی نەکردووە، بەڵکو فەرمودەکانی پەروەردگاری ڕاگەیاندووە، کە خستویەتییە دەمی موبارەیەکییەوە.

## دووەم: مژدە لە ئینجیلدا:

لە ئینجیلی یوحەننادا هاتووە:مەسیح بە قوتابییەکانی فەرمو:

(لكني أقول لكم الحق إنه خيرٌ لكم أن انطلق، لأنه إن انطلق لا يأتيكم المعزيّ، ولكن إن ذهبت أرسله لكم، ومتى جاء ذاك يبكّت العالم على خطية وعلى برٍ وعلى دينونة) ١٦:٧-٨.

واتە: بەلاّم باپێتان بڵێم: (واباشترە من بەرێبکەوم.چونکە ئەگەر من نەڕۆم(موعەززی) تان بۆ نایەت، بەلاّم ئەگەر من بڕۆم بۆتانی دەنێرم، جا کە هات هەمو جیهان بەگوێڕایەڵی و ملکەچییەوە شوێنی دەکەون.



هەروەها هاتووە:(وأما متى جاء ذاك: روح الحق، فهو يرشدكم إلى جميع الحق لأنه لا يتكلم من نفسه بل كل ما يسمع يتكلم به، ويخبركم بأمور آتية)١٣:١٦.

واتە: کاتێك ئەو ڕۆحە هات، بەرەو حەق ڕێنمونیتان دەکات، چونکە ئەو لەخۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو هەرچی دەبیستێت هەرئەوە دەڵێتەو و دەربارەی ڕوداوەکانی ئاینده هەواڵتان دەداتێ.

پاشان دەبینین مەسیح ئەو(المعزى)یە یان ئەو (روح الحق)ە بەچەند سیفەتێك وەسف دەکات:

*سیفەتی ئەوەی کە هەموشتێك فێری خەڵك دەکات، ئەمەش گشتگیری پەیامەکەی دەگەیەنێت، کە بۆ چاکسازی دین و دنیا هاتووە و ئەمەش لە ئیسلامدا نەبێت بەدی ناکرێت.

*هەمو جیهان گوێڕایەڵی دەبن و شوێنی دەکەون، لێرەدا وشەی (العالَم) جێگای سەرنجدانە، کە گشتگیری ئیسلام دەگەیەنێت، بەوەی کە بۆ هەمو گەل و هۆزەکانە بە عەرەب و عەجەمەوەو بۆ هەمو کاتێکیشە، هیچ ئاینێکیش جگە لە ئیسلام بەو دو خەسڵەتە وەسف نەکراوە.

*هەواڵی ڕوداوەکانی ئایندە دەدات و باسی ڕابوردو دەکات، ئەوانەش لە پەیامەکەی محمددا(ﷺ) هاتونەتەدی، هەواڵی ئایندەی پێداوین کە لەپێش ئەو هیچ کەس باسیان نەکردووە، یاخود دەکرێ باسیش کرابن، بەڵام بەو وردی و ڕێکوپێکی و دڵنیاییە نەبوە، کە پێغەمبەر(ﷺ)باسی کردووە، ئەگەر سەرنجی قورئانی پیرۆز بدەین دەبینین باسی هەندێ شتی کردووە بەرلەوەی ڕوبدەن، کەچی بەو شێوەی باسی کردون هاتونەتەدی، وەك باسکردنی نیشانەکانی قیامەت و ئەوەی لە دواڕۆژدا

ڕودەدات وەکو زیندوبونەوە و حەشر و حیساب و باسی بەهەشت و دۆزەخ و...تاد.

هەروەك چۆن باسی ڕوداوەکانی ڕابوردو و باس و خواسی گەلانی پێشوی کردووە، هەروەها باسی ژیار و شارستانییەتەکانی کۆن و لەناوچونیان و بارودۆخ و هەواڵی پێغەمبەران و ئەوەی بە گەلەکانیان ڕاگەیاندووە، هەروەها شایەتی ڕاستگۆیی و دەستپاکی و دڵسۆزی و وەفایان بۆ دەکات و باسی ئەو ململانێیەشمان بۆ دەکات کە لەنێوان حەق خوازان و نەیارانی ڕویداوە و سەرەنجامی درۆزنان و نەیارانی ڕاستیشمان بۆ دەخاتەڕو و...تاد.

پاشان پەیامەکەی هەمو ژیانی گرتەخۆ و کوڵەگەکانی بیروباوەڕی ڕاست و دروستی چەسپاندن و ڕێگاکانی پەرستشی پڕ سود و پاداشتی دانان و بنچینەکانی یاسادانان و تەشریعی بۆ ئەو پرسانە دانان، کە دور و نزیك پێوەندییان بە ژیانەوە هەیە، هەروەها ڕێگای دروستی پێوەندی نێوان وەدیهێنراو(مرۆڤ) و وەدیهێنەرەکەی(خودا) و نێوان مرۆڤەکان خۆیان بەتێروتەسەلی ڕونکردونەتەوە، هەروەها ئەقڵ و دیدی مرۆڤی ئازادکرد و دڵەکانی پاك کردنەوەو ڕێگای ڕاستی بەهەمو کەسێك و دەستەیەك و هەمو گەلێك نیشاندا، بەڕاستی پەیامێکە کە دەربارەی هەموشتێك ڕێنمونی داوە و هەمو شتێکی فێری مرۆڤ کردووە.

کەواتە ئەو (المعزی)یە یاخود(روح الحق)ەی مەسیح -علیه السلام- مژدەی هاتنی داوە کێیە؟

بەڵێ بەبێ هیچ گومان و دودڵییەك پێغەمبەری خوا محمدە(ﷺ).

پاشان یوحەننا لەسەر زاری مەسیح -علیه السلام-مژدەکەمان بوتەواودەکات و دەڵێت:

(ومتى جاء المعزَّى الذي سأرسله " أنا " إليكم من الأب روح الحق من عند الأب



ينبثق فهو يشهد لي.. وتشهدون أنتم أيضاً لأنكم معي من الابتداء)٢٦:١٥-٢٧.

واته: جا كاتێك موعەززى هات كە من لەلاى باوكەوە بۆتانى دەنێرم، ئەو گيانە پاكەى لەلاى باوكەوە دێت، ئەو شايەتى بۆ من دەدات، ئێوەش شايەتيم بۆ دەدەن، چونكە ئێوە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ مندا بون.

هەروەك ئاشكرايە قورئانى پيرۆز لە سەر زمانى محمد (ﷺ) شايەتى بۆ مەسيح -عليه السلام- داوە، كە پێغەمبەرێكى بەرێزى خودايە و پەيامەكەى گەياندووە و نەوەكانى ئيسرائيلى ئاگاداركردوتەوەو پێى ڕاگەياندون، كە ئەو بەندەو پێغەمبەرى خودايە.. خواى پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا * وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا * وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا * وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا * ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾ مريم: ٣٠ - ٣٤. واتە : منداڵەكە هاتە جواب، فەرموى :من بەندەى خودام، خودا كتێبى داومێ و كردومى بە پێغەمبەر . پيرۆزيشى كردوم لە هەر كوێيەك بم و، ئامۆژگاريى كردوم تا بەسەر زيندوبم و لەدنيادا بژيم نوێژبكەم و زەكاتى ماڵ دەركەم . كردوشمى بەئينسانێكى چاكەكار لەگەڵ دايكم ونەى كردوم بەستەمكارێكى خراپەكەر . سەلامى خوايشم لێبێ لەو ڕۆژەدا لە دايك بوم، لەو ڕۆژەيشدا كە زيندو ئەكرێمەوە . ئەو منداڵەى بەو جۆرە لە مەريەمى عەزرا لەدايك بو، ئەوە عيساى كوڕى مەريەم بو .قسەى ڕاست وەربگرە، ئەوقسەيەى ئەوان، واتە كافرەكان، گومانيان خراپە تێدا و هەر لايێ بەجۆرێ قسەى لێ ئەكەن).

لێرەدا بۆمان دەردەكەوێت، كە ئەو(موعەززى)يان(روح الحق)ەى لە ئينجيلدا باسكراوە مژدەى هاتنى(محمد)ە چونكە ئەو هەمو خەسڵەتەكانى تێداهەن، كە باسمان كردن.



هەرچی مژدەیە بەناوی(فارقلیت)ئەوا لە نوسخە عەرەبییە نوێیەکانی کتێبی پیرۆز-جگە لە هەندێ نوسخە کۆنەکان کە لە ساڵانی ١٨٢١-١٨٣١-١٨٤٤چاپکراون وشەکە گۆڕاوە بۆ (موعەززی).

فارقلیت:وشەیەکی یۆنانییە بە یەکێك لەو واتایانەدێت:حامد-محمود، احمد، کە هەمویان داتاشراوی چاوگی سوپاسگوزارین.

هەریەکێك لەو واتایانەش دەکرێ بۆ پێغەمبەری ئیسلام بگەڕێتەوە، چونکە ئەو(حامد و محمود و أحمد و محمد)ە.

* * *

## گومانی ئەوەی، کە پێغەمبەر (ﷺ) بە زمانی عەرەبی قسەی کردووە، ئەدی چۆن پەیامەکەی جیهانییە؟!

- گومان:

دەڵێن ئەگەر محمد(ﷺ) ڕەچەڵەك و زمانی عەرەبی بێت، چۆن دەکرێ خودا بۆ گەلانێك بینێرێت، کە عەرەب نین و بە عەرەبی قسان ناکەن؟! یاخود چۆن خودا ئەرکی وەرگرتن و جێبەجێکردنی پەیامێك دەخاتە ئەستۆی خەڵکانێك، کە نە زمانی پەیامەکە دەزانن، نە دەشتوانن قسەی پێبکەن؟! ئەگەر واشبێت، ئەدی چۆن دەتوانن لە قورئان تێبگەن، چۆن دەتوانن درك بە ئاراستەکردنەکانی پێغەمبەری ئیسلام بکەن، لە کاتێکدا، کە قورئان بە عەرەبییە و پێغەمبەریش بە عەرەبی دەدوێ؟!

* وەڵامدانەوەی گومانەکە:

یەکەمیان: پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پەیامێکی بۆ سەرۆك و پاشاکانی هەمو گەل و هۆزەکان نارد داوای مسوڵمان بونی لێکردن، ئەو ڕێگایەش دوای پەیماننامەی (حودەیبییە) هاتە کایەوە، هەروەها هەمو ئەوانەی وەك نامەبەر بۆ ئەو سەرۆك و پاشایانە نێردرا بون زمانی ئەو گەلانەیان دەزانی، کە نامەیان بۆ بردبون.

هەروەها ئەو(ﷺ) دوو وەرگێڕی هەبوون، کە هەر پەیامێکی لە زمانێکی ترەوە بۆ هاتبا بۆیان وەردەگێڕا بۆ سەر زمانی عەرەبی.

دووەم: پاشا و سەرکردەی گەلەکانی تریش وەرگێڕیان هەبون، کە هەرچی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بۆیان هاتبا بۆیان وەردەگێڕان.



سێیەم: زۆربەی جولەکە و گاورانیش زمانی عەرەبییان دەزانی، هەروەك چۆن هەندێ لە گاورەکان عەرەب بون، وەکو (مەسیحییەکانی نەجران)، گەلانی تری غەیرە عەرەبیش وەکو فارس و گەلانی دی بە هەمان شێوە.

چوارەم: سەردەمی ئازادکردنی وڵاتان، کاتێك سەربازە مسوڵمانەکان دەچونە هەر وڵاتێك وەك چۆن ئایینی ئیسلامیان بڵاودەکردەوە ئاواش زمانی عەرەبییان فێری خەڵکی ئەو وڵاتە دەکرد، هیچ وڵاتێکیش نییە ئیسلامی تێدا بڵاوبو بێتەوە زمانی عەرەبیشی تێدا بڵاو نەبوبێتەوە، تەنانەت لە زۆر شوێن جێگای زمانی فەرمی زۆر لە گەلانی ئەو وڵاتەشی گرتۆتەوە، بۆ نمونە: زمانی قیبق لە میسر، و زمانی فارسی لە عێراق و، ئەوپەڕی باکوری رۆژئاوای ئەفریقیا (زمانی سریانی و چەندین زمانی تر).

پێنجەم: مسوڵمانە عەرەبەکان هەستان بە وەرگێڕانی ئەو بابەتانەی پێویستیان پێیان هەبو لە کلتوری گەلانی دی، بەمەش دەروازەی هزری و رۆشنبیری و زانیارییان بەڕوی ئەو مسوڵمانانەدا واڵا کرد، کە تەنیا زمانی عەرەبییان دەزانی، هەروەك چۆن هەستان بە وەرگێڕانی هەر بەشێك لە کلتوری عەرەبی ئیسلامی، کە بە پێویستیان دەزانی، بەمەش وەك وەفایەك و مافێکی بانگەواز و ڕاگەیاندن ئەو باسانەیان لە عەرەبییەوە وەرگێڕایە سەر زمانی گەلانی تر.

شەشەم: گەلانی غەیرە عەرەبی، کە بونە مسوڵمان بەدەم زمانی عەرەبییەوە هاتن و وازیان لە زمانی خۆیان هێنا و لەڕوی زمانەوە بونە عەرەبی، لەوانەش زانای پایەبەرز هەڵکەوتن، کە کاریگەری زۆریان لەسەر گەشەسەندنی هزری ئیسلامی هەبو، لەوانە زانایانی زمان و زانایانی ڕێزمان و رەوانبێژی و شەرعزان و بنچینە ناسان و زانایانی تەفسیر و فەرمودە و زنایانی فەلسەفە و مەنتیق و بیرکاری و پزیشکی و گەردونناسی و شاعیر و ئەدیب و زانای گەڕۆك و جوگرافیا و، چەندانی دی...

# گومانی هاوسەرگیری کردنی (ﷺ) لە گەڵ هاوسەری کوڕی بەکوڕکراوی زەیدی کوڕی حاریثە (خوا لێی ڕازی بێت)

**گومان:**

دەڵێن محمد (ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵ هاوسەری کوڕە لەخۆگیراوەکەی (زەیدی کوڕی حاریثە (خوا لێی ڕازی بێت)دا کردووە، دوای ئەوەی پێی تەڵاقداوە چونکە حەزی لێی بووە و بە دڵی بووە.

**وەلامدانەوەی گومانەکە:**

هاوسەرگیری کردنی محمد (ﷺ) لەگەڵ هاوسەری کوڕە لەخۆگیراوەکەی خۆی، بە پێی حیکمەتێکی تەشریعییەوە بو، کە ئیسلام داوای دەکرد، بۆ ئەوەی ئەو عادەتە باوە ـ عادەتی لەخۆگرتن ـ کە لە کۆمەڵگەی نەفامیدا رەگی داکوتا بو نەمێنێت و پوچەڵ بکرێتەوە، خوای پەروەردگار (جلّ جلاله) پێغەمبەری دواپەیامی ئاسمانی هەڵبژارد تا لەسەر دەستی ئەو و لەماڵی ئەودا بە کردار ئەو کلتورە بگۆڕێت و نەمێنێت..

خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾ الأحزاب: ٤٠. واتە: موحەممەد باوکی هیچ یەکێ لە پیاوانی ئێوە نەبووە نە زەیدو نە غەیری زەید، بەلاّم پێغەمبەری خواو دوا پێغەمبەری خوایە و خوا بە هەموو شتێکی زانیوەو ئەزانێ.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟



ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ ﴾ الأحزاب: ٥. واته: ئه‌و کوڕانه به ناوی باوکی خۆیانه‌وه بانگ بکه‌ن، ئه‌وه ڕاستترو عه‌داله‌تتره لای خوا. خۆ ئه‌گه‌ر نازانن کوڕی کێن و باوکیان کێیه، ئه‌وا برای دینیتانن و دۆست و براده‌رتانن.

هه‌رچی ئه‌و ئایه‌ته‌یه، که باسی ئه‌و بڕیاره خوداییه ده‌کات، که بریتییه له هاوسه‌رگیری پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له گه‌ڵ هاوسه‌ری کوڕی له‌خۆگرتوی (زه‌ید)، که ناوی (زه‌ینه‌ب) بو (خوا لێی ڕازی بێت)، ئه‌م ئایه‌ته‌یه: ﴿ وَإِذۡ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَأَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِ أَمۡسِكۡ عَلَيۡكَ زَوۡجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخۡفِي فِي نَفۡسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبۡدِيهِ وَتَخۡشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَىٰهُۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيۡدٞ مِّنۡهَا وَطَرٗا زَوَّجۡنَٰكَهَا لِكَيۡ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ حَرَجٞ فِيٓ أَزۡوَٰجِ أَدۡعِيَآئِهِمۡ إِذَا قَضَوۡاْ مِنۡهُنَّ وَطَرٗاۚ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ مَفۡعُولٗا ﴾ الأحزاب: ٣٧. واته: یادی ئه‌وه بکه‌ره‌وه، که ئه‌توت به‌و که‌سه‌ی خوا نیعمه‌تی ئیسلامه‌تیی پێ به‌خشیبوو و تۆیش نیعمه‌تی ئازادیت دابوویه‌و له به‌نده‌ییت ئازاد کرد بوو و، پێش سه‌رده‌می ئیسلامه‌تی کردبووت به کوڕی خۆت، پێت ئه‌وت: ژنه‌که‌ت بهێڵه‌وه بۆ خۆت و ته‌ڵاقی مه‌ده‌و له خوا بترسه‌و خه‌یاڵێکیشت له دڵی خۆتا ئه‌شارده‌وه که خوا ده‌ریخست و، له خه‌ڵك ئه‌ترسای و شه‌رمت ئه‌کرد خه‌یاڵه‌که‌ی دڵت ده‌رخه‌ی، که ئه‌وه بوو ئه‌گه‌ر ئه‌و پیاوه ژنه‌که‌ی ته‌ڵاق دا تۆ ماره‌ی ئه‌که‌یت بۆ خۆت و، خوا له هه‌رکه‌س شایانتره به‌وه که لێی بترسی. جا کاتێ که ئه‌و که‌سه، که زه‌یدی کوڕی حاریثه بوو، پێویستیی خۆی له ژنه‌که‌ی به‌جێهێناو لێی بێزار بوو و کاری پێ نه‌ماو ته‌ڵاقی داو عیدده‌ی به‌سه‌ر چوو، ئێمه ماره‌مان بڕی لێت بۆ ئه‌وه‌ی هیچ تاوانێ ڕوو نه‌کاته مسوڵمانان له ماره‌کردنی ژنی کوڕی به‌خۆیه کوڕ کردوویاندا بۆ خۆیان پاش ئه‌وه‌ی مێرده‌کانیان کاریان پێیان نه‌ماو ته‌ڵاقیان دان، که‌واته له ڕاستیدا کوڕیان نین و هه‌ر به‌ده‌م کردوویانن به کوڕی خۆیان. فه‌رمانی خوا هه‌ر چۆنێ بوو



بی و هەر چۆن بێ، بێگومان جێبەجێ کراوو هاتوتەدی و کەس ناتوانێ بەری لێ بگرێ.

## ڕونکردنەوە:

زەیدی کوڕی حاریثە (خوا لێی ڕازی بێت) دەهاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) لە ئاکاری وا دەردەکەوت و قسەکانی ئەوەیان لێدەفامرایەوە، کە دەیەویست زەینەب تەلاق بدات" چونکە لەگەڵیدا بەختەوەر نەبو و ژیانی بە گوێرەی پێویست خۆشەویستی تێدا نەبو، نەك لەبەر ئەوە تەلاقی دابێت ـ وەك ناحەزان دەڵێن ـ کە پێغەمبەر (ﷺ) حەزی لێبو بێت و زەیدیش لەبەر ئەو تەلاقی دابێت.

پاشان، زەینەب دەیزانی، کە سەرەڕای پێگەی بەرزی خانەوادەیی خۆی، بووەتە خێزانی کەسێك کە کۆیلەی هۆزەکەیانە، هەروەها کاتێك شوی بە زەید کرد ئەو کوڕی خوازراوی پێغەمبەر (ﷺ) بو، دوای ئەوەی لە کۆیلایەتی ئازادی کرد بو، کەواتە ئەو ـ ئەگەر چی کوڕی خوازراوی محمد (ﷺ) ـ بو لە کلتوری کۆمەڵگای مەککی پێیان دەگوت ـ زەیدی کوڕی محمد ـ بەڵام هاوسەرگیری کردنی لەگەڵ کچێکی خانەداندا ـ هەروەك دوێنێ ـ زەید هەر هەمان کەسە، کە لە کۆت و بەندداية و لە ئاست پێگە و جوانی و خەونەکانی ئەودا نەبو، ئەمەش سەیر نییە، بەڵکو ئەمە سروشتی مرۆڤەکانە.

پاشان، هەرگیز زەینەب بەو هاوسەرگیرییە دڵخۆش نەبو، تەنانەت کاریگەری لەسەر زەیدیش دانابو و ئەویش خۆشبەخت نەبوو ئامادە بو لێی جیا ببێتەوە، تەنانەت زەید چووە لای پێغەمبەر (ﷺ) و سکاڵای زەینەبی لەلا دەکرد، هەروەك لە سەحیحی بوخاریدا لە ـ کتاب التوحید ـ لە فەرمودەی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (خوا لێی ڕازی بێت) هاتووە: زەید هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و سکاڵای زەینەبی



لەلا دەکرد، ئەویش (ﷺ) پێی دەفەرمو: دەست بە هاوسەرەکەتەوە بگرە و لەخودا بترسە (أمسك عليك زوجك واتّقِ الله).

ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) هیچ شتێکی شاردبایەوە، ئەو فەرمودەیەی دەشاردەوە.

پاشان، زەینەبی کچی جەحش (خوا لێی ڕازی بێت) کچی مامی پێغەمبەر (ﷺ) بو و ئەو خۆی لە زەیدی مارەکرد بو، ئەگەر پێغەمبەر ئەوی ویستبا ئەوا هەر لەسەرەتاوە لەخۆی مارە دەکرد، دواتر ئەو (ﷺ) بەر لەوەی حیجاب فەرز بکرێت زۆر زەینەبی بینیبوو، لەسەردەمی نەفامیدا ژنان سەرپۆشیان لەسەر نە دەکرد، ئیتر چ شتێك ڕێگری ئەوە بو، کە بیخوازێت ؟! بەڵام ئەو ئەمەی نەکرد.

کەواتە کارەکە لە دەستی هیچ کامیاندا نەبو، نە لەدەستی زەینەب، نە لەدەستی زەید، نە لەدەستی ئەو (ﷺ)، بەڵکو فەرمانێك بو، کە ویستی خودا ویستبوی و، مەبەستی سەرەکی ڕاگەیاندنی حوکم و دەستورێکی نوێ بو لەسەر نەهێشتنی کلتوری بەکوڕکردن، کە لە کۆمەڵگەی ئەوسا باو بو، کۆمەڵە ئایەتی سورەتی (الأحزاب) ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن و بە تێرو تەسەلی ئەو کلتورەیان خستۆتەڕو .

هەرچی ئەو بەشەی ئایەتەکەی سورەتی (الأحزاب)ە، کە دەفەرموێت: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ﴾ . ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) شاردبویەوە، ئەوە بو، کە خوای پەروەردگار پێی ڕاگەیاندبو، کە ـ ڕۆژێ لە ڕۆژان ـ لە گەڵ زەینەبدا هاوسەرگیری دەکات، بەڵام ئەو ئەمەی نەدرکاندبو، لە ترسی ئەوەی خەڵك بڵێت لەگەڵ هاوسەری کوڕە لە خۆگرتووەکەیدا هاوسەرگیری کردووە، هەر لەبەر ئەوەشە پەروەردگار لە ئایەتەکەدا پێی دەفەرموێت، لە لۆمەی خەڵکی دەترسی، کەچی خودا شایەنترە، کە لێی بترسی.



خاتو زەینەبی کچی جەحش (خوا لێی ڕازی بێت)، دەرکی بەم ڕاستییە دەکرد و لافی ئەوەی بەسەر هاوسەرەکانی دیکەی پێغەمبەردا (ﷺ) لێدەداو، پێی دەگوتن: (خزم و کەستان ئێوەی لە محمد (ﷺ) مارە کردووە، بەڵام من .. خوای پەروەردگار لەسەروی حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە منی لێ مارەکردووە) بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

* * *

## گومانی جەنگانی (ﷺ) لە مانگە حەرامەکاندا

**گومان:**

دەڵێن محمد (ﷺ) لە مانگە حەرامەکاندا جەنگاوەو، دەڵێن ئەوە پێچەوانەی ئەو ئایەتەی سورەتی (البقرة)یە، کە دەفەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ﴾ البقرة: ٢١٧. واتە: پرسیارت لێ ئەکەن لە حوکمی جەنگ کردن لە مانگە حەرامەکاندا کە (ذو العقدة) و (ذو الحجه) و (محرم) و (رجب)ن. تۆ لە وەڵامدا پێیان بڵێ: جەنگکردن لە مانگە حەرامەکاندا تاوانێکی گەورەیە. بەڵام رێگەی دینی خودا گرتن لە خەڵك و ئینکاری خوداو نکوڵی رێزی (مسجد الحرام) و زیادەڕۆییکردنە سەری و دەرکردنی خەڵکەکەی، کە مسوڵمانەکانن، لای خودا ستەمێکی گەورەترە. خەڵك کردن لە دین مەنع کردن بە ئازاردان و دەرکردن و شێوەکانی تر لە کوشتنی نەفس گەورەترە . ئەم کافرانە واز ناهێنن و بەردەوام جەنگتان لەگەڵ ئەکەن بە هیوای ئەوەی، ئەگەر بتوانن، لە دینی ئیسلام هەڵتانبگەڕێننەوە.

**وەڵامدانەوەی گومانەکە:**

مسوڵمانان هەمویان ـ لەسەروی هەموشیانەوە پێغەمبەری خوا محمد (ﷺ) لەهەمو کەس زیاتر رێزی مانگە حەرامەکانی گرتووە و هەوڵی داوە تێیاندا



نەجەنگێت، بەو پێیەی شەڕكردن لەو مانگانەدا كارێكی گەورەیە، یاخود وەك بڵێی تاوانێكی گەورەیە، بەڵام مسوڵمانان دەبێ چی بكەن لە كاتێكدا، كە دوژمنانیان دەستدرێژی بكەنە سەر گیان و ماڵ و ناموسیان؟..

مسوڵمانان چی بكەن لە بەرانبەر كەسانێكدا، كە دەیانەوێت لە مەككەی پیرۆز وەدەریان نێن، لە كاتێكدا، ئەوان هاوولاتی ئەوێن و لە هەمو كەس لە مەككە لە پێشترن؟..

ڕێسای (بەرگری شارستانی)، كە قورئانی پیرۆز دایناوە، بۆ پاراستنی گەردون لە خراپەكاری ستەمكاران و پاراستنی شوێنەكانی خواپەرستی مسوڵمانانِ و گاورو جولەكەكان بووە، دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَـٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾ الحج: ٤٠. واتە: ئەوانەی بە ناحەق لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دەركراون تەنها لەبەر ئەوەی ئەڵێن پەروەردگاری تاك و تەنیای ئێمە زاتی خوایە. ئەگەر خوا هەندێ كەسی بە هەندێ كەسی تر لەناو نەبردایە، چەندین پەرستگاری ڕەبەنەكان و چەندین كڵێسەی گاوران و چەند كەنشتی جوولەكە و چەند مزگەوتی مسولمانان كاول ئەبوون كە هەموو ناوی خوایان تێدا ئەهێنرێ. بە ڕاستی خوا یارمەتی هەر كەسێ ئەدا كە ئەویش یارمەتی ئاینیی خوا بدات. خوا بەهێزە، ئەتوانێ یارمەتیی ئەو كەسانە بدات و هیچ شتێ ڕێی لێ ناگرێ.

ئەو ڕێسا قورئانییەیە، كە خەڵك و زەوی لە خراپەكاری ستەمكار و خراپەكاران دەپارێزێت، جا لەبەر ئەوەی مافی بەندەكانی خودا لە زەوی خودا و پاراستنی خەڵكی بێهێز لە ستەمكاری خراپەكاری، لەلای پەروەردگار ڕێزی لە مانگە حەرامەكان كەمتر نییە، بۆیە لەو مانگانەشدا شەڕ دروستە بۆ ئەوانەی ستەمیان لێكراوەو ڕێگری



مەراسیمی ئایینییان لێکراو بەشەڕو ستەم بە ناحەقی لە ولاتەکەیان وەدەرنران.

ئەو ئایەتەی خوارەوەش ئەوە دەسەلمێنێت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُوا۟ ﴾ البقرة: ٢١٧. واتە: پرسیارت لێ ئەکەن لە حوکمی جەنگ کردن لە مانگە حەڕامەکاندا کە (ذو العقدة) و (ذو الحجه) و (محرم) و (رجب)ن. تۆ لە وەلامدا پێیان بلێ: جەنگکردن لە مانگە حەڕامەکاندا تاوانێکی گەورەیە. بەلام ڕێگەی دینی خودا گرتن لە خەڵك و ئینکاری خوداو نکوڵی ڕێزی (مسجد الحرام) و زیادەڕۆییکردنە سەری و دەرکردنی خەڵکەکەی، کە مسوڵمانەکانن، لای خودا ستەمێکی گەورەترە. خەڵك کردن لە دین مەنع کردن بە ئازاردان و دەرکردن و شێوەکانی تر لە کوشتنی نەفس گەورەترە . ئەم کافرانە واز ناهێنن و بەردەوام جەنگتان لەگەڵ ئەکەن بە هیوای ئەوەی، ئەگەر بتوانن، لە دینی ئیسلام هەڵتانبگەڕێننەوە.

* * *

## گومانی حەرامکردنی ئەوەی خوا حەڵاڵی کردووە..

### گومان:

دەڵێن محمد(ﷺ)هەندێك شتی حەرام کردووە کە خودا حەلاڵی کردون، بەڵگەشیان ئەو ئایەتەی سورەتی(التحریم)ە کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ التحریم: ١.واتە: ئەی پێغەمبەر! بۆ ئەو شتەی خودا بە تۆی ڕەوادیوە–بۆ دڵداری ژنەکانت– لە خۆتی ناڕەوا دەکەی؟ خودا دەبورێ و دلوڤانە.

### وەلامدانەوەی گومانەکە:

ئەو ئایەتەو ئایەتەکانی دواتری، باسی ڕوداوێك دەکەن کە لە ماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕویداوە، کاتێك هاوسەرەکانی گلەیی و گازاندەیان لێکرد، بەهۆی پەرۆشییان و نارەزاییان بەوەی کە لە ماڵی یەکێك لە هاوسەرەکانی خواردنێکی خواردبو کە لە ماڵی ئەواندا نەبو، ئەو بە نهێنی لەلای یەکێك لە هاوسەرەکانی باسی کردبو و ئەویش لەلای ئەوانی تر باسی کردبو، بۆیە ئەوانیش گلەییان لێکرد و ئەویش لەبەرخاتری ڕازیبونیان ئەو خواردنەی لەخۆی حەرام کرد، بەڵێ ڕوداوەکە ڕاستە، بەلاّم تۆمەتبارکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بەوەی کە ئەوەی خودا حەلاّڵی کردووە ئەو حەرامی کردووە ئەوا لێکدانەوەیەکی نا دروستە بۆ واتای ئایەتەکە، چونکە سەرەتای ئایەتەکە دەفەرموێت ئەی پێغەمبەر بۆچی...ئەو ئایەتە لەبەر ئەو کارەی کە لە پێناو ڕازیکردنی هاوسەرەکانی کردی هاتووەو ئەو بانگکردنەی قورئان و ڕوکردنە پێغەمبەر(ﷺ) تۆمەتبارکردنی نییە بەوەی کە حەلاّڵێکی خوای حەرامکردووە بەڵکو تەنیا گلەییەکی



پەروەردگارە لە پێغەمبەرەکەی، چونکە گومان لەوەدا نییە کە مەحاڵە پێغەمبەر شتێك یان بابەتێك یان کردارێك حەرام بکات کە خوا حەڵاڵی کردووە، ئەو کردارەیش گرتنی جڵەوی نەفسی خۆی بو لە پێناو ڕازیکردنی هاوسەرەکانی، ئەوەش بەڵگەی تەواوی ڕەوشت و ڕەحم و بەزەییەتی.

پەروەردگار خۆی شایەتی گەیاندنی تەواوی پەیامەکەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ)داوە، فەرمویەتی: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ * لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ * ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ * فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾ الحاقة: ٤٤ – ٤٧. واتە: ئەگەر ئەم پێغەمبەرە هەندێ قسەی بە دەمی ئێمەوە هەڵبەستایە، ئەوا قوڵی ڕاستیمان دەگرت ئەنجا ڕەگی دڵیشمان دەبڕی بە لێدانی گەردنی، هیچ کامێکیش لە ئێوە ڕێی ئەو کارەمان لێ ناگرێت.

لەبەرئەوە تۆمەتبارکردنی پێغەمبەر(ﷺ)بەوەی حەڵاڵی خوای حەرام کردووە مەحاڵەو لە پێگەی پێغەمبەرایەتی ناوەشێتەوە کە خوا خۆی پاك و بێگەردی پاراستووەو خۆی هەمو ئەو گومانانەی لەسەر لاداون و فەرمویەتی: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ * عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ﴾ النجم: ٣ – ٥. واتە: لە ئارەزوی نەفسی خۆیشییەوە قسە ناکات، ئەوەی دەیخوێنێتەوە بەسەرتاندا جگە لەوەحی خودایی هیچی تر نییە، فریشتەیەکی فرە بەهێز کە جوبرەئیلە ئەو وەحییەی فێرکردووە، کە لە خواوە بۆی هێناوە.

بۆیە ئەو گومانەی کە دەڵێت پێغەمبەر حەڵاڵی خوای حەرامکردووە جگە لە بەهەڵە تێگەیشتن لە ئایەتەکە هیچی تر نییە و، تەنیا وەك بەڵێنێك بو بۆ هەندێ لە هاوسەرەکانی و وەك سوێند کەفارەتی خۆی هەیەو هیچ پێوەندی بە حەرامکردنی حەڵاڵی خواوە نییە.

## گومانی ئەوەی، کە پێغەمبەر (ﷺ) گوناهبارە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

### گومان:

دەڵێن ئەو (ﷺ) گوناهبارە، بەڵگەشیان بۆ قسەکەیان ئەو ئایەتەی سورەتی(الفتح)ە، کە دەفەرموێت: ﴿ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾ الفتح:٢ . واتە: بۆ ئەوەی، بەهۆی ئەو تێکۆشانەتەوە لە پێناو بلاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامدا، خوا لە گوناهی لەمەوپێش و لەمەوپاشت خۆش بێ. مەبەست لە گوناهی پێغەمبەران هەر کردەوەیەکە، بەش بەحاڵی ئەوان، بۆ ئەوە بشێ سەرزەنشتیان بکرێ لەسەری.

### وەلامدانەوەی گومانەکە:

ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کتێبێکی گەورەی کراوەیە، کە نوسەرانی ژیاننامەکەی هیچ نەماوە باسیان نەکردبێت، لە بێداری و خەوی، لە جەنگ و ئاشتی، لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکدا، تەنانەت ژیانی تایبەتی لە گەڵ خاو وخێزانیدا.

نەك تەنها هەر ئەوە، تەنانەت هاوەڵانی، کاتێك فەرمودەیەك لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە، یان باسی کردارێکی دەکەن، بەو پەڕی وردی و تێرو تەسەلییەوە هەمو شتێك وێنا دەکەن، یەکێکیان دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئاواو ئاوای فەرموو، پاڵ کەوتبو پاشان هەڵسایەوە و دانیشت، یاخود ئاوای فەرموو نیشانەی خۆشبەختی بەسەر ڕویەوە دیار بو، دەتوانین بە زمانی سەردەم بڵێین: بریتییە لە تۆمارکردنێکی وردی ژیانی (ﷺ) بەدەنگ و ڕەنگ.

پاشان دەبینین قورئانی پیرۆز هەمو ڕەوشتەکانی لە ڕستەیەکدا کۆکردۆتەوە، کە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم:٤ . واتە: بەڕاستی تۆ (ئەی محمد) خاوەنی ڕەوشتێکی جوان و گەورەی.

لەسەروی هەمو ئەمانەش: دەبینین قورئانی پیرۆز ئەوشتانەش ئاشکرا دەکات، کە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خۆیدا باسی دەکات، ئەوەی، کە خەڵك پێی نازانن و ئاگاداری نین، سەرەڕای ئەوە نابینین هیچ گوناهێکی گوفتاری یان کرداری کرد بێت، نە لەژیانامەی پیرۆزیدا، نە لەقورئانی پیرۆزدا، خۆ ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) گوناهبار بوایە و یاخی بووایە ئەوا هەرگیز خودای پەروەردگار بە نوری خۆی پشتی نەدەگرت و نیعمەتەکانی خۆی بەسەردا نەدەڕشتن.

هەرچی وشەی گوناهبار (مذنب)ی ئایاتە پیرۆزەکەیە ﴿ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴾ الفتح: ٢ واتە: بۆ ئەوەی، بەهۆی ئەو تێکۆشانەتەوە لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامدا، خوا لە گوناهی لەمەوپێش و لەمەوپاشت خۆش بێ.

مەبەست لە گوناهی پێغەمبەران ئەو جۆرەی هەڵەو تاوان نییە، کە لە نێو خەڵکیدا باو و زانراوە، چونکە سونەتی خودا لەوەدا بریتییە لە پاراستنی پێغەمبەرانی لە گوناه و تاوان، بەڵگەشمان بۆ ئەوە بریتییە لە:

یەکەمیان: خوای پەروەردگار لە گوناهی بەهۆی لەبیرچونەوە لە ئوممەتی ئیسلام خۆشبووە، هەروەکو لە فەرمودەیەکی پیرۆزدا هاتووە:

(إن الله تجاوز عن أمّتي الخطأ، والنسيان، وما استكرهوا عليه) ابن ماجة. واتە: خوای پەروەردگار هەڵەو لەبیرچونەوەو ئەوەی بەزۆرەملێ پێیان دەکرێ لەسەر ئوممەتی منی هەڵگرتووە و لێیان خۆشبووە.

لەکاتێکدا، کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەومافەی پێنەدراوە، هەروەك چۆن





ئاده‌میش (عليه السلام) پێی نه‌دراوه، خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت: ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا﴾ طه: ١١٥. واته: به‌راستی له‌مه‌وپێش ئامۆژگاری ئاده‌مان کرد توخنی دره‌ختی گه‌نم نه‌که‌وێ، که‌چی ئامۆژگاریه‌که‌مانی له‌بیر چوو ئه‌ومان به‌خاوه‌ن عه‌زم و توانا نه‌دی ئه‌و ئامۆژگاریه‌مانی پێ رابگیرێ. به‌لاّم له‌ ئایه‌تێکی تردا ده‌فه‌رموێت یاخیبو (عصی): ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾ طه: ١٢١. واته: ئاده‌م له‌ فه‌رمانی خوای خۆی ده‌رچو و گومڕابوو.

که‌واته، له‌بیرچون بۆ پێغه‌مبه‌ران به‌تاوان داده‌ندرێ و، وه‌کو ئێمه‌ نین، ئیتر له‌و ڕووه‌وه‌ ده‌ڵێین لێخۆشبونی خودای په‌روه‌ردگار بۆ پێغه‌مبه‌ری خودا (ﷺ) له‌و ڕووه‌وه‌ بووه، ئه‌ویش مرۆڤێکه‌و به‌هه‌ڵه‌ داده‌چێت و له‌بیری ده‌چێته‌وه، به‌لاّم ئه‌مه‌ له‌کاری بانگه‌وازی خوداییدا نابێت و هه‌رگیز له‌و باره‌یه‌وه‌ هیچی بیرنه‌چۆته‌وه.

دووه‌میان: پێغه‌مبه‌ران ـ له‌کاتێکدا که‌ پارێزراوبون له‌ تاوان ـ به‌لاّم سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش داوای لێخۆشبونیان له‌ په‌روه‌ردگاریان کردووه، ئه‌وه‌تا نوح پێغه‌مبه‌ر (عليه السلام) فه‌رمویه‌تی: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ هود: ٤٧. واته: نووح وتی: خودایا په‌نا ئه‌گرم به‌ تۆ له‌وه‌ی داوای شتێ وه‌هات لێ بکه‌م، که‌ نایزانم و له‌ نهێنیه‌که‌ی تێ نه‌گه‌یشتووم، ئه‌گه‌ر تۆ گوناهم نه‌پۆشی و ره‌حم پێ نه‌که‌ی له‌ ده‌سته‌ی دۆڕاوان ئه‌بم.

هه‌رچی ئیبراهیمه‌ (عليه السلام) فه‌رموویه‌تی: ﴿وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾ الشعراء: ٨٢. واته: ئه‌و خودایه‌یشه، که‌هیوام وایه‌ له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا تاوانم ببه‌خشێ و لێم خۆش بێ.

ئه‌وه‌تا موساش (عليه السلام) ده‌فه‌رموێت: ﴿قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى



رَحْمَتِكَ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾ الأعراف: ١٥١. واته: جا مووسا وتی: خودایا! له گوناهی من و هاروونی برام ببوورەو چاوپۆشیمان لیّ بکەو، بمانخەرە ناو رەحمەت و بەزەیی خۆتەوە" تۆ له هەموو میهرەبانیّ میهرەبانتری.

هەرچی سولەیمانە (عليه السلام) فەرمویەتی : ﴿ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنْ بَعْدِيٓ إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ﴾ ص: ٣٥. واته: وتی: خوایه! لیّم ببوورەو فەرمانرەواییەکی وام پیّ ببەخشە پاش خۆم شایانی کەسی تر نەبیّ، هەر تۆ بەخشندەی.

سێیەمیان: لێخۆشبونی پەروەدگار لە پێغەمبەران و داواکردنی لێخۆشبون، نیشانەیەکە بۆ دەسەلاّتی پەروەدگار لە گەردوندا، چونکە هەلّبژاردنی ئەوان لە لایەن خوداوە نەبوەتە هۆی ئەوەی ئەوان لە ئاگاداربون و داواکردنی لێخۆشبون بووەستن، تا ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتێکدا خودا لە تاوانی پێشو و دوایی خۆشبووە، کەچی فەرموویەتی : (والله إنّي لأستغفر الله في اليوم وأتوب إليه سبعين مرّة) صحيح البخاري. واته: سوێند بەخوا رۆژانە حەفتا جار داوای لێخۆشبون لە پەروەردگارم دەکەم.

چوارەم: زاتی خوای پەروەدگار شایەنی ئەوەیە زێتر لەوەی پێویستی کردووە بپەرسترێت، ئەگەر تەنیا ئەوەی پێویستی کردووە ئەنجامی بدەین، ئەوا وەك ئەوەیە بەتەواوی سوپاسگوزاری ئەومان بە ئەنجام نەگەیاند بێت، ئەگەر ئێمە وابین ئەدی دەبیّ پێغەمبەری هەلبژێردراو (ﷺ) چۆن بێت، بەتایبەت لە کاتێکدا، کە خوای پەروەردگار بەسەر هەمو بوونەوەرانیدا هەلّیبژاردووە، ئیتر نابیّ ئەو زیاتر سوپاسگوزار بێت و زۆرتر داوای لێخۆشبون بکات؟!..

پێنجەم: هیچ کەسێك نیە پێویستی بە تەوبەکردن نەبێت هەمو مسولّمانان، تەنانەت پێغەمبەریش (ﷺ) پێویستی بە تەوبەکردن هەیە.



﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ النور: ٣١. واته: ئه‌ی خاوه‌ن باوه‌ڕه‌كان هه‌مووتان بگه‌ڕێنه‌وه بۆ لای خوداو تۆبه بكه‌ن و په‌شیمان ببنه‌وه له‌و گوناهانه‌ی كردووتانن، به‌ڵكو ئه‌مه خوایه ته‌وبه‌بكه‌ن و په‌شیمان ببنه‌وه له‌و گوناهانه‌ی كردووتانن به‌ڵكو ئه‌مه خوایه ڕزگارتان بێ له سزای ڕۆژی دوایی.

هه‌مو كه‌سێ، كه پێگه‌یه‌كی هه‌بێت، ده‌كرێ كه‌م و كورتییه‌كی هه‌بێت، ئه‌مه‌ش به ته‌وبه‌كردن پڕ ده‌كرێته‌وه، ئه‌گه‌ر بۆ كه‌سانی ئاسایی ئاوا بێت، ئه‌دی ده‌بێ بۆ پێگه‌ی پێغه‌مبه‌ر و نێردراوانی خودا چۆن بێت؟!..

شه‌شه‌م: پێغه‌مبه‌ری خودا (ﷺ) هه‌ندێ جار كاره له پێشتره‌كه‌ی ئه‌نجام نه‌داوه، بۆیه خودای په‌روه‌ردگار له شوێنێكی قورئانی پیرۆزدا پێی ده‌فه‌رموێت: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ التوبة: ٤٣. واته: خودا عه‌فوت كا! بۆچی ئیزنت دان له شوێنی خۆیاندا بمێننه‌وه!، به‌مه‌ش نه‌كردنی باشترو له پێشتر بۆ پێغه‌مبه‌ران وه‌كو گوناهێكی لێهاتووه.

حه‌وته‌م: خودای په‌روه‌دگار ده‌فه‌رموێت : ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ * وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا * فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًا﴾ النصر: ١ – ٣. واته: كاتێ كه یارمه‌تیی خوایی هات و مه‌ككه ڕزگاركراو، خه‌ڵكی جزیره‌ی عه‌ره‌بت دی پۆل پۆل دێنه ڕیزی ئایینی خواوه، سوبحانه‌ڵلاّ بكه بۆ خوای خۆت و له گه‌ردی هه‌موو ناته‌واییه‌كی به خاوێن رابگره‌و سه‌ناو ستایشی بكه‌و داوای لێخۆشبوونی لێ بكه. به‌ڕاستی ئه‌و تۆبه وه‌رگره له هه‌ركه‌سێ داوای لێخۆشبوونی لێ بكات.

هه‌مومان ده‌زانین، كه هاتنی سه‌ركه‌وتن و ڕزگاری له‌لای په‌روه‌ردگاره‌وه‌و، هاتنی پۆل پۆلی خه‌ڵك بۆ نێو دینی خودا تاوان نییه تا پێویستی به داوای لێخۆشبون بكات،



لەمەشدا بۆمان دەردەکەوێت، کە داوای لێخۆشبون هەندێ جار بە هۆی ئەنجام نەدانی باشترین دەبێت.

هەشتەم: مەبەستی ئایەتەکە ئاراستەکردنە بۆ کاری باش و خۆپاراستن لە کاری خراپ، لەمەشدا داوای لێخۆشبون بۆ لێخۆشبونەو، لێخۆشبونیش داپۆشینی کارێکی ناڕەوایە، جا هەر کەسێ لە تاوان پارێزرا، ئەوا ئارەزووە خراپەکانی فڕێ دەدرێن، ئیتر هەرگیز گوناهێك ئەنجام نادات...

نۆیەم: (چاکەی مرۆڤە پاکەکان، تاوانی مرۆڤە هەڵبژێرداوەکانی خودایە)، ئەوەیە بەندەی ئاسایی ـ کە تەنیا فەرزەکان ئەنجام دەدات ـ ئەوەندەی بەسە تا ببێتە بەندەیەکی پاك، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ مرۆڤە نزیك و هەڵبژێردراوەکانی خودا ـ کە فەرز و سونەتەکان ئەنجام دەدەن ـ ئەوا وەك ئەوەیە تاوانبار بێت.

نابێ ئەوەش لە یاد بکەین، کە ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش بونی بە پێغەمبەر، جێگای ڕێزو ستایشی گەلەکەی بو، بەوەی لە هەمو هاوتەمەنانی لەگەنجان پاکترو جیاواز تر بو، تاوای لێهاتبو لە نێویاندا بە ڕاستگۆی دەستپاك ناوی دەرکردبو.

## گومانی ئەوەی شەیتان قسەی خزاندوتە نێو سروش(الوحي)ەوە..

**گومان:**

دەڵێن شەیتان قسەی خزاندوتە نێو وەحییەوە و (محمد)یش درکی بەوە نەکردووەو دەریبڕیوە، بۆ ئەو گومانەشیان ڕیوایەتێکیان کردوتە بەڵگە کە لە هەندێ کتێبی تەفسیردا هاتووە، کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ)لە نوێژدا سورەتی (النجم)ی دەخوێند و کاتێ گەیشتە ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ * وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴾النجم: ١٩ – ٢٠.واتە: پێم بڵێن ئایا ئێوە لات و عوززاتان بینیوە؟مەناتە سێهەمەکەی تریشتان دیوە؟!

پاشان شەیتان قسەی خزاندیتە ناو وەحییەوەو پێغەمبەریش دەریبڕییێت و فەرمویێ: (تلك الغرانيق العلى، وإنّ شفاعتهنّ لترتجى).واتە: (ئا ئەو بتە بەرز و پیرۆزانە، کە تکای ئەوان پێویستە و جێگای خۆی دەگرێت).

پاشان وەك لە ڕیوایەتەکەدا هاتووە پێغەمبەر هەر بەردەوام بووە لە قورئان خوێندن پاشان کڕنوشی بردووە و هەرچی مسوڵمانی لەدوا بووە هەمویان کڕنوشیان بردووە، تەنانەت وەك ڕیوایەتەکە دەڵێت هەرچی بێباوەڕیشی لەدوا بووە هەمویان کڕنوشیان بردووە!..

**وەڵامدانەوەی گومانەکە:**

ئەو چیرۆکەی بە چیرۆکی(غەرانیق) ناودەبرێت، چیرۆکێکی بڵاوەو ئەوکەسەی بڵاوی کردوتەوە گوتویەتی (محمد) بەسەر خواکانی ئێمەیدا هەڵگوت و لە هەڵوێستی



پێشوی، کە تانەوتەشەری لێدەدان پەشیمان بوتەوە. هەروەها دەڵێن کە پێیان گوتووە: (تا ئەمڕۆ هەرگیز بەچاکە باسی خوداکانی ئێمەت نەکردبو!).

بەوشێوەیە ئەو چیرۆکە بڵاوبوتەوەو تا کار گەیشتوتە ئەوەی وەك باسمان کرد، کە هەندێ لە موفەسسیرانیش باسی بکەن، بەڵام دەبێ بزانین، کە ئەو ڕیوایەتە نەگەیشتوتە ئاستی (تەواتر)، بۆیە ئەو ڕیوایەتە تەنیا هەواڵی تاکەکەسییەو بەهیچ جۆرێك لەگەڵ بەڵگە عەقڵی و نەقڵییەکانی فەرمودەی موتەواتر یەکناگرێتەوە، بەمەش ئەو ڕیوایەتە باتڵەو هیچ بنچینەیەکی دروست نییە.

پێشەوا ڕازی دەڵێت: (ئەوە ڕای موفەسسیرانی ڕوکاری قورئانە، بەڵام ئەوانەی پسپۆری بواری فەرمودەن دەڵێن: (ئەو ڕیوایەتە هەڵبەستراوە)، ئەو ڕایەش ڕای کۆمەڵێك پێشەواو حافیزانی فەرمودەیە، لەوانە: (أبوبكر بن العربي)لە (أحكام القران)دا و، قاضي عياض لە (الشفا) و(فخرالدين الرازي)لە (مفاتح الغيب)٦/ ١٩٣ و (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا (١٢/ ٨٠) و(العيني)لە (عمدة القاري)٩/ ٤٧ و (الشوكاني) لە (فتح القدير)٣/ ٢٤٧ و(الآلوسي)لە (روح المعاني)١٧/ ١٦٠ و چەندانی تر لە پێشەوا زاناکان ڕەحمەتی خوا لە هەمویان بێت.

ڕایەکانی خۆیشیان بەبەڵگەی قورئانی و فەرمودە و بەڵگەی عەقڵی سەلماندووە:

**-هەرچی بەڵگەی قورئانییە، لەچەند ڕویەکەوەیە، لەوانە:**

خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ * لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ * ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ﴾ الحاقة: ٤٤ – ٤٦. واتە: ئەگەر ئەم پێغەمبەرە هەندێ قسەی بە دەمی ئێمەوە هەڵبەستایە، ئەوا قوڵی ڕاستیمان دەگرت ئینجا ڕەگی دڵیشمان دەبڕی بە لێدانی گەردنی، هیچ کامێکیش لە ئێوە ڕێی ئەو کارەمان لێ ناگرێت.



هەروەها فەرمویەتی: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾ یونس: ١٥.واتە: کاتێ کە ئایەتە واتا ئاشکراکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێندرێنەوە، ئەوانەی باوەڕیان بە زیندوبونەوەو گەیشتن بە ئێمە نییە دەڵێن: قورئانێکی تری غەیری ئەو قورئانەمان بۆبێنە، کە بە دڵی ئێمە بێت، یان ئایەتەکانی بگۆڕە بە ئایەتی تر. تۆیش ئەی پێغەمبەر بڵێ: بۆ من ڕەوا نییە لەخۆمەوە بیگۆڕم" من دوای ئەوە دەکەوم کە بە وەحی بۆم دێت، بەڕاستی ئەگەر من بەگوێی خوای خۆم نەکەم و بیگۆڕم لە سزای ڕۆژێکی سامناکی گەورە ئەترسم.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ * عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴾ النجم: ٣ - ٥.واتە: لە ئارەزوی نەفسی خۆیشییەوە قسە ناکات، ئەوەی دەیخوێنێتەوە بەسەرتاندا جگە لەوەحی خودایی هیچی تر نییە، فریشتەیەکی فرە بەهێز کە جوبرەئیلە ئەو وەحییەی فێرکردووە کە لە خواوە بۆی هێناوە.

هەرچی بەڵگەی فەرمودەیە: پێشەوا ئەبوبەکر ئەحمەدی کوری حوسەینی بەیهەقی فەرمویەتی: (ئەو چیرۆکە لەڕوی نەقڵەوە سەلامەت و سەلمێنراو نییە)، واتە: دروست نییە.

پاشان دەڵێت: ڕاویانی ئەم فەرمودەیە تانەیان لێدراوە و ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی کە: پێغەمبەری خوا(ﷺ)لە نوێژدا سورەتی (النجم)ی خوێندووەو مسوڵمانان و بتپەرستان و مرۆڤ و جنۆکە هەمویان کڕنوشیان بردووەو چیرۆکی (غەرانیق)ی تێدا نەبووە و، ئەو فەرمودەیەش لە سەحیحی بوخاریدا بەزۆر



ڕێگاو شێواز هاتووەو لە هیچیاندا چیرۆکی (غەرانیق)ی تێدا نییە.

## -هەرچی ڕێگای ئەقلییە، لەچەند ڕویکەوەیە:

یەکەمیان:

مەحاڵە پێغەمبەر(ﷺ) بتەکان بە گەورە وەسف بکات، لەکاتێکدا هەمو هەوڵی بۆ نەهێشتنی بتپەرستی و بەگەورە سەیرکردنیان بووە.

دووەم:

پێغەمبەر(ﷺ)لەسەرەتادا لە ترسی بتپەرستان نەیدەتوانی لەلای کەعبە نوێژ بکات و قورئان بخوێنێت، بەڵکو تەنیا شەوان و لەکاتی چۆڵیدا دەچووە ئەوێ.

سێیەم:

خوای مەزن فەرمویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾ الحج: ٥٢.واتە: ئێمە بەر لە تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە ئیللا وابووە، کە ئارەزوی شتێکی کردبێت کە بە دڵیدا هاتبێت شەیتان بە وەسوەسە هەندێ شتی نامۆناسیی خستوتە دڵیەوە، جا خودا ئەو شتانەی لە دڵدا شۆردووە پاشان خوا ئایاتەکانی خۆی لە دڵی ئەو پێغەمبەرەدا چەسپاندووە، خوا زانا و خاوەن حیکمەتە.

ئەمەش لەبەرئەوەی چەسپاندنی ئایەتەکان بەلادانی ئەوەی شەیتان دەیخاتە ناو دڵی پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەپێشترە لەوەی کە خودا ئەوەی شەیتان خستویەتییە نێو وەحییەوە بیگۆڕێت، بۆیە ئەگەر خوا بیەوێت ئایەتەکانی بچەسپێنێت تا ئەوەی قورئان نییە بە قورئان دانەنرێت، ئەوا هەر لەسەرەتاوە ڕێگرتن لەوەی شەیتان ئەو کارە بکات زۆر لەپێشترە.



چوارەم:

ئەگەر ئەو چیرۆكە ڕاست بێت ئەوا بەزیادكردن لە وەحی خودایی دادەنرێ، ئەمەش پێچەوانەی بەڵگە عەقڵی و نەقڵییەكانە، چونكە لەڕووی عەقڵییەوە: هیچ جیاوازییەك لەنێوان كەمكردن لە وەحی و زیادكردن لە وەحی نییە[1].

* * *

(١) سەرچاوە: (حقائق الإسلام في مواجهة شبهات المشككين).أ.د.محمود حمدي زقزوق .

## ئیسلام لە دیدی ئەواندا..

﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ المائدة: ٣

❊ ❊ ❊

(ئیسلام ئەو ئایینەیە، کە زو یان درەنگ، ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر دەبێ هەمومان دانی پێدا بنێین)

گوتە لە کتێبی (گوتەو جیهانی عەرەبی ٢٢٦)

# ئیسلام لە دیدی ئەواندا..

*ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد، قەشەبوو، چەندین بڕوانامەی بەرزی لەزانستی ئاییندا لەبەشی ئایینناسی میسری پێبەخشراوەو، پێشتر مامۆستابو لەزانکۆی ئایینناسی ئەسیوت، دواتر بووە مسوڵمان، لەکتێبی (محمد في التوراة) دەڵێت: (پێویستە مرۆڤی مسوڵمان شانازی بەئایینەکەیەوە بکات، چونکە ئایینەکەی وەکو خۆر وایە، کەلەسەرمسوڵمان ونامسوڵماندا هەڵدێت، پێویستە مرۆڤی مسوڵمان شانازی بەئایینەکەیەوە بکات، چونکە ئایینەکەی وەکو هەوای پاك وایە، کەهیچ کەس ناتوانێ بەبێ بونی بژی و ژیان بەرێ بکات ) ل٣٢.

پاشان دەڵێت: (...ئیسلام ئایینی عەقڵ و مەنتیقە، هیچ پەردەو ئامرازێکی لەنێوان خوداو مرۆڤ نەهێشتوتەوەو، چارەنوسی خەڵکی نەخستوتە ژێر سۆزو بەزەیی تاکەمرۆڤێك، کەبڕیارەکانی کڵێسایان بەسەردا بسەپێنێت) ل١٧٣.

*ڕۆم لاندۆ R. Landau پەیکەرساز و ڕەخنەگری هونەری ئینگلیزی و مامۆستای زانستە ئیسلامییەکان لە سان فرانسیسکۆ، لە کتێبەکەی"الاسلام والعرب"دا دەڵێت: (کاتێك محمد(صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد..بیروباوەڕی یەکتاپەرستی نوێ، لەڕێگادابو، کە شۆڕشێك لەڕوی ڕوحی وماددی ڕزگاری بەرپابکات، کەهیچ ڕزگارکردنێکی مێژوی مرۆڤایەتی ناتوانێت لەبەرزیدا پێی بگات) ل٣٥.

*د.گۆستاف لۆبۆن، کە بەڕەچەڵەك نەمساویە وسەرۆکی بەشی دیراساتی



ڕۆژهەڵاتە لە زانکۆی کالیفۆڕنیا، لەکتێبی (الوحدة والتنوع فی الحضارة الاسلامیة) دا دەڵێت: (...ئەو گۆڕانکارییەی ئیسلام توانی لە کلتوری بەمیراتگیراوی پێشینانی عەرەبی ئەنجامی بدات، دەتوانین لەچوار گۆڕانکاری سەرەکیدا کۆیان بکەینەوە :

١_فراوانکردنی هەست و نەستی مرۆڤایەتی و پاککردنەوەی .

٢_فراوانکردنی بازنەی هزری و ئەو ئامرازانەی یارمەتی مرۆڤ دەدەن تا بەسەر ئەو بازنەهزرییەدا بالأدەست بێت.

٣_هێنانەکایەی سیستەمێکی سیاسی، کە هاوشێوەی نەبو و لەڕوی ڕەوشتی لەلوتکەدابو و لە هەمان کاتدا کاراو چالاکیش بو.

٤_وێناکردنی شێوازێکی نوێ بۆ ژیان. ) لا٣٧.

*جاك ریسلەر توێژەرێکی هاوچەرخی فەڕەنسییە، لەکتێبی ( الحضارة العربية) دا دەڵێت: ( ئیسلام لەماوەی پێنج سەدساڵدا لە (٧٠٠-١٢٠٠ز) دا توانی بەهۆی. هێزوزانست وسەرکەوتویی وگەورەیی ژیارو شارستانییەتەکەی دەست بەسەر جیهاندا بگرێت) لا٨٢.

پاشان دەربارەی گەورەیی وسەرکەوتنی شارستانییەتی ئیسلامی بەسەر شارستانییەتی ئەوروپادا دەڵێت: (کاتێ شارستانییەتی ئیسلامی گەورە هەندێ لەپیاوانی ئاینی و عەلمانییەکانی ئەوروپای مەسیحی توشی شۆك کرد، ئیتر کێبڕکێیان دەکرد بۆ هاتن بۆلای ئەوشارستانییەتەی قورتبەو توڵەیتڵەو ئیشبیلیەی پێ بەناوبانگ بو، تا ئامادەی وانەکانی زانکۆو فێرگە ئیسلامییەکانی ئەوێ بن) لا١٥٤.

* جۆرج سارتۆنGeorge Sarton: ڕۆژهەڵاتناسێکی بەلجیکییە، کە دکتۆرای لە زانستە سروشتییەکان و بیرکاریدا هەیە، لە کتێبەکەیدا"الثقافة الغربية في رعاية



الشرق الاوسط"دەڵێت: (تاکە بەرهەمێك، لە بەسود و کەڵکترین بەرهەمە پڕ ئامانجەکانی مرۆڤایەتییە، ئەویش دەرکەوتنی ئیسلامە) ل٢٨.

پاشان دەربارەی حیکمەتی قەدەغەکردنی مەی خواردنەوە دەڵێت: (ئیسلام هەر لە سەرەتای بانگەوازەکەیدا مەی قەدەغەکرد، تا ئەوەتا ئێمە، دوای ئەوەی ڕێژەی خواردنەوەی مەی و مادده کحولییەکان زیادی کردووە، تا ئێستا خەریکە حیکمەت و دووربینی ئیسلاممان بۆ دەردەکەوێت) ل١٤٠.

* ج.ك.بێرگ: مامۆستای زانکۆ لە زانکۆی لیدن، لە کتێبی (وجهة الاسلام) دا دەڵێت: (پێویست ناکات لە خستنەڕوی خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ئیسلام زیادەڕەوی بکەین.. ئیسلام، ئایینی دیموکراسییە، کە هەموکاتێك هێز و وزەی لە خۆشەویستی پڕ لە خوێن گەرمی جەماوەر وەرگرتووە.. ئیسلام دەزانێت چۆن لە دڵی خەڵکدا شوێنی خۆی دەکاتەوە و، تاکەکانیشی شانازی پێوە دەکەن..).(بە سەرپەرشتی هاملتۆن جوب) ل١٦٠.

پاشان دەڵێت: (..ئەو هەست و نەستەی بەرگی ئایین بەبەر هەمو شتێکدا دەکات و، ئەوەی ئیسلام هەر لە سەرەتاوە پێوە ناسرا، وای کرد ببێتە ئایینێکی چەسپاو لەنێو ئیمپراتۆرییەتەکاندا و ڕەگەزپەرستی تێدا لەناو بردن و خۆی(ئیسلام) بووە گەورەترین هێز، کە هەموانی لەسەر یەك خوان کۆکردنەوە..)ل١٩٩.

پاشان دەڵێت: (..ئیسلام توانی گەورەییەکی وا دەستەبەربکات، کە هەرگیز هیچ کەس ناتوانێت نکوڵی لێبکات، بەوەی کاری لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی لەیەك تێگەیشتنی گەلان کرد، ئەمەش گەورەییەکە، هیچ کەس نکوڵی لێناکات، تەنانەت ئەو کەسەش، کە مسوڵمان نییەو لەسەر ئایینێکی تریشەو ڕێبازێکی تریش لە ژیانیدا پەیرەو دەکات)ل٢٠٠.

* (( ویل دیورانت)) Will Durant فەیلەسوف و مێژونوس و نوسەری



ئەمریکی، لە کتێبی(قصة الحضارة)دا دەڵێت: (بنچینە ڕەوشتییەکانی مسوڵمانان و شەریعەت و حکومەتەکەیان، هەمویان لەسەر بنچینەی باوەڕ دامەزرابون، ئیسلامیش سادەترین و ڕۆشنترین ئایینە و بناغەکەی بریتییە لە شایەتمانی(لا اله الا الله، محمد رسول الله).

*جیفری لانگ: پرۆفیسۆرێکی بواری بیرکاری ئەمریکییە، لە کتێبی (حتی الملائكة تسأل) دا دەڵێت : (پێش ئیسلام خۆشەویستی لەلای من مانایەکی نەبو، بەڵام کاتێك قورئانم خوێندەوە، هەستم کرد سۆزوبەزەییەکی بێسنور دڵی داگرتم، ئیتر ئەو کاتە هەستم بەوەکرد، کەخەریکە خۆشەویستی دڵم دادەگرێت، ئەوەی منی پێشڕەوی کرد بۆ ئیسلام خۆشەویستی بێ سنوری خودا بو، کە ناتوانی لە بەرانبەریدا بەرگەبگری) لا ٢١١ .

پاشان دەڵێت : (ئیسلام بریتیە لە تەسلیم بون بۆ ویستی خودا، ئەمەش بەرزبونەوەیەکی بێسنورە بۆپلەیەکی بێئەندازەی ئاشتی و ئارامی .. بەڕاستی هەر (ئیسلام) ە بزوێنەری هەمو مرۆڤایەتی و، پێوەندی بونێکی ئارەزومەندانەی لاشە و عەقڵ و دڵ و گیانە ) لا ٧٥.

*لویس یونگ : توێژەرێکی هاوچەرخی ئینگلیزییە، لە کتێبی ( العرب و أوروبا) دا دەڵێت: (سەرەڕای مێژوی ئەورروپی پڕ لە دەمارگیری و توندڕەوی هزری و دور لە لێبوردەیی ئایینی پێچەوانەی مسوڵمانان، بەڵام تائێستاش ئەورروپا ڕەتیدەکاتەوە ددان بەوەدا بنێت، کە عەرەبەکان دەستێکی باڵایان بەسەر شارستانییەتەکەدا هەیەو، ڕۆڵی شارستانییانەی ئەوان پشتگوێ دەخات و لەبەهای کەمدەکاتەوە) لا ٩ .

پاشان دەربارەی پێویستی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام دەڵێت: (زۆر شت ماون، کە پێویستە ڕۆژئاوا لە شارستانییەتی ئیسلام وەری بگرێت، لەوانە دیدی پڕ لێبوردەیی و جیاوازی



نه‌کردن به‌هۆی ئایین و ڕه‌چه‌ڵه‌ك و ڕه‌نگه‌وه ) لا ١٠.

*گۆستاڤ لوبۆن: پزیشك ومێژونوسی فه‌ڕه‌نسی، له کتێبی (حضارة الغرب) دا ده‌ڵێت: (.. ئیسلام له زۆر بنچینه دا له مه‌سیحییه‌ت جیاوازه، به‌تایبه‌ت له یه‌کتاپه‌رستی ڕه‌هادا، که بنچینه‌ی سه‌ره‌کییه، به‌وه‌ی خودای تاقانه، که ئیسلام بانگه‌وازی بۆ ده‌کات به‌سه‌ر هه‌موشتێکدا بالاّ ده‌سته وفریشته‌و بونه‌وه‌ره پیرۆزه‌کان و هه‌مو ئه‌وانه‌ی پیرۆز ڕاگرتنیان پێویستکراوه ده‌وریان نه‌داوه ) لا ١٢٥.

پاشان ده‌رباره‌ی بیروباوه‌ڕی ئیسلامی ده‌ڵێت: (.. ئیسلام بۆی هه‌یه لافی ئه‌وه‌لێبدات، که یه‌که‌مین ئایینه یه‌کتاپه‌رستی به جیهان ناساندووه، ساده‌یی و نه‌رمونیانی ئیسلام له بیروباوه‌ڕه‌که‌یه‌وه سه‌رچاوه‌ده‌گرێت، نهێنی به‌هێزی ئیسلامیش له‌و نه‌رمونیانییه‌دایه..).لا١٢٥.

پاشان ده‌ڵێت:(..ئیسلام خۆی و بون به مسوڵمان ئاسانه، هیچ شتێکی ناڕۆشن و گوماناوی و هه‌ڤدژی تێدانین وه‌ك له ئایینه‌کانی تردا ده‌یبینین و، هیچ شتێك ئه‌وه‌نده‌ی بیروباوه‌ڕی ئیسلامی ڕوّشن و که‌م گومان نییه، که ته‌نیا یه‌ك خودا بڕیارده‌دات و یه‌کسانی له‌نێوان هه‌مو خه‌ڵکدا به‌رپاده‌کات..)لا١٢٥.

پاشان ده‌ڵێت: (..ئه‌گه‌ر هه‌ر تاکێکی مسوڵمان ببینی، له‌هه‌ر ئاستێکدابێت، ده‌یبینی زۆر چاك ده‌زانێ، که پێویسته باوه‌ڕی به چی هه‌بێت و پایه‌کانی ئیسلامت به چه‌ند وشه‌یه‌کی ساده بۆ ده‌خاته‌ڕو و به‌مه‌ش پێچه‌وانه‌ی تاکی مه‌سیحییه، که ناتوانێت باسی سێ خودایی و پایه‌کانی تری ناڕۆشنی مه‌سیحییه‌تت بۆ بکات، مه‌گه‌ر یه‌کێك بێت له زانایانی ئاینی مه‌سیحی)لا١٢٥.

پاشان باس له کاریگه‌ری ئیسلام ده‌کات و ده‌ڵێت: (ئیسلام له هه‌مو ئایینه‌کانی تر کاریگه‌ری له‌سه‌ر خه‌ڵك زیاتره.. سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش، چاك درکی به‌وه کردووه، که چۆن ده‌توانێت باوه‌ڕێکی پته‌و له ده‌رونه‌کاندا بچه‌سپێنێت، که گومانه‌کان نه‌توانن



بیلەرزێن)لا ١٢٥-١٢٦.

پاشان دەڵێت: (کاریگەری ئایینەکەی(محمد)لەسەر دەرون لە هەمو ئایینەکانی تر زیاترە، تائێستایش ئەو گەل و چین و توێژانەی قورئانیان کردوتە دەستوری خۆیان، کار بە حوکمەکانی دەکەن، هەروەك چۆن بەر لە سێزدە سەدە کاریان پێدەکردن)لا ٤١٧.

*ئیتین دینێت:ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسییە، لە کتێبی (أشعة خاصة بنور الاسلام)دا دەڵێت: (ئیسلام ململانێی ئەو سروشتە ناکات، کە نابەزێت، بەڵکو خۆی لەگەڵ ڕێساکانی دەگونجێنێت و لەگەڵی دەڕوات، بە پێچەوانەی کڵێسا، کە لە زۆر کاروباری ژیاندا لە گەڵیدا تێکدەگیرێت، بۆ نمونە ئەو مەبەستەی ڕەهبانییەت فەرز دەکات، کە هاوسەرگیری ناکەن و بەتەنیا و نامۆیانە دەژین)لا ٣١.

*ئەو شایەتییەی دینێت، لە شایەتی مامۆستای مێژوی ئیسلامی زانکۆی ڕۆما نزیکە کە ناوی (دیڤددی سانتێلانا)یە، کە گوتویەتی : (ئاستی بەرزی ڕەوشت، کە بەشێکی زۆری شەریعەتی ئیسلامی دەگرێتەوە، کاری کردوتە سەر دیدی هاوچەرخی ئێمەوە و بەرزی کردوتەوە، ئالێرەدا گەورەیی ئەو شەریعەتە نەمرە دەردەکەوێت، چونکە شەریعەتی ئیسلامی هەمو ئەو کۆت و بەند و شتە قەدەغەکراو و جۆراوجۆرانەی لادا، کە ئایینی جولەکە بەسەر شوێنکەوتووانیدا سەپاندبوی، هەروەها ئەو ڕهبانییەتەیشی پوچەڵکردەوە، کەئایینی مەسیحییەت دایهێنابوو، نیشانیدا، کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتی دەگونجێت و بەدەنگ هەمو پێویستییەکانی ژیانی مرۆڤەوە هات، ئەو خاسییەتانەبون، کە شەریعەتی ئیسلامیان ئاوا سروشتیانەو نەمرانە هێشتەوە .. دەتوانین لەبەرزترین شوێن دایبنێین و گەورە یاساناسان پێیدا هەڵبڵێین و لە واقیعدا جێبەجێی بکەن..) تراث الإسلام. (بەسەرپەرشتی سێرتۆماس ئارنۆڵد) .



*ولفرێد كانتوێل سمیس : ماموستای بابەتە ئیسلامییەكانی زانكۆی موتتریال لەكتێبی (الاسلام فی التاریخ الحدیث) دا دەڵێت: (.. هیچ ئایینێك نیە توانیبێتی وەكوئیسلام وا لەشوێنكەوتووانی بكات هەست بەو شانازیكردن و گەورەییە بكەن، وەك ئەوەی كە مسوڵمان بەبێ زۆر لێكردن و زۆر لەخۆكردن هەستی پێدەكات، لەوانەشە هەندێك كات هەست بە عەرەبێتی كردنی لەگەڵدا تێكەڵ بێت..

بەڵام شانازی كردن بەئایینەكەیان لەهەمو مسوڵمانێكدا ڕەنگی داوەتەوە بە چاو پۆشین لەجیاوازی گەل و نەتەوە و زمان، مسوڵمانێتی هۆكارێكی سوپاسگوزاری هەمو تاكێكی مسوڵمانەو هەمویان سوپاسگوزارن، كەمسوڵمانن ) عن العقاد: مایقال عن الاسلام لا٧٨.

پاشان دەڵێت: (.. ڕۆژئاوایی ناتوانێت تەواو لەئیسلام حاڵی ببێت، تەنیا ئەو كاتەی درك بەوە دەكات، كە ئیسلام هەمو ژیانی ڕوكار و ناوەڕۆكی تاكی مسوڵمانی گرتوتەوە، نەك چەند بیرۆكەوبیروباوەڕێك بن، كە بەهزری تاوتوێیان بكات، یاخود بەبێ تاوتوێ كردن وەریان بگێڕێت، لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا بیركردنەوە ئەگەر ژیان و شێوازی ژیان خۆشنەكات و، لەواقیعدا ڕەنگ نەداتەوە و ڕوكارو ناوەڕۆك نەگرێتەوە ئەوا هیچ بەهایەكی نیە) هەمان سەرچاوەی پێشو لا٧٩.

*ئیفیلین گۆبۆڵد : كچە خانەدانێكی ئینگلیزیە بوەتە مسوڵمان، لە كتێبی (البحث عن الله) دا دەڵێت: ( ئەگەر ئیسلام هیچی تێدانەبێت، تەنیا ئەو برایەتییەی، كە ناكۆكییەكانی لەناو لادان و هەمو مرۆڤایەتی كردە یەك ئاست، كە كەسیان گەورەیی بەسەر ئەوی تردانییە تەنیا بە تەقوا و كاری چاكە نەبێت، تەنیا ئەمە بەسە بۆتەوەی ددان بەوەدا بنێن، كە ئیسلام باشترین ئایینەو لە هەمویان لە خودا نزیكترە لە هەموشیان پلەو پایەی بەرزترە ) لا١٣٢.

پاشان دەڵێت: (.. ئیسلام ئایینێكی هەمیشە زیندووە، زیندووە لە دڵی

شوێنکەوتووانیداو، ئایینێکە هەرچەندکاتی بەسەرداتێپەڕێت چالاکترو زیندوتر و بەهێزترو دەسەڵاتی فراوانتردەبێت و بانگەوازەکەی بەربڵاوتر دەبێت، ئەگەر ئەمە نەبوایە نەیدەتوانی بژی و پارێزگاری لە هێزو کاریگەری و خۆشەویستی شوێنکەوتووانی بکات .. )ل لا۱۳.

پاشان دەڵێت (.. وەك زانراوە لەئیسلامدا کاهینایەتی نییەو هیچ نێوەندێك لەنێوان مسوڵمان و پەروەردگاریدا نییە) لا۱۳.

هەروەها دەربارەی ڕۆحانییەتی ئیسلام دەڵێت: (.. ڕۆحانییەتی ئیسلام زۆر بەهێزە، بەردەوام مسوڵمانان بولای یەکتر ڕادەکێشێت و دەیانکاتە هێزیکی مرۆڤایەتی، کە فەرمان بە چاکە دەکات و قەدەغەی خراپە دەکات، بەجۆرێك کەلە جیهانی ئێستادا وێنەی نییە)لا۱۳.

*لایتنەر: توێژەرێکی ئینگلیزییە، دکتۆرای لەشەریعەت و فەلسەفەو ئایینناسیدا هەیە، لە کتێبی (دین الاسلام) دا دەڵێت: ( دەبینین نەفامانی مەسیحی ئاینی ئیسلام بەوە تۆمەتباردەکەن، وەك بڵێی ئاینی ئیسلام کۆیلایەتی داهێنابێت، لە کاتێکدا (محمد) هەمیشە هانی ئازادکردنی کۆیلەکانی داوە، ئەمەش لە ڕاستیدا چاکترین ئامراز و هۆکاری نەهێشتنی ئەو دیاردەیە بو)لا۷.

دەربارەی حیکمەتی قەدەغەکردنی گۆشتی بەراز و مادده هۆشبەرەکانیش دەڵێت: (لە ڕاستیدا قەدەغەکردنی گۆشتی بەراز و خواردنەوەی هۆشبەرەکان و خواردنی ئەو گۆشتەی بە چاکی سەرنەبڕاوە و، لادانی هەمو شتێکی زیانبەخش و چەندین شتی تر لەوانەی ئیسلام قەدەغەی کردون، زۆر سود بەو کەسانە دەگەیەنێت، کە پەیڕەوی دەکەن، ئەگەرچی شوێنکەوتوشی نەبن)لا۸.

*عەبدوڵا کوێلیم: بیرمەندێکی ئینگلیزییە، بوەتە مسوڵمان، لە کتێبی (العقيدة و الشريعة في الاسلام)دا دەڵێت: (..لەنێوان ئاینەکاندا هیچیان لە ئیسلام لە



تێگەیشتن نزیکتر نین بۆ ئەو کەسانەی لێی تێدەگەن، هەروەك چۆن هیچ کام لە ئایینەکان لە ئیسلام جێگیرتر و نەرم و نیان تر نین.. بۆیە ئەو گونجانەی، کە هەمو هەوڵێکمان بۆ خستوتەگەڕ-وەك مەسیحییەکان-بۆ ئەوەی عەقڵ و بیروباوەڕ لەسەری ڕێکبکەون و، لەمێژە لە ئیسلامدا بونی هەیە، من کە ئێستا ئەو قسانە دەکەم لەسەر ئایینی مەسیحیم، بەلاّم ئاماژە بۆ ئەو شتە زیادانە دەکەم، کە خراونەتە نێو مەسیحییەتی ئینجیلەوە، کە لە ڕاستیدا وەکو ئیسلامی قورئانە)لەلایەن(لوازۆن)لە وتارەکەی، کە پێشتر ئاماژەمان پێداوە لا٦٢.

پاشان دەڵێت: (..حوکمەکانی شەریعەتی محمد، هەمو خەڵك دەگرێتەوە، لە گەورەترین پاشا تا بچوکترین کۆیلە، لە ڕاستیدا شەریعەتێکە بە ڕێکوپێکترین و زاناترین شێوازی شەرعی دارێژراوە، کە لە جیهاندا وێنەی نییە) لە (سکالآی هاستنگ)ی (لادمانبۆرگ) وەرگیراوە لا١٢٣.

*ئێدوارد گیبۆن:ئینگلیزە، توانی کورسییەکی ئەنجومەنی بەریتانی بەدەستبێنێت، لە کتێبی(اضمحلال الامبراطورية الرومانية وسقوطها)دا دەڵێت: (.. ئەوەی ئێمە توشی سەرسوڕمان دەکات خۆڕاگری ئیسلام و نەوەستانیەتی لە بڵاوبونەوە، ئەو سروشتە پاك و تەواوەی ئیسلام لە مەککەو مەدینەدا هەیبو، ئێستاش هەمان جۆش و خرۆش دەداتە مسوڵمانانی هیند و ئەفریقا و تورکیا و..) لە محمد عەبدوڵا عەنان وەرگیراوە، لە (مواقف حاسمة في تأريخ الاسلام).لا١١.

هەروەها دەڵێت: (.. زیرەکی پێغەمبەری عەرەبی و بە یارمەتی ئومەتەکەی و بە ڕوحی ئایینەکەیانەوە، هۆکاری بێهێزبونی دەوڵەتی ڕۆمانی ڕۆژهەڵات و ڕوخانی بون ..) لا١٢.

پاشان دەڵێت: (..بەڕاستی بەسەرسوڕمانەوە چاوەکانمان بە ئاراستەی گەورەترین شۆڕش ئاڕاستە دەکەین کە هەمو گەلانی زەمینی بە سروشتێکی نەمر بەهرەمەند





کردووە) لا ١٢١.

*فرانز رۆزێنسال، توێژینەوەکەی لەسەر پێوەندییە کلتورییەکانی ئایینی جولەکەو ئیسلام و ڕێبازەکانی زانایانی مسوڵمانی لە توێژینەوەیەکی زانستیدا خستوتەڕو و لە کتێبی(علم التأريخ عند المسلمين) دا دەڵێت: (کاتێك محمد هات ئایینی جولەکەو مەسیحی لە دورگەی عەرەبیدا بلاوبون، کە هەردو ئایینەکە ڕای هاوشێوەیان بۆ لێکدانەوەی مێژویی و ژیانی مروڤایەتی هەیە، بەلام ئایینی ئیسلام، کە محمد بە مژدە بۆ مروڤایەتی هێنا، بەوە جیادەکرێتەوە، کە ڕون و ئاشکرایەو توانای تەواوی بێ قورسایی لەسەر تێگەیشتن و ڕونکردنەوەی بنەماکانی ئەو بونە هەیە، هەروەها چەمکەکانی ئیسلام (لەڕوی بیروباوەڕەوە)زیندوتر و ڕونترن لە چەمکەکانی ئایینەکانی جولەکەو مەسیحییەت)لا ٣٩٦.

*بریشا بەنکمارت، یەکێکە لە شارەزایانی بواری پەروەردەو فێرکردنی میرنشینی تایلاند، کە لە خێزانێکی بوزی لەدایك بووە، لە کتێبی(رجالٌ ونساء أسلموا)دا دەڵێت: (ئیسلام ئایینی ئاشتی و یەکسانی و ئازادی و برایەتی و ڕێز و خۆشەویستییە، هەمو ئەوانەش زۆر بەڕۆشنی لە حوکم و بنچینەو ئاداب و ئاکارەکانی ڕەنگیان داوەتەوە)٣/١١٤.

پاشان دەڵێت: (هیچ ئایینێکم نەدیوە وەکو ئیسلام ڕێبازێکی تێروتەسەلی بۆ زەکات دانابێت..هەر کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی، کە بە تەواوی زەکات دەدەن هەژاری و نەداری و ڕاووڕوتی تێدا نییە..من وای دەبینم، کە ئەگەر هەمو جیهان بێنە سەر ئایینی ئیسلام ئەوا برسی و هەژار و نەدار لەسەر زەوی نامێنن..هەروەها کۆمەڵگەی مسوڵمان، کە حوکم و ئادابەکانی ئیسلام پەیڕەو دەکات کۆمەڵگەیەکی پاك و خۆشگوزەرانە و خاڵییە لە هەمو جۆرەکانی تاوان..)٣/١١٥.

*فاتیمە زیڤسکن، ئافرەتێکی چیکوسلوڤاکییە، پسپۆڕی بواری وێنەی ئەندازەییە،



بوەتە مسوڵمان، لە کتێبی(رجال ونساء أسلموا)دا دەڵێت: (..گرنگترین شت لە سیستەمی کۆمەڵایەتی ئیسلام، کە سەرنجی منی ڕاکێشا، بریتی بو لە:

١- یەکسانی هەمو ڕەگەزەکان .

٢-لێبوردەیی بێسنور .

٣-ئازادی تەواو لە هەموبوارە دنیایی و ڕۆحییەکان.

٤-دانانان بە ژیانی دنیا، بەبێ زیادەڕۆیی تێداکردن .

٥-هەوڵ و تێکۆشان بۆ داواکردنی زانست، کەلەسەرهەموپیاو و ئافرەتێکی مسوڵمان پێویستکراوە .

٦-دواهەمینیشیان بە پێوەندی ڕاستەوخۆی نێوان بەندەوپەروەردگارەکەی زۆر سەرسام بوم . ٢\٩٨-٩٩

پاشان دەڵێت : (.. بۆم دەرکەوت- لە کاتێکدا کەخەریکم کتێبی خوا(قورئان) – دەخوێنمەوە، کە تەنیا ئیسلام ئەو ڕێگایەیە، کە خوا هەر لە سەرەتای دروستکردنی بونەوەردا بۆی دیاریکردووە و هەر ئیسلامیش ئاینی ڕاستە)٢/٩٩.

*دیبۆرا پوتەر، ژنە ڕۆژنامەنوسێکی ئەمریکییە، بوەتە مسوڵمان، لە کتێبی(رجال ونساء أسلموا) دا دەڵێت: (..کاتێ قورئانی پیرۆزم تەواوکرد، لە دڵمدا وام هەست کرد، کە ئا ئەوەیە ئەو حەقەی وەڵامی تێروتەسەلی بۆ باسی دروستبونی بونەوەر پێیەو ڕوداوەکانمان بە شێوازێکی مەنتیقی بۆ دەخاتەڕو، لەکاتێکدا لە کتێبە ئاینییەکانی تردا ڕاکان دژیەکن و تێکدەگیرێن، هەرچی قورئانە بەشێوازێکی ناوازەو یەکلاییکەرەوە باسی لێوە دەکات، کە هیچ بوارێك بۆ گومان جێناهێڵێت و بەتەواوی باوەڕت بەوەدەبێت، کە ئەوە ڕاستییەکەیەو بەبێ هیچ گومانێك لەلای خوداوە هاتووە)٨/١٠٠.



پاشان دەپرسێت: (..محمد"ئەو پیاوە نەخوێندەوارەی لە ژینگەیەکی نەخوێندەواردا پێگەیشتبو، چۆن توانی پەی بە موعجیزەکانی گەردون ببات، کە لە قورئاندا هاتون و تائێستاش زانستی سەردەم هەوڵی لێکوڵینەوەو دۆزینەوەیان دەدات؟!.. پێویستە ددان بەوەدا بنێین، کە قورئان فەرمودەی خوای پەروەردگارە)٨/١٠٩.

پاشان دەڵێت: (ناوەڕۆکی خودایی قورئانی پیرۆز بەرپرسە لە ڕاستکردنەوەی مرۆڤ و ڕێنمونی کردنی و ئاشناکردنی بە بونەوەر، ئەو ئاشنایەتییەی بەسەر هەمو سەردەمێکدا جێبەجێدەبێت)٨/١١٣.

*دوگلاس ئارشەر، ماموستای زانستە دەرونییەکانە لە ئەمریکا، لە کتێبی (رجال ونساء أسلموا)دا دەڵێت: (دروشمەکانی ئیسلام دروشمی کردارین و نمونەی بالاَّ بۆ بنیاتنانی گەلان دەخەنەڕو، هەروەك چۆن ئیسلام هەستی هیواو ئومێد بە گومڕایان دەبەخشێت و وا لە تاکی مسوڵمان دەکات ئەرکەکانی خۆی بەرانبەر خودا و بەرانبەر مرۆڤەکان بزانێت)٥/٥٦.

*لۆسروب ستۆردارد، نوسەرێکی ئەمریکییە، کە بەدیدی فراوانی لەسەر بەرهەمەکانی جیهانی ئیسلامی هاوچەرخ بەناوبانگە، لە کتێبی(حاضر العالم الإسلامي)دا دەڵێت: (..بەردەوام ئیسلام ئایینی ڕێنمونی بووە بۆ خەڵکی و لە تاریکی هاوبەشی پەیداکردن بەرەو ڕوناکی یەکتاپەرستی بردوون، ئەوەتا مێژوش شایەتی حەق بۆ بانگخوازە ئیسلامیەکانی سەرەتای ئیسلام دەدات و کردارەکانی ئەوانمان بۆ دەخاتەڕو، کە هیچ کاتێك و هیچ کامێك لە مژدەدەرانی ئایینەکانی تر کاری وا گەورەیان ئەنجام نەداون)١/٣٠٠-٣٠١.

هەروەها گوتویەتی: (بەرەچاوکردنی ئەو بلاَّوبونەوە بەرچاوەی ئیسلام، دەبێ



ددان بەوەدا بنێین، کە هەر تاکێکی مسوڵمان هەر لە فیترەتدا بانگخواز و مژدەدەری ئایینەکەیەتی..ئەو کارانەی بانگخوازانی مسوڵمان لە ڕۆژئاوای ئەفریقیاو ناوەڕاستیدا، لە ماوەی سەدەی نۆزدە تا ئەمڕۆ یەکێکە لە سەرسوڕهێنەرە گەورەکان، زۆر لە ڕۆژئاواییەکان ددانیان بەوەدا ناوە، ئەوەتا ئینگلیزێك بەر لە بیست ساڵ لەو بارەیەوە گوتویەتی: (ئیسلام لە ناوەڕاستەکانی ئەفریقیادا دەتوانێت سەرکەوتنێکی گەورە بەدەستبێنێت، بەجۆرێك بتپەرستی نامێنێت وەك چۆن تاریکی لەگەڵ هاتنی بەرەبەیاندا ون دەبێت، هەروەها وا هەست دەکەم، کە بانگەوازی مەسیحی وەکو ئەفسانەی لێهاتووە).

-مژدەدەرێکی پرۆتستانتی فەرەنسی دەڵێت: (ئیسلام هەرلەسەرەتاوە تائەمڕۆش هەر پێش دەکەوێت و شتێکی وای لەبەردەمدا نەماوە و تائێستاش هەر بەکون وکەلەبەرەکانی زەویدا بڵاودەبێتەوە، تاتوانی بەسەر هەموبەربەستەکاندا زاڵ بێت و گەیشتە ناوەڕاستی ئەفریقیا، بەڵێ، بەڕاستی هیچ شتێك ڕێ لە ئیسلام ناگرێت و هەرگیز بە چاوی ڕق وکینە ناڕوانێت، هەر لەبەر ئەوەیشە، کە سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەستهێناوە، لەکاتێکدا، کە مەسیحییەکان خەونیان بە ڕزگارکردنی ئەفریقیاوە دەبینی مسوڵمانان هەمو پارچەکانی قارەکەیان ڕزگارکرد) ١/٣٠١-٣٠٢.

*تۆماس کارلیل، نوسەر و مێژونوس و فەیلەسوفێکی ئینگلیزیە، لە کتێبی (أبطال وعبادة الأبطال)دا دەڵێت: (..(لا إله إلا الله وحده لا شريك له)بیروباوەڕی ڕاستەقینەیەو جگە لەو هەمو شتێکی تر باتڵە).٧٣٥.

پاشان وەسفی ئیسلام دەکات و دەڵێت: ئیسلام واتە:

١-هەمو کاروبارێك بە خودا بسپێرین.

٢-ملکەچی فەرمانەکانی بین.

٣-لەژێر سایەیدا هەست بە ئارامی بکەین.



٤-پشتی پێببەستین.

٥-بەهێزی لەوەدایە، کە لە بەرانبەر دانایی خوادا خۆڕاگربین.

٦-لە دنیاو قیامەتدا بەبەشی خۆمان ڕازیبین، جا هەرچۆنێك بێت.

٧-هەرچییەکمان توش بێت-ئەگەر مردنی لەناکاویش بێت-بەڕویەکی خۆش و دەرونێکی ڕونی پڕ ڕەزامەندی وەری بگرین و بزانین، کە خێری تێدایەو هەر ئەوەمان بۆ چاکە.ل٥٣.

پاشان کارلیل شایەتییەکی زۆر جوانی شاعیری ئەڵمانی(گۆتە)دەخاتەڕو، کە گوتویەتی: (ئەگەر ئەوە(مەبەست لە ڕەوشتە بەرزەکانە)ئیسلام بێت، کەواتە هەمومان مسوڵمانین).

پاشان کارلیل وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: (بەڵێ، هەرکەسێك مرۆڤێکی گەورەو ڕەوشت بەرزبێت، ئەوا بەڕەوشت مسوڵمانە، ئەگەر بە ئایینیش مسوڵمان نەبێت)ل٥٣.

پاشان دەڵێت: (..بەڕاستی کاڵفامییە مرۆڤ مێشکی بچوکی خۆی بکاتە تەرازویەك بۆ جیهان و بارودۆخی، بەڵکو پێویستە باوەڕی وابێت، کە گەردون یاسایەکی دادگەری هەیە، ئەگەر ئەویش درکی پێنەکات. بنچینەی گەردون بریتییە لە چاکەو چاکسازیش گیانی بون و بونەوەرە..پێویستە مرۆڤ ئەوە بزانێت و بە تەقواو ئارامییەوە باوەڕی پێبکات)ل٥٤.

هەروەها دەربارەی یەکسانی لە ئیسلامدا دەڵێت: (لە ئیسلامدا خاسیەتێك هەیە، کە لە جوانترین و بەرزترین خاسیەتەکانە، ئەویش: یەکسانییە لەنێوان خەڵکدا.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ ڕاستگۆترین دید و ڕاستترین ڕا، چونکە دەرونی مرۆڤی باوەڕدار لە هەمو وڵاتاندا هاوسەنگەو خەڵك لە ئیسلامدا یەکسانن و، ئیسلام تەنیا بەوە ناوەستێت، کە زەکات و سەدەقە وەکو سوننەتێکی خوازراو دابنێت، بەڵکو



دەیکاتە فەرز لەسەر هەمو مسوڵمانێك و یاسایەکە لە یاساکانی ئیسلام و بەپێی ئەندازەی سامانی کەسەکە دیاری دەکرێ..سوێند بەخوا ئەو کردارە زۆر جوانە، ئەوە جگە لە دەنگی هەمو مروڤایەتی هیچی تر نییە، دەنگی سۆز و بەزەیی و برایەتی و یەکسانی و..هتد)لا٦٥.

هەروەها دەربارەی بەرزی ڕۆحی ئیسلام دەڵێت: (ئەو ئایینە بۆ خاوەن بیر و دیدە ڕۆشنەکان جوانترین و بەرزترین مانای ڕۆحانییەتی تێدایە، بۆیە ڕێزی بگرن و مالی خۆی بدەنێ)لا٦٥.

پاشان کارلیل باسی ئەوە دەکات، کە چۆن ئیسلام عەرەبی لە زەمینی ئارەزوبازی نزم و تاریکەوە بەرەو ئاسمانی حەقی بەرز و ڕۆشن بەرز کردەوە، دەڵێت:

(خوا بە ئیسلام عەرەبی لە تاریکی بەرەو ڕوناکی برد و گەلی مردوی عەرەبی بە ئیسلام زیندوکردەوە.. عەرەب جگە لە گەلێکی گەڕیدە هیچی تر نەبو، کە هەر لە سەرەتاوە لە زەمینێکی وشك و بێخێردا دەژیا، کە نە دەنگێکی تێدا دەبیسترا نە جموجوڵێکی تێدا بەدیدەکرا، بەڵام خوای پەروەردگار لەنێو خۆیاندا پێغەمبەرێکی بۆناردن، ئیتر خاوی و مردویی بووە ناوبانگ و زیندویی و ناڕونی بووە ڕۆشنی و نزمی بووە بەرزی و بێهێزی بووە هێز و کڵپە بووە ئاگر و ڕوناکییەکەی هەمو جیهانی داگرت.. تیشکەکانی باکوری بە باشور گەیاند و ڕۆژهەڵاتی بە ڕۆژئاواوە بەستەوە..دوای تەنها یەك سەدەش گەلی عەرەب دەسەڵاتی هیند و ئەندەلوسیان کەوتە دەست و ئیتر دەوڵەتی ئیسلامی بۆماوەیەکی زۆر بەڕوناکی گەورەیی و خانەدانی و هێزەوە ڕوناك بووەوە..و تروسکەی حەق و هیدایەتیش نیوەی زەمینی داگرت و تائێستاش ئەو ئوممەتە هەر لە پلەبەرزەکانی گەورەییدایە..چونکە ڕێبازەکەی یەقین و بەرنامەکەی ئیمانە)لا٦٦-٦٧.

*ڕاهیب(مسیۆن) لە کتێبەکەی(رحلة دينية الى الشرق)دا دەڵێت: (بەڕاستی جێی



داخه، که گەلانی مەسیحی گیانی لێبوردەیی، که بەڵگەی چاکی و ئاشتی نێوان گەلان و ڕێزگرتنه له بیروباوەڕی کەسانی دی و نەسەپاندنی دەسەڵاته بەسەریاندا، بەڕاستی جێی داخه که ئەو ئاکاره جوانه له مسوڵمانان وەرناگرن )لا ١٦٢ .

* * *

# ئایا ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبوەتەوە؟

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴾ البقرة: ٢٥٦.واتە: زۆرکردن لە وەرگرتنی ئایندا نییە، چونکە ڕێگای چاك و خراپ ڕونکراونەتەوە.

***

*ویل دیورانت، فەیلەسوف و مێژونوس و نوسەرێکی ئەمریکیە، لە کتێبی (قصة الحضارة)دا دەڵێت: (پەیمانبەستووەکان-أهل الذمة-مەسیحی و زەردەشتی و جولەکەو سابیئە بون و لەسەردەمی خیلافەتی ئەمەویدا ئەوەندە بە ئاسودەیی و لێبوردەیی دەژیان، کە لە مەسیحییەتی ئەم ڕۆژگارەماندا هاوشێوەی نیە، چونکە ئازادانە دروشمەکانی ئاینەکەیان بەئەنجام دەگەیاند و کڵێسا و پەرستگاکانیشیان بە سەلامەتی مابونەوەو..حوکمی تایبەتی خۆیان هەبو سەرکردەو دادوەر و یاسای تایبەتی خۆیان هەبو و کاریان پێدەکردن)١٣/١٣٠-١٣١.

پاشان (دیورانت) باسی هۆکاری مسوڵمان بونی زۆر خەڵك دەکات و دەڵێت: (سەرەتای ئەو پلانە پڕ لێبوردەییەی، کە مسوڵمانانی پێشو پەیڕەویان دەکرد- یان بە حوکمی ئەو پلانەوە-زۆربەی مەسیحیەکان بونە مسوڵمان و زەردەشتی و بتپەرستەکانیش تەنیا کەمێکیان نەبن هەمویان بونە مسوڵمان و زۆرێك لە جولەکەکانیش ئایینی نوێیان هەڵبژارد)١٣/١٣٣.

هەروەها دەڵێت: (ئایینی ئیسلام دڵی سەدان گەلی-لە چین تا ئەندەلوس- داگیرکرد و دەستی بەسەر ڕەوشتیان داگرت و خەیاڵیانی داگیرکرد و ژیانی گۆڕین



و هیوایەکی وای پێبەخشین، کە ئاستەنگەکانی ژیانیان لەسەر هەڵگرێت و هێز و گەورەیی بەبەردا کردن)١٣/١٣٣.

*ئیدوین کالڤرلی، بڕوانامەی لەسەر زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە زانکۆی(برنستۆن) بەدەستهێناوە، لە کتێبی (الشرق الأدنى)دا دەڵێت: (مسوڵمانان لە هیچ جەنگێکدا مەسیحی و جولەکەکانیان ناچار نەکردووە ببنە مسوڵمان، ئیسلام بە مەرجی دانی سەرانە ئازادی تەواوی بەجێگەیاندنی دروشمەکانی ئایینی بۆ فەراهەم کردون، جگە لە ئاشتی و قەبوڵکردنی ئیسلام وەك پێشەوای شارستانییەت و سیاسەتی دەوڵەتی ئیسلامی هیچی تری لێ داوانەکردبون)کۆیلەر یونگ، ل١٦٣-١٦٤.

هەروەها دەڵێت: (لە قورئاندا ئایەتێکی پیرۆز هەیە، کە ڕاستگۆیی و دانایی لێدەچوڕێت، هەمو مسوڵمانان دەیزانن، پێویستە نامسوڵمانانیش بیزانن، ئەویش ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴾ البقرة: ٢٥٦.واتە: زۆرکردن لە وەرگرتنی ئاییندا نییە، چونکە ڕێگای چاك و خراپ ڕونکراونەتەوە.

*گۆستاڤ لۆبۆن، پزیشك و مێژونوسی فەرەنسی، لە کتێبی(حضارة العرب)دا، دەڵێت:( لە ڕاستیدا گەلان هیچ سوپاو ڕزگارکەری لێبوردە و بەبەزەیی وەك عەرەبەکانیان و نە ئاینێکی لێبوردەی وەك ئایینەکەیان نەناسیوە) ل١١٥.

هەروەها دەڵێت:( ڕونی ئیسلام و فەرمانکردنی بە دادگەری و چاکەکاری بە تەواوی هاریکاری ئەو ئایینەی کرد، کە بە جیهاندا بڵاو بێتەوە، بۆیە مسوڵمان بونی زۆر لە گەلانی مەسیحی بۆ ئەو هۆکارە دەگێڕینەوە، وەك میسریەکان، کە لە سەردەمی قەیسەرانی قوستەنتینیە مەسیحی بون، بەڵام کاتێك بنچینەکانی ئیسلامیان زانی مسوڵمان بون، هەر لەبەر ئەو هۆکارەش نابینین هیچ گەلێك دوای مسوڵمان بونی بوبێتەوە بە مەسیحی، جا ئەو گەلە بە دەسەڵات بوبێت یان بێدەسەڵات)ل



.١٢٥

پاشان(لۆبۆن) دەربارەی دادگەری ئیسلام دەڵێت:(..هەرگیز زەبر و زەنگ لە پشت بڵاوبونەوەی قورئاندا نەبوە، عەرەبەکان- مسوڵمانان- هەمو گەلانی لە ئاینی سەربەست و ئازاد کردووە، ئەگەر هەندێ لە گەلانی مەسیحیش دوای مسوڵمان بونیان زمانی عەرەبیان کردۆتە زمانی خۆیان، ئەوە بەهۆی سەرسامبونی ئەو گەلانە بوە بە دادگەری عەرەبە مسوڵمانەکان، کە لە پێشەواکانی خۆیاندا هاوشێوەیان نەدیبو..)لا١٢٧.

پاشان دەڵێت:( ئیسلام قورئانی بە زەبری شمشێر بڵاو نەکردۆتەوە، بەڵکو تەنها بە بانگەواز وای لە گەلان کردوە مسوڵمان بن و ئیسلام بە ڕێباز بزانن) لا١٢٨.

هەروەها دەڵێت:( ئەگەر(موسای کوڕی نەسیر) سەرکەوتو بوایە، ئەوا هەمو ئەوروپای دەکردە مسوڵمان و، یەکێتی ئاینی بۆ گەلە شارستانییەکان وەدیدەهێنا و ئەورووپای ڕزگار دەکرد) لا٢٦٧.

*فریدریك نیچە، فەیلەسوف و دەرونناسێکی ئەڵمانییە، لە کتێبی(عدو المسیح) دا دەڵێت: ( خاچپەرستان دژایەتی شتێکیان کرد، کە پێویست بو لە بەردەمیدا کڕنوش بەرن، لە بەردەم شارستانیەتێکدا، کە سەدەی نۆزدەی ئێمە بە بەراورد لەگەڵیدا زۆر هەژارو دواکەوتووە). لا ٦٠.

*جاك ریزلەر، توێژەرێکی هاوچەرخی فەڕەنسییە، لە کتێبی( الحضارة العربیة) دا دەڵێت: ( سەرکەوتنەکانی عەرەبە مسوڵمانەکان لە چەند هۆکارێکی جۆراوجۆری ئاینە نوێیەکەیاندا وەریان گرتبو)لا ٣٩.

*ڕۆجێر گارودی، بیرمەندێکی ناسراوی فەڕەنسییەو یەکێکە لە گەورە بەرپرسانی پێشوی حیزبی شیوعی فەڕەنسی، بوەتە مسوڵمان و لە کتێبی( حوار الحضارات) دا



دەڵێت:( ئەوەی ناوی( هێرش کردنە سەر ئیسپانیا)ی لێدەنێن، هێرشێکی سەربازی نەبو، ژمارەی دانیشتوانی ئیسپانیا ئەو کات دە ملیۆن کەس دەبو، بەڵام ژمارەی سەربازو سوارچاکانی مسوڵمان هەرگیز لە حەفتا هەزار تێنەپەڕیوە، بەڵام ژیارو شارستانیەکەیان هۆکاری سەرکەوتنیان بو) لا٩٧.

*هێر بێرت جۆرج ویلز، نوسەرو ئەدیبێکی بەریتانییە، لە کتێبی( تأريخ الإنسانية) دا دەڵێت:(ئیسلام بەوە بوە پێشەوا، کە باشترین سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسییە، کە ڕۆژگار بە خۆیەوە دیبێت، هۆکاری بڵاوبونەوەشی لەوەدا بو، کە لەهەمو شوێنێکدا گەلانی سیاسەت سست و ستەمدیدەو ترساو و نەزان و بێبەرنامە بونیان هەبو، هەروەها بونی حکومەتی خۆپەرستی بێبەرهەم، کە بە هیچ جۆرێك لەنێوان حکومەت و گەلدا پێوەندییەك بونی نەبو)..لا ٦٤٩.

*پاشان دەڵێت:( ..ئیسلام فراوانترین بیری سیاسی بو، کە خاسیەتی چالاکی کردەکی و پاکترین و نوێترین ڕێبازی لە جیهاندا تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان پیادە کردوەو، سیستەمێکی باشتر لە هەمو سیستەمەکانی بە مرۆڤ بەخشیوە) لا٦٤٩.

*ئی دریۆت، مێژونوسێکی فەڕەنسییە، لە کتێبی(المسألة الشرقية)دا دەڵێت:( لە سەردەمانێکدا، کە ئیتالیا لەناو شەڕو شۆڕدا بو، بە تایبەتی لەو سەردەمەی لەگەڵ بەربەرەکانی ناوچەی پیرۆزدا شەڕی دەکرد، فەنی عەرەبی لە هەردو لای دەریای ناوەڕاستدا گەورەترو بەرهەمدارتربو لە فەنی ڕۆمانی و، دەسەڵاتەکەشی چەند سەدەیەك خۆی گرت و بەرهەمەکانیشی لە بەرهەمی ڕۆمەکان گەورەترو کاریگەر تر بون، ناتوانین جگە لە ناوونیشانی کلتورێکی زۆر گەورەو بەرز هیچ ناوونیشانێکی تری بۆ دابنێین، شوێنەواریشیان تا کۆتایی سەدەی پازدە لە ئیسپانیادا هەرمابو)(عن محمد كرد علي:(الإسلام و الحضارة العربية) ١\٢٠١.



*ئیتین دینیه، ڕۆژهەڵاتناسێکی فەڕەنسییە، لە کتێبی(أشعة خاصة بنور الإسلام) دا دەڵێت:(قەشە(میسۆن) زۆر بابەتیانەو ڕاستەقینانە لە کتێبی (رحلة الدينية في الشرق) دەربارەی مسوڵمانان دەڵێت:( بەڕاستی جێی داخە مەسیحییەکان لە مسوڵمانان گیانی لێبوردەیی و ڕەفتاری جوان وەربگرن، لە کاتێکدا خۆیان وا هەستدەکەن، کە پیرۆزترین بنچینەی بەزەیی و چاکەکارین لە نێوان گەلاندا)لا١٩١.

*زیگرید هۆنگە، خانمە ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانییە، لە کتێبی(شمس العرب تسطع على الغرب) دا دەڵێت:( گرنگترین هۆکاری سەرکەوتنی عەرەبەکان ئەو لێبوردەییە بو، کە گەلانی توشی سەرسامی کرد، ئەوەی هەندێ کەس باسی دەکات لە دڕندەیی و دەمارگیری تەنیا ئەفسانەو خەیاڵەو هەزاران بەڵگە ئەوە بە درۆ دەخاتەوە و، لێبوردەیی و مرۆڤایەتی مسوڵمان لەگەڵ گەلانی ژێر دەستەو بێدەستەڵاتدا دەسەلمێنێت)لا٣٥٧.

پاشان دەڵێت:(مەسیحی و زەردەشتی و جولەکەکان بەر لە هاتنی ئیسلام بەخراپترین شێوە دوچاری دەمارگیری ئاینی دەبونەوە، بەڵام مسوڵمانان- بەبێ هیچ بەربەستێك-ڕێگەیان دەدان دروشمەکانی ئاینەکەیان بە جێبگەیەنن و مسوڵمانان پەرستگاو دێرو قەشەو کاهینەکانیان بۆ پاراستن و بە هیچ جۆرێك ئازاریان پێنەگەیاندن..)لا٣٦٤.

دکتۆرە(هۆنگە) دەپرسێت:( ئایا ئەوە لوتکەی لێبوردەیی نییە؟

مێژو کەی و لە کوێ ئەو کارانەی تۆمار کردون و بۆمانی گواستۆتەوە؟)لا٣٦٤.

پاشان جار دوای جار دەپرسێت و دەڵێت:( کڵێساکانی مەسیحییەکان لە سوریا، کە خەریك بو لەسەردەمی مەسیحیدا هەر بە یەکجاری بسڕێنەوەو تێکبدرێن، لە سەردەمی ئیسلامیدا گەیشتۆتە لوتکەی ڕێزو گەورەیی، ئایا ئەوە سەیر نییە؟!لا٣٦٨.



(.. ئایا سەیر نییە بپرسین: بۆچی بە ئارەزوی خۆمان لێکدانەوە بۆ شتەکان دەکەین؟ لە کاتێکدا عەرەبە مسوڵمانەکان بە ڕاستی بەشێکی ئەوروپایان ڕزگار کرد، کە(ئەندەلوس) بو، بەڵام مەسیحیەتیان لەناو نەبرد، کە دەڵێن( چارل مارتن) پاراستویەتی، هەروەها شارستانیەتی ڕۆژئاوایان لەناو نەبرد، کە لە ڕاستیدا شارستانیەتێك بونی نەبو!)لا ٥٤٠-٥٤١.

*ئیلیس لیختنستادتەر، خانمێکی ئەڵمانییە، زانستی عەرەبی و ئیسلامی لە زانکۆی فرانکفۆرد خوێندووە، لە کتێبی(الإسلام و العصر الحديث) دا دەڵێت:( وڵاتە ڕۆمی و فارسییەکان سەرپشك نەکرابون لەنێوان هەڵبژاردنی ئیسلام و شمشێر، بەڵکو لەنێوان ئیسلام و سەرانەدا سەرپشك کرابون، کە پلانێك بو شایەنی ستایش کردنەو لە سەردەمی شاژنی شانشین( ئەلیسابات) لە وڵاتە ئینگلیزییەکاندا پەیڕەو دەکرا).ما يقال عن الإسلام، لا ٢٢.

*هێنری دی کاستری: ئەفسەرێکی سوپای فەڕەنسایە بە پلەی(موقەدەم)، لە کتێبی( الإسلام: خواطر و سوانح) دا دەڵێت:( مێژوم خوێندوە، دوای ئەوە ئەوەم بۆ دەرکەوت، کە ڕەفتاری مسوڵمانان بۆ مەسیحییەکان بەڵگەیە لەسەر بەرزی و گەورەیی و پێکەوە ژیان و بەختەوەری و نەرمونیانی مسوڵمانان و ئەوسا جگە لە مسوڵمانان هیچ کەس ئەو هەستەیان نەبو)لا ٤٤.

پاشان هێنری دەڵێت:(.. ئەگەر ئاینی(محمد) بەزەبری شمشێر بڵاوبوایەتەوە ئەوا دوای فتوحاتی مسوڵمانان ڕەوڕەوەی ئەو ئاینە پەکی دەکەوت، بەڵام ئەوەتا تا ئێستاش قورئان باڵی بەسەر هەمو لایەکی ئاوەدانیدا کێشاوە)لا ٥٠.

هەروەها دەربارەی سۆزو بەزەیی ئیسلام و نەرمونیانی مسوڵمانان دەڵێت:(.. ئاینی ئیسلام بەزەبری شمشێرو زەبرو زەنگ بڵاو نەبۆتەوە، بەڵکو چاکترە بگوترێ: ئاشتی و سەلامەتی مسوڵمانان و نەرمونییانیان هۆکاری ڕوخانی میرنشینی عەرەبی بو،



له‌وانه‌یه ئه‌گه‌ر مسوڵمانان له‌گه‌ڵ ئه‌نده‌لوسییه‌کاندا هه‌مان کاری مه‌سیحییه‌کانیان به‌رانبه‌ر گه‌له سه‌کسۆنییه‌کان بکردایه، ئه‌وا ده‌هاتنه پاڵ ئیسلام و پێشوازیان لێده‌کردن، چونکه سه‌ره‌ڕای ئازادی مه‌سیحیه‌تیش تێیدا زۆر پارچه پارچه‌و فره لایه‌ن بون..)ل٨٦.

پاشان شایه‌تییه‌کی زۆر جوان و دادگه‌رانه ده‌دات و ده‌ڵێت:( ئێمه چیمان داوایه له‌و گومان و گریمانانه؟له کاتێکدا، که شتێکمان له‌به‌رده‌مدایه‌و پێویسته هه‌ڵوه‌سته‌ی له‌سه‌ر بکه‌ین، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه، ئاینی قورئان توانی هه‌مو گه‌لانی جوله‌که‌و مه‌سیحی و بتپه‌رست له ئه‌فریقای باکور و به‌شێکی گه‌وره‌ی ئاسیا داگیربکات، ته‌نانه‌ت له ئه‌نده‌لوسدا هه‌ندێ له مژده‌ده‌ران و پیاوانی ئاینی مه‌سیحی به‌هۆی خۆشه‌ویستیان بۆ ئیسلام وازیان له ئاینه‌که‌یان هێناو، به‌بێ هیچ زۆر لێکردنێك، ئه‌مه‌ش پێمان ده‌ڵێت، که ئیسلام هێزی ڕاکێشان و بڵاوبونه‌وه‌ی هه‌یه‌و، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌شه تائێستاش ڕو له زیادبون و بڵاوبونه‌وه‌ی به‌رده‌وامه)ل٨٦.

*ئیمیل دێرمینگهه‌م، ڕۆژهه‌ڵاتناسێکی فه‌ڕه‌نسییه، له کتێبی(حیاة محمد)دا ده‌ڵێت:( جیهاد بۆ هیدایه‌تدانی خه‌ڵکی و مسوڵمان کردنیان نه‌هاتووه، ئه‌وه‌تا قورئان ده‌فه‌رموێت:(لا إكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي)البقره٢٥٦.واته: زۆر لێکردن له ئایندا نییه، ڕێگای چاکه‌و خراپه به‌ته‌واوی ڕونکراوه‌ته‌وه. هه‌روه‌ها قورئان فه‌رمان به مسوڵمانان ده‌کات دادگه‌ر بن و توندوتیژ نه‌بن.

هه‌روه‌ها ده‌ڵێت:( له‌به‌ر ئه‌وه سه‌رکه‌وتن بۆ عه‌ره‌به‌کان نوسرابو چونکه شایه‌نی ئه‌وه بون، هه‌روه‌ها له‌به‌ر ئه‌وه بردنه‌وه بۆ ئیسلام نوسرابو، چونکه ئیسلام ناوونیشانی په‌یامێك بو، که ڕۆژهه‌ڵات زۆر پێویستی پێ هه‌بو.مسوڵمانان به‌ر له کۆچ کردن بۆ مه‌دینه زۆر ئێش و ئازاریان دی و نه‌یانتوانی به‌ره‌نگاری ببنه‌وه، به‌ڵام کاتێك کۆچیان کردو دوای ئه‌و به‌رگریکردن و سه‌رکه‌وتنه.. لێبوردنی فراوانیان کرده



دەستور..)لا٣٩٦.

پاشان دەڵێت:(بەڵێ، بت پەرستان هیچ جێگەیەکیان لەماڵی ئیسلامدا نەما، بەڵام خاوەن کتێبەکان جولەکەو مەسیحییەکان مافی پاراستن و ئازادی پەرستشیان پێبەخشرا.. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:(من آذى ذميًا فأنا خصمه)، واتە:هەر کەسێ پەیمان بەستویەك ئازاربدات ئەوا من دژیم. لە قورئان و فەرمودەشدا زۆر فەرمان بە لێبوردەیی کراوە! ڕزگارکەران و ڕزگارکەرانی ئیسلامیش کاریان بەو بنچینەیە کردووە! هەرگیز مێژو ڕوداوێکی ڕاستی تۆمار نەکردوە، کە مسوڵمانان گەلێکیان لەناو بردبێت، هاتنی پۆل پۆلی خەڵکیش بۆ ناو ئیسلام تەنها ئارەزو بووە، لێرەدا باسی عومەری کوڕی خەتاب دەکەین کاتێك، کە قودسی ڕزگار کرد، فەرمانی کرد کە بە خراپە نزیکی مەسیحییەکان نەکەونەوەو کڵێساکانیان بپارێزن و پیاوانی ئاینی پاراستن و ڕەتیکردەوە کە نوێژ لە کڵێسادا بکات، نەوەك مسوڵمانان ئەوە بکەنە بیانویەك تا بیکەنە مزگەوت..)لا٣٦٩-٣٧٠.

پاشان دێرمینگهەم جیاوازی نێوان فتوحاتی مسوڵمانان و جەنگی خاچپەرستان دەخاتە ڕوو دەڵێت: (بەڕاستی جیاوازییەکی زۆر بەدیدەکەین لەنێوان هاتنی مسوڵمانان بۆ قودس وەکو ڕزگارکەرو هاتنی خاچپەرستان، کە دەستییان کرد بە کوشت و بڕی مسوڵمانان! تا ئاستێك کە ئەسپەکانیان تا چۆکان کەوتنە نێو گۆمی خوێن و بڕیاریاندا کە هەمو ئەو مسوڵمانانەش بکوژن، کە لە کوشتارگەی یەکەم نەجاتیان بوبو)لا٣٧٠.

پاشان دەربارەی بەزەیی مسوڵمانان، کە لە پێغەمبەری ئیسلام و شوێنکەوتوانیدا بەدیدەکرا، دەڵێت: ( محمد دەریخست، کە بە تەواوی گەیشتۆتە بەرزی دەرونی، کە ئەستەمە لە مێژودا هاوشێوەی بدۆزیتەوە، فەرمانی بە سەربازەکانی کرد، کە لە پیرو پەککەوتەکان خۆشبن و نزیکی ژن و منداڵ نەکەونەوە و ئاگاداری کردنەوە کە



نەکەن ماڵی خەڵك تێکدەن و بە زۆرەملێ شت لە بازرگانان وەرنەگرن و درەختە بەبەرەکان نەبڕن و فەرمانپێکردن لەکاتی زۆر پێویستدا نەبێ شمشێرەکانیان دەرنەهێنن، هەروەها سەرزەنشتی زۆر لە سەرکردەکانی دەکرد کە توشی هەڵە بوبان و بۆی ڕاست دەکردنەوە)لا ٣٧١.

*ڕۆم لاندۆ، پەیکەرتاش و ڕەخنە گرێکی هونەری ئینگلیزییەو مامۆستای بابەتە ئیسلامیەکانە لە زانکۆی سان فرانسیسکۆ، لە کتێبی(الإسلام و العرب)دا دەڵێت:( لە سەردەمانێکدا، کە تاڵانکاری یاسایەك بو، کە هەمو لەشکرێك، بە سەرکەوتنەوە چوبایە ناو شارێك پەیڕەوی دەکرد، لەو سەردەمەدا( خالیدی کوڕی وەلید) بەرانبەر خەڵکی دیمەشق، کارێکی کرد، کە دەردەکەوێت کە لەشکری مسوڵمانان خۆی وەك ڕزگارکەری گەلە چەوساوەکان و لەهەمان کاتدا هەڵگری پەیامی ئیسلام هەژمار دەکرد..)لا ٦٠.

پاشان(لاندۆ) شێوازی مامەڵە کردنی مسوڵمانان لەگەڵ پەیمانبەستووەکان- جولەکەو مەسیحییەکان- لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەخاتەڕو و دەڵێت:( بە پێچەوانەی ئیمپڕاتۆریەتی مەسیحی، کە هەوڵی دەدا بە زۆرەملێ مەسیحییەت بەسەر ژێردەستەکانیدا فەرز بکات، عەرەبە مسوڵمانەکان ددانیان بە کەمینەی ئایینیدانا جولەکەو مەسیحییەکان لەلای ئەوان بە-پەیمانبەستو- یاخود گەلە پارێزراوەکان ناسرابون)لا ١١٩.

*هامڵتۆن ئەلیکساندەر ڕۆکسین جیب، پێشەوای ڕۆژهەڵاتناسە ئینگلیزەکانە، لە کتێبی( دراسات في حضارة الإسلام) دا دەڵێت:( فتوحاتەکانی ئیسلام بە جۆرێك ئەنجامدران، کە بە هیچ جۆرێك ئابوری وڵاتە فەتحکراوەکانی توشی شپرزەیی نەکردو لەسەر ئەو بناغەیەش دەستەڵاتێکی ناوەندی توندو تۆلیان دامەزراند)لا ٨.

*د. لویس یۆنگ، توێژەرێکی ئینگلیزی هاوچەرخە، لە کتێبی(العرب و اوروبة)

دا دەڵێت:( ئەو گیانە لێبوردەییەی ئیسلام لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پەیڕەوی کرد زۆر لەو لێبوردەیە زیاتر بو، کە مەسیحییەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پەیڕەویان دەکرد، چونکە لە سەردەمی مەسیحییەکاندا ئەستەمە هیچ ئاسانکاری و ڕەفتارێکی باش بەرانبەر جولەکەکان یان مسوڵمانان بەدی بکەی.لا٥١ .

*د.نەسیم سوسە، ئەندامی کۆمەڵی زانستی عێراقییە، بوەتە مسوڵمان و لە کتێبی( في طريقي إلى الإسلام) دا دەڵێت:( وا چاکە شوێنکەوتوانی(موسا)و(عیسا) چاوێك بە مێژوی ئیسلامدا بخشێنن، تا هەڵوێستەیەك لەسەر ئەو فەرمانانە بکەن کە ئیسلام دەریدەکات دەربارەی بەزەیی هاتنەوە بە منداڵ و ژن و پیرو پەککەوتە و ئەوانەی لە دژیان ناجەنگن، مێژو ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت، کە مسوڵمانان بە پێی شەریعەتەکەیان ڕۆیشتون و بە هیچ جۆرێك بەخراپە نزیکی منداڵ و ژن و پیر و پەککەوتەکان نەکەوتونەتوە و زۆر بەباشی مامەڵەیان لەگەڵدا کردون، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە دوژمن لە منداڵ و ژن و پیر و پەککەوتەو ئەو کەسانەشی دەکوشت کە جەنگاوەر نەبون) ١\٩٤.

هەروەها دەڵێت:( ئیسلام شەریعەتی دادگەری و مرۆڤایەتییە.. ڕێبازی نەرمو نیانی لە بانگەواز بۆ ڕاستی یەکتاپەرستی دڵەکان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و عەقڵی مرۆڤەکان سەرسام دەکات و بەبێ شەڕو شمشێر خەڵك پەلکێش دەکات) ٢\٣٨.

*ئیڤلین گۆبۆڵد، خانمێکی خانەدانی ئینگلیزییە، بوەتە مسوڵمان لە کتێبەکەی(البحث عن الله) دا دەڵێت:( ئیسلام بە خراپە نزیکی خاوەن ئاینانی تر ناکەوێتەوە، تەنانەت ئەوەشیان لەسەر فەرز ناکات کە هەر دەبێ ئاینەکەی قەبوڵ بکەن و بێنە ژێر سایەی.. هەروەها هەرگیز دژایەتی ئەوانەی نەکردووە کە نەبونەتە مسوڵمان و کاری بۆ کوشتن و سوتاندن و سزادانیان نەکردووە وەك چۆن ڕێبازەکانی تر کردویانەو ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆزیش بەڵگەیەکی ڕونە، کە دەفەرموێت:(لا



إكراه في الدين)البقرة. واته: زۆر لێکردن لـه ئاییندا نییه.ل٩٣.

پاشان( گۆبۆلـد) ئەو چیرۆکەی عومەری کوڕی خەتتابی هێناوە، کاتێك لـه کڵێسای( قیامە)·دابو کە کاتی نوێژ هات، بەڵام ئەو هاتە دەرەوەو نوێژی تێدا نەکرد، تا نەبێتە هۆکارێك بۆ کردنی بە مزگەوت، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو ڕێزەی ئیسلام لەسەر شوێنکەوتوانی پێویست کردووە لـەبەرانبەر ئایینەکانی تردا و دەڵێت:( ئەوەتا عومەری کوڕی خەتتاب وەك ڕزگارکەرو سەرکەوتو هاتە ناو قودس.. کاتێك لـەناو کڵێسای قیامەدابو کاتی نوێژ هات، بەڵام ئەو هاتە دەرەوەو لـەوێ نوێژی کرد، کاتێك یەکێ لـە پیاوە ئایینییەکانی مەسیحی دەربارەی هۆکاری ئەوە پرسیاری لێ کرد، پێی گوت: دەترسم دوای من مسوڵمانان ئەو نوێژەی من لـەنێو کڵێسادا بکەن بە بیانویەك بۆ گۆڕینی بۆ مزگەوت و بەمەش پەیمانەکەمان هەڵوەشێنێتەوە.. بەڵێ بەو جۆرە( فاروق) کڵێسای یەکەمی بۆ مەسیحییەکان پاراست)ل٩٤.

هەروەها بەزەیی ئیسلام دەخاتە ڕو، کە سەرکردە(سەڵاحەددین) نیشانیدا کاتێك دەستی بەسەر قودسدا گرت، دەڵێت:( کاتێك سەرکردە(سەڵاحەددین) دوای چەند شەڕێك قودسی گرتەوە دەست و خاچپەرستانی لـەو ناوچەیە وەدەرنا، لـە جەنگەکانیدا هەمو جۆرێکی نەرمونیانی و بەزەیی و سۆزو لێبوردەیی نیشاندا، زۆر لـە نوسەرانی ڕۆژئاواش ئەو سیفەتەیان باس کردووە، ددانیان بەوەداناوە، کە بەرزو بەڕێزترین دوژمن و چاکترین ڕزگارکەر بووە)ل٩٥.

پاشان دەڵێت:(.. ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە، کە کاتێك(سەلاحەددین) قودسی ڕزگارکرد، تا ئەو کات کرداری خوێنڕێژانەی خاچپەرستان بەرانبەر خەڵکی قودس هەر لـەبەر چاوی خەڵکدا مابو، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە و هەمان کرداری بەرانبەر بە خەڵکی مەسیحی نەکردەوەو بە نەرمونیانی و ڕەفتاری جوان لـەگەڵیاندا جوڵایەوە و ڕەتی کردەوە تۆڵـە لـەو کەسانە بکاتەوە کە هەستان بە خراپەکاری و سوتاندن و

تێکدان..)ل٩٥\٩٦.

*ئادەم میتز، ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانییە، مامۆستای زمانە سامییەکانە لە زانکۆی بازل لە سویسرا، لە کتێبی(الحضارة الإسلامية في القرن الرابع الهجري) دا دەڵێت:(حکومەتی ئیسلامی بە هیچ جۆرێك دەستی وەرنەدەدا لە دروشمە ئایینییەکانی پەیمانبەستووەکان، تەنانەت کار گەیشتبووە ئەوەی، کە هەندێ لە خەلیفەکان ئامادەی بۆنەو جەژنەکانیان بن..)ل٧٠.

*ویلیام مۆنتۆمێگری وات، ڕاگری بەشی بابەتە عەرەبییەکانە لە زانکۆی(ئەدنبرا) لە کتێبی( تأثير الإسلام في إوروبة في العصور الوسطى) دا دەڵێت:( هەندێ ناوچە لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیاو باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا هەبون، کە ئیسلام لە ئەنجامی چالاکی بازرگاناندا بڵاوبوەتەوە، دڵسۆزی و هاوسەنگی و دەستگرتنی ئەو مسوڵمانانە بە ئیسلامی پاك بتپەرستانی توشی سەرسامی کرد، ئەوانەی، کە پێوەندی بازرگانیان لەگەڵ مسوڵماناندا هەبو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان مسوڵمان بن و پێوەندی خزمایەتی لە ڕێگەی هاوسەرگیرییەوە بوە هۆی ئەوەی، کە کۆمەڵگەی بچوکی ئیسلامی لە نێو ناوچە بتپەرستییەکاندا دروست بن و پاشان ئەو کۆمەڵگایانە وردە وردە گەورەبون..)ل٣٠.

*پرۆفیسۆر جی-م.کرامەرز، ڕۆژهەڵاتناسێکی هۆڵەندییە، لە کتێبی( تراث الإسلام) دا دەڵێت:((ئۆرشەلیم) کە بەرزترین ناوەندی ئایینی ئەورووپای مەسیحی بو لەساڵی٦٣٨ز کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلام، بەڵام فەتحی ئیسلامی نەبووە ڕێگر لەبەردەم سەردانیکردنی قەبری پیرۆز و نەبوە بەربەست لە نێوان مەسیحییەکان و بەجێهێنانی ئەو پەرستشە)سێر تۆماس ئارنۆڵد ل١٢٩.

نەسری سەڵەب، مەسیحییەکی لوبنانییە، بەدیدی بابەتییانە و گەڕانی بەدوای



ڕاستیدا بەناوبانگە.. لە کتێبەکەی(لقاء المسيحية و الإسلام) دا دەڵێت:( مەسیحییەت جەنگی خاچپەرستانی دژی ئیسلام بەرپا کردووە، جا مێژونوسان بە ئارەزوی خۆیان دەڵێن بۆ ڕزگارکردنی شوێنە پیرۆزەکان بووە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جەنگە یەکێك بو لە هەڵە مێژووییە گەورەکان.. چونکە شوێنە گەورە پیرۆزەکان لە مەترسیدا نەبون و هیچ فەمانڕەوایەکی مسوڵمان نەیویستووە، کە ئەو شوێنە پیرۆزانە لەناوبەرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەوەتا خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب ڕەتیکردەوە نوێژ لە کڵێسای(قیامە) دا بکات تاوەکو هەر بە سروشتی مەسیحی خۆی بمێنێتەوە، مسوڵمانانی تریش بە درێژایی مێژو هەر وایان کردووە)لا٥٤.

پاشان لە( العهدة العمرية)دا دەڵێت:( پەیمانی عومەری کوڕی خەتتاب، کە بە خەڵکی بەیتولمەقدیسی دابو، ئایا لە مێژودا هیچ پەیمانێك هەیە لە ڕوی چاکی و دادگەری و لێبوردەیی پێی بگات؟!..

ئەمەش دەقی بەشێکی پەیمانەکەیە: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان: ئەمانە ئەو مافانەی ئاساییشن، کە بەندەی خوا( عومەر) ی پێشەوای بڕواداران بە خەڵکی بەیتولمەقدیسی داوە، ئاسایشی پاراستنی خۆیان و ماڵ و سامانیان و کڵێساو خاچەکانیان..هیچ کەسێ زۆریان لێناکات و زیانیان پێناگەیەنێت..)لا٣٣١.

پاشان( سەهەب) دەڵێت:( چ دۆڕاوێکی جەنگ بە درێژایی مێژو لە لایەن هێزی براوەو سەرکەوتو پەیمانی وای دراوەتێ؟!.. مسوڵمانان بۆ ماوەی هەزارو سێسەد ساڵ لە ڕۆژهەڵاتدا-بەتەواوەتی لە خاکی فەڵەستین-دا مانەوە، کەچی نزیکی هیچ شوێنەوارێکی مەسیحییەکان نەکەوتنەوە، بەڵکو کڵێساکان و شوێنە پیرۆزەکان بەتەواوی پارێزرابون)لا٣٣١.

*دەتوانین مەرجەکانی جەنگ و بەندو بارەکانی لە ئیسلامدا بەو خاڵانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:



١-ڕونی هۆکارو ئامانج.

٢- تەنها جەنگ لەگەڵ جەنگاوەراندا دەکرێت و بەهیچ جۆرێك دژایەتی خەڵکی ئاسایی ناکرێت.

٣-ئەگەر ئاشتیان بەرپاکرد ئەوا تەنیا ستەمکاران سزا وەردەگرن.

٤-پاراستن و ڕەفتاری جوان لەگەڵ دیلەکانداو ڕەفتاری مرۆڤانەیان لەگەڵدا بکرێت.

٥-پاراستنی ئازادی ئایینی و پاراستنی کڵێساو پەرستگاکان.

٦-پاراستنی ژینگە، نەکوشتنی ئاژەڵ- تەنیا بۆ پێویستی نەبێت-و نەسوتاندنی درەخت و خراپ نەکردنی بەروبومی کشتوکاڵی و ئاوو پیس نەکردنی بیری ئاوو تێکنەدانی خانوی خەڵك.

## ئیسلام به بەزەیی و..دادگەری و..
## زانست و..ئاشتی بڵاوبوەتەوە

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَـٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧

* * *

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ شَـٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَـذِيرًا * وَدَاعِيًا إِلَى
ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴾ الأحزاب: ٤٥ - ٤٦

* * *

((ئەو پیاوەی وەك ڕەحمەت بۆ جیهان نێردراوە، ئەگەر ئێمە پەیامەکەی وەرنەگرین و ڕێبازەکەی پەیڕەو نەکەین، ئەوا ئەو کارەمان هیچ ناگەیەنێت، تەنیا ئەوە نەبێت، کە ئێمە ڕەحمەتی خودا ڕەتدەکەینەوە))

لیۆپۆڵد ڤایس: الاسلام على مفترق الطرق، ل١٠٢-١٠٣.

با مێژو بۆمان بدوێ، دەربارەی:



## یه‌کەم: ئەو ولاتە مسوڵمانانەی فەتحی ئیسلامییان نەچوتەناو:

**١-ئەندونیسیا:**

ئەو ولاتەی ڕێژەی مسوڵمانانی ٪٩٠ەو نەمانبیستووە ڕوژێ لە ڕوژان لەشکرێکی مسوڵمانانی چوبێتە ناو تەنانەت یەکێك لە دورگەکانیشی.

**٢-مالیزیا:**

کە تەنانەت تاکە سەربازێکی مسوڵمانیش نەچوتە نێو خاکەکەی، کەچی ڕێژەی مسوڵمانان لەو ولاتەدا لە نیوەی ژمارەی دانیشتوانی زیاترە.

**٣-ئەفریقیا:**

لە کەناری ڕوژهەلاتییەوە تا موزەمبیق لە باشور و زورینەی دانیشتوانی کەناری ڕوژئاوای قارەکە مسوڵمانن، لەکاتێکدا مێژو هەواڵێکی وای تومارنەکردووە، کە لەشکری مسوڵمانان چوبێتە ناو هیچ کام لەو خاکانەوە.

لەبەرئەوە دەپرسین: کام شمشێرەیە، کە چوتە نێو ئەو خاکانەوەو بوەتە هوکاری بلاوبونەوەی ئیسلام تێیاندا؟!

مێژو پێمان دەڵێت کە ئەوانەی چونەتە نێو ئەو خاکانەوە بازرگانە مسوڵمانەکان بون، کە چەکێکی بەهێزتر لە شمشێریان پێبو، ڕەوشتی پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) و فەرمانە پڕ بەزەییەکانی ئیسلامی وەکو ڕاستگویی و دادگەری و دەستپاکی و بەڵێن بردنەسەر و دڵسوزییان پەیرەو دەکرد.

*دکتور و دیپلوماسکاری ئەڵمانی(مراد هوفمان) لە کتێبەکەیدا(یومیات مسلم ألماني)دا دەڵێت:

(بلاوبونەوەی خوکرد و ئاسانی ئیسلام بەدرێژایی مێژو خاسیەتی ئەو ئاینە بووە، ئەوەش لەبەرئەوەی ئاینی فیترەت و سروشتە، کە بو محمد(ﷺ)هاتووە).



هەروەها لە کتێبی (الاسلام کبدیل) دا دەڵێت: (ئەوەی لە قورئاندا لە هەموشتێك زیاتر توێژەر و ڕۆژهەڵاتناس سەرسام دەکات، ئەو باسە تێروتەسەلەیە، کە قورئان سەرەڕای کەمینەیان لە ناو کۆمەڵگای ئیسلامیدا باسی لە ماف و پاراستنی خاوەن کتێبەکان کردووە، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕونە لەسەر لێبوردەیی و سنگ فراوانی ئەو ئاینە)لا ١٢٤.

بەپێی توێژینەوەکانی ناوەندی(رصد العقائد)لەشاری(برن)ی سویسرا، ئیسلام لە هەمو ئاینەکان زیاتر لە جیهاندا و لە مێژودا گەشەدەکات و بڵاودەبێتەوە.

ئەو ڕاستییەش لەلایەن توێژەرانی ئاینەکان پشتڕاست کراوەتەوە، ئەوەتا کچە توێژەری ئاینی ئەمریکی دەڵێت:

*کارۆل ئەنوی، لە کتێبەکەی (سر إسلام الامریکیات)دا دەڵێت: (لە ئەمریکای باکوردا ئیسلام لە هەمو ئاینەکان زیاتر گەشەدەکات و بڵاودەبێتەوە)لا ١٨٠.

*هەروەها دکتۆر (هستۆن سمیس) لە کتێبی(دیانات الانسان)دا دەڵێت: (ئیسلام لەم سەردەمەدا-وەك سەردەمانی پێشو-لە هەمو ئاینەکان لە پەیداکردنی شوێنکەوتو و بەڕاست دانەراندا خێراترە)

*هەروەها مژدەدەر (جۆن تکل)دەڵێت: (سەرەڕای ئەو هەوڵە کەمەی لەپێناو بڵاوبونەوەیدا دەدرێت-کە دەکرێ هەوڵەکان بە نەبو هەژمار بکرێن-بەڵام ئیسلام هەر بەرەو گەشەسەندن و بڵاوبونەوەیە)الغارة علی العالم الاسلامي، ل.شاتلیية.

*بیانکا سکارسیا، لە کتێبەکەی(العالم الاسلامي و قضایاه التأریخیة)دا دەربارەی هێزی سەرنجڕاکێشی ئیسلام دەڵێت: (شەریعەتی قورئانی هێزی سەرنجڕاکێشانی هەیەو کار لە ملیۆنان کەس دەکات، ئیسلام بەردەوام خواستی لەسەر زیاتر دەبێت و خەڵك زیاتر دەبنە مسوڵمان.. لێکدانەوەی ئەو دیاردەیەش بەتایبەت لە ئەوروپادا کارێکی قورسە، چونکە خەریکە ئیسلام دەبێتە جێگرەوەی شارستانییەتی ڕۆژئاوا)لا ٤٠-٢٠٧.



پاشان (سکارسیا)ده‌رباره‌ی هێزی سه‌رنجڕاکێشی ئه‌و ئایینه پرسیارده‌کات و ده‌ڵێت: (ئیسلام به‌رده‌وام گه‌شه‌ده‌کات، ئه‌و هێزه سه‌رسوڕهێنه‌ره چییه، که له‌و ئایینه‌دا هه‌یه؟! چ هێزێکی خودکاری باوه‌ڕهێنه‌ری تێدایه؟! بۆچی ده‌رونه‌کان به‌په‌رۆشه‌وه بانگه‌وازی ئیسلام قه‌بوڵ ده‌که‌ن و به وه‌ڵامی ئه‌رێ له خزمه‌تیدان؟!)شمس الإسلام تشرق من جديد، محمد عثمان، لا١٩٢.

*جۆن پۆل رۆ له کتێبه‌که‌ی (الإسلام في الغرب)دا ده‌ڵێت: (گه‌ڕانه‌وه‌ی ئیسلام بۆ ئه‌ورووپا شه‌پۆلێکی نوێیه، که هیچ ئایین و ڕێسایه‌ك ناتوانێت سنورداری بکات یان بیوه‌ستێنێت).

*(لیۆ تولستۆی)یش ڕای وایه، که: (شه‌ریعه‌تی ئیسلام هه‌مو بستێکی ئه‌و سه‌رزه‌مینه ده‌گرێته‌وه، ئه‌وه‌ش به‌هۆی گونجانی له‌گه‌ڵ عه‌قڵدا و بونی دانایی و دادگه‌ری تێیدا) شمس الإسلام تشرق من جديد، محمد عثمان، لا١٩٢.

*یه‌کێك له‌و ڕاستییانه‌ی نوسه‌ری شانۆگه‌ری ئێرله‌ندی(جۆرج بێرنارد شۆ) خستویه‌تییه‌ڕو، ئه‌وه‌یه، که ده‌ڵێت: (هه‌مو دنیا ئیسلام قه‌بوڵ ده‌که‌ن، ئه‌گه‌ر به‌ناوی خۆشییه‌وه په‌یڕه‌وی نه‌که‌ن ئه‌وا به‌ناوێکی خوازراو په‌یڕه‌وی ده‌که‌ن! ئه‌و ڕۆژه‌ش دێت که ڕۆژئاوا دێته سه‌ر ئایینی ئیسلام) الإسلام بعد مئة عام.

## دووه‌م: ئه‌و ولاتانه‌ی فه‌تحی ئیسلامییان گه‌یشتوتێ:

له‌و باسه‌دا شایه‌تی مێژو ده‌خه‌ینه‌ڕو، هه‌روه‌ك ڕۆژهه‌ڵاتناسی ئینگلیزی (تۆماس ئارنۆڵد) له کتێبه‌که‌یدا(الدعوة الى الإسلام)دا هێناویه‌تی:

### ١-ولاتی شام:

(ئه‌و هۆزه مه‌سیحییانه‌ی بونه مسوڵمان به ئاره‌زوی خۆیان و ئازادانه ئه‌و بڕیاره‌یان داوه، ئه‌و عه‌ره‌به مه‌سیحییانه‌ی ئێستا له‌نێو کۆمه‌ڵانی مسوڵماندا ده‌ژین



شایەتی ئەو لێبوردەییەن)لا٧٠.

هەروەها دەڵێت: (خەڵکی مەسیحی حومس لە سوریا هاتنەلای ئەبوعوبەیدەی عامری کوڕی جەرراح، ئەوکاتەی مسوڵمانان بڕیاریان دابو لە باشور بەرەو یەرموك پاشەکشێ بکەن، دەیانگوت:

ئەی مسوڵمانان، ئێوەمان لە ڕۆمەکان خۆشتر دەوێت، ئەگەرچی ئەوان لەسەر ئایینەکەی ئێمەش بن، ئێوە بەوەفاتر و بەبەزەیی ترن..باشتریشن بۆ سەرکردایەتیمان، چونکە ئەوان-ڕۆمەکان-دەمانچەوسێننەوە و ناهێڵن دروشمە ئایینییەکانیشمان بە ئازادی ئەنجام بدەین)لا٧٣.

٢-میسر:

(سەرکەوتنی گەورەی عەرەبەکان-ڕزگارکەرە مسوڵمانەکان-بەر لە هەمو شتێك دەگەڕێتەوە بۆ پێشوازی کردنی مەسیحییەکان، کە لە فەرمانڕەوایی بیزەنتییەکان بێزاربوبون، بەهۆی ئەو زوڵم و ستەمەی دەیانکرد و زانایانی ئایینییان ئازاردەدان)لا١٢٣.

یەکێك لە وێنەکانی ستەمی ڕۆمە بیزەنتییەکان بریتی بو لەوەی، کە: (قیبتییەکانیان ئازار و ئەشکەنجە دەدان، پاشان فڕێیان دەدانە نێو ڕوبار)لا١٢٣.

فەتحی ئیسلامی چی پێشکەشی قیبتییەکانی میسر کرد؟

١-ڕزگاری کردن لە باج و سەرانەی زۆر و تەنیا دەیەکی ئەو باجەی لێوەردەگرتن، کە ڕۆمەکان وەریان دەگرت.

٢-ئازادی ئایینی بۆ دابینکردن-هەروەك تۆماس ئارنۆڵد دەڵێت-ژیانێکی وای بۆ فەراهەم هێنان کە لەسەر ئازادی ئایینی دامەزرابو، لەکاتێکدا پێشتر ئەو ئازادییەیان نەبو.

(هەروەها هیچ بەڵگەیەك نییە ئەوە بسەلمێنێت کە گۆڕینی ئایینی پێشویان و



مسوڵمان بونیان بەهۆی چەوساندنەوە و زۆرلێکردن و نەبونی لێبوردەیی بووە لەلایەن فەرمانڕەوا نوێکانەوە-واتە: مسوڵمانان-تەنانەت هەندێ لە قیبتیەکان بەرلەوەی فەتحی ئیسلامی دەستپێبکات مسوڵمان بوبون)ل١٢٤.

٣-ئیسپانیا:

(لەڕاستیدا سیاسەتی لێبوردەیی-کە ڕزگارکەرە مسوڵمانەکان پەیڕەویان دەکرد، گەورەترین کاریگەری لەسەر ئاسانکردنی دەستگرتن بەسەر ئەو وڵاتانەدا هەبو)ل١٥٧.

(کاریگەری ئیسلام لەسەر دەرونی ئەو مەسیحیە ئیسپانییانەی بوبونە مسوڵمان بە ئەندازەیەك بو، کە بەو شارستانیەتە سەرسوڕهێنەرە سەرسامی کردن و بە شیعر و فەلسەفەو هونەر دەستی بەسەر عەقڵ و خەیاڵیانداگرت)ل١٦٤.

ژیار و شارستانییەتی ئیسلام لەهەمو بوارەکاندا-کە لە مێژودا وێنەی نەبو-هۆکاری بڵاوبونەوەی ئیسلام بون، نەوەك شمشێر هەروەك نەفام و نەیاران دەیدەنەپاڵ ئیسلام.

مێژو و ئێستاش بۆ شایەتی بەسن.

## ئایین و ڕێبازەکانی دی بەوشێوەیە بلاوبونەتەوە

(فَضَرْباً تَضْرِبُ سُكَّانَ تِلكَ المَدِينَةِ بِحَدِّ السَّيْفِ وَتُحَرِّمُهَا بِكُلِّ مَا فِيهَا مَعَ بَهَائِمِهَا بِحَدِّ السَّيْفِ)

واته: (بە شمشێر لەدانیشتوانی ئەوشارە بدەن و هەرچی تێیدایە بە زەبری شمشێر لەناوی بەرن تەنانەت ئاژەڵەکانیش). تثنية:١٣ :١٥

* * *

(فاضرب جميعَ ذكورها بحدِّ السّيف، وَحَرَّمُوا كُلَّ مَا فِي الْمَدِينَةِ مِنْ رَجُلٍ وَامْرَأَةٍ، مِنْ طِفْلٍ وَشَيْخٍ - حَتَّى الْبَقَرَ وَالْغَنَمَ وَالْحَمِيرَ بِحَدِّ السَّيْفِ)

يشوع:٢١ :٦

واته: بەشمشێر هەمو پیاوەکان-نێرەکان-لەناوبەرە، هەرچی پیاو و ژن و منداڵ و پیرە لەناوی بەرە، تەنانەت مانگاو مەڕومالات و گوێدرێژەکانیش بەشمشێر لەناوبەرە.

* * *

(لاَ تَظُنُّوا أَنِّي جِئْتُ لِأُلْقِيَ سَلاَماً عَلَى الأَرْضِ. مَا جِئْتُ لِأُلْقِيَ سَلاَماً بَلْ سَيْفاً) متى:٣٤ :١٠

واته: وامەزانن من بۆ ئەوە هاتوم تا ئاشتی لە زەویدا بەرپابکەم، من نەهاتوم ئاشتی بچەسپێنم بەڵکو هاتوم شمشێر بسەپێنم.

هەمدیسان با مێژو بە پێنوسی نامسوڵمانان وەڵامان بداتەوە...



*تۆماس ئارنۆڵد لەکتێبەکەی(الدعوة الى الإسلام)دا دەڵێت:

لە دانیمارك پاشا(كنوت)بەپارەوپول و زەبروزەنگ مەسیحیەتی سەپاند، پاشان گەلە ستەمدیدەکانی ناچاری یاساکانی مەسیحییەت کرد، دوای ئەوەی لەگەڵ مەمالیکە بەربەرییەکاندا لەچەند جەنگێکی سەختدا ڕوبەڕوبویەوە، هەمو ئەوەشی لەپێناو بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکەیداکرد)لا ٣٠، لە پەراوێزی لاپەڕەکەدا.

(لەڕوسیادا مەسیحییەت لەسەر دەستی تاقمێك بڵاوبویەوە، بەناوی: برایانی شمشێرBretheren of the Sword)لا٣١.

(کۆمەڵەیOrdo Fratrum Militiae Christ بەزۆر مەسیحییەتیان بەسەر گەلانی لیڤۆتیادا فەرزکرد)لا٣١.

(لەنەرویج: پاشا (ئۆلاڤ ترایگڤیسۆن) هەمو ئەوکەسانەی سزادا کە ڕەتیان دەکردەوە ببنە مەسیحی، دەست وقاچی هەندێکیانی بڕی و هەندێکیانی دەربەدەرکرد، لە باشوری نەرویجیش لە (ڤیگن) مەسیحییەت بەهەمان شێوە بڵاوبووەوە))لا٣٢.

*(گرڤیتان تۆدۆرۆڤ)لە کتێبی (فتح أمريكا)دا دەڵێت: (ئەوروپا بەناوی مەسیحییەتەوە هەشتا ملیۆن کەسی لە هیندە سورەکان لەناوبرد).

*دکتۆر(فرانز گریس) لەکتێبی (تبدد أوهام قسیس)دا دەڵێت: (مێژوی گەلانی مەسیحی، تەنانەت خودی کڵێساش بەخوێن سورە و، لە هەمو گەلە بتپەرستەکانی جیهانی کۆن دڕندانەتربون)لە(بوێنس ئایرس)، لە چاپخانەی(دار الطباعة) چاپکراوە.

*گۆستاڤ لۆبۆن لەکتێبەکەی(حضارة العرب)دا دەڵێت: (تەنیا لە مزگەوتی عومەری کوڕی خەتتابدا لە قودس دە هەزار مسوڵمان لەسەردەستی خاچپەرستاندا سەربڕاون)لا٢٢٦.

هەروەها دەربارەی ئەو توندوتیژی و ستەمکارییەی خاچپەرستان لە بەرانبەر



مسوڵمانان و خەڵکانی دی کردویانە، دەڵێت: (گەلی خاچپەرستی دینداری ئێمە تەنیا بە زوڵم و ستەم و کاولکاری و ئەشکەنجەدان نەوەستان، بەڵکو لەسەر ئەوە کۆبونەوەیەکیان کرد و بە کۆدەنگی لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە دانیشتوانی قودس بە مسوڵمان و جولەکەوە، کە ژمارەیان شەست هەزار کەس بو لەناوببەن، لەکۆتاییشدا کاری خۆیان کرد و لەماوەی شەست ڕۆژدا هەمویانیان لەناوبردن، هیچ کەسێکیان نەبارد، تەنانەت ئافرەت و منداڵ و پیر و پەککەوتەکانیش، گیلیۆم سۆری دەڵێت: (خاچپەرستان مرۆڤی نەفام و خراپەکار و بێ دین بون، ئەگەر نوسەرێك بیەوێت باسی خراپی و بەدڕەوشتی و دڕندایەتییان بکات، ئەوا دەبێت لە بازنەی مێژونوسی بچێتە دەرەوە و ببێتە مرۆڤێکی جنێودەر و زمان پیس)ل ١٩٤.

*ئیمیل دێرمینگهەم لە کتێبی(حیاة محمد)دا دەربارەی جیاوازی ڕزگارکەرانی مسوڵمان و خاچپەرستان لەچونەنێو قودسدا دەڵێت: (بەڕاستی جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان چونی مسوڵمانان بۆ قودس لەگەڵ خاچپەرستاندا کە مسوڵمانانیان کوشت و بڕ دەکرد! بە ئەندازەیەك کە سوارچاك و سەربازەکانیان بەناو گۆمی خوێندا دەخولانەوە و بڕیاریان دابو هەمو ئەو مسوڵمانانە بکوژن، کە لە کوشتارگەی یەکەم ڕزگاریان بوبو)ل ٣٦٩.

*هەروەها ئیڤلین گۆبوڵد لە کتێبی (البحث عن الله)دا دەڵێت: (کاتێك سەلاحەددین قودسی ڕزگارکرد، کردارە خوێناوی و ستەمکارییەکانی خاچپەرستان پڕی چاو و گوێی خەڵك بو، بەڵام ئەو ڕەتیکردەوە کرداری هاوشێوەیان لەگەڵدا بکات و بەچاکەو نەرمونیانی لەگەڵیاندا جولایەوە و ڕەتیکردەوە کە تۆڵە لەوانە بکاتەوە کە کاریان خراپەکاری و سوتاندن و کاولکاری بو)ل ٩٦.

ئەگەر بمانەوێ درێژە بەو باسە بدەین ئەوا زۆر هەڵدەگرێت، قسەش هەرچەند



زۆربێت بێ نرخ دەبێت، لەبەرئەوە بە پرسیارێك کۆتایی بەو باسە دێنین: ئەو زوڵم و ستەمەی لەم بەشەدا باسمان کرد لەکێی ڕەحم و بەزەیی ڕزگارکەرە مسوڵمانەکاندایە؟! یاخود لەکوێدا دەتوانرێ بە ڕەحم و بەزەیی ئیسلام بەراورد بکرێت؟!

## هەڵوەستەیەك لەسەر سەرانە (الجزیة)

﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ الممتحنة: ٨.واتە: خوا ڕێگریتان ناکات دۆستایەتی ئەو کافرانە بکەن کە جەنگیان لەگەڵدا نەکردون بەهۆی ئەوەی کە ئێوە مسوڵمان بوون و ئەوان بتپەرست بوون و لە وڵاتی خۆتانیان دەرنەکردون، خوا ڕێتان لێناگرێت کە چاکەیان لەگەڵدا بکەن و بە داد لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە، خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە بە دادگەری لەگەڵ خەڵك ئەجوڵێنەوە.

***

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (ألا من ظلم معاهَدًا أو انتقصه أو كلّفه فوقَ طاقته أو أخَذ منه شيئا بغير طيبِ نفس فأنا حجيجه يوم القيامة)رواه أبو داود في سننه. واتە: هەرکەسێك ستەم لە پەیمان بەستویەك بکات یان مافی بخوات یان زیاد لە هێزی خۆی کاری پێبکات یاخود بەبێ ئارەزوی خۆی شتێکی لێوەربگرێت، ئەوا من لە ڕۆژی قیامەتدا نەیاری ئەوم.

***

هەروەها فەرمویەتی: (من آذى ذِمِّياً فأنا خصمه)رواه الخطيب عن ابن مسعود.واتە: هەرکەسێك پەیمان بەستویەك سزا بدات ئەوا من نەیاریم.

***



## یەکەم: پێناسەی سەرانە:

سەرانە(الجزية): باجێکی کەمە، کە ئیسلام لەسەر نامسوڵمانانی داناوە، لە بنچینەی (ج ز ی) داتاشراوە، عەرەب دەڵێت: جزی، يجزي، کاتێك لەبەرانبەر خزمەتێکدا کەسێك پاداشت دەکەی.

هەرچی (الجزية)یە ئەوا لە سەر وەزنی (فِعلة)یەو لە (مجازاة)ەوە وەرگیراوە، بەواتای: لە پاداشتی هێمنی و ئاسایشدا ئەو بڕە پارەیە دەبەخشن.

ئەو وشەیە بەسادەیی خۆی بەڵگەیەکی ڕونە لەسەر ئەوەی ئیسلام بەزەبری شمشێر فەرز نەکراوە و هیچ کەسێك ناچار نەکراوە ببێتە مسوڵمان، بەڵکو هەرکەسێك ئازادی تەواوی هەیە لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕی خۆی، بۆیە پەرستگاکانی خاوەن ئایینەکانی تر وەکو خۆی مابونەوەو ئازادانە خەریکی ڕێوڕەسم و دروشمە ئایینیەکانی خۆیان بون.

## دووەم: ئەندازەی سەرانە:

لەوانەیە زۆرکەس وا گومان ببات کە ئیسلام بوتەوە سەرانەی لەسەر نامسوڵمانان داناوە تاکو بۆ ڕزگابون لەو سەرانەیە ببنە مسوڵمان..

بەڵام ئەوکەسانەی ئەوجۆرە قسانە دەکەن چەند شتێکیان لێ ون بووە-کە پڕن لە دادگەری و بەزەیی-و خوا یاربێت بە کورتی دەیانخەینەڕو:

١- ئەندازەی سەرانە لەسەر کەسی ئازاد تەنیا دینارێکە بۆ هەر ساڵێك.

لە کاتێکدا دەبێ مرۆڤی مسوڵمان هەمو ساڵێك ئەندازەی ٪٢,٥ی زەکاتی ماڵ و سامانی بدات، کە لەوانەیە بکاتە چەند ئەوەندەی ئەندازەی سەرانە.

٢-سەرانە لەسەر ئافرەت پێویست نەکراوە.



لەکاتێکدا ئافرەتی مسوڵمان لەسەری پێویستە زەکات بدات.

٣-سەرانە لەسەر بچوك پێویست نەکراوە(هەرچەندە ماڵ و سامانیشی هەبێت، کە لە میرات یان بەشێوەیەکی دی بۆی مابێتەوە).

لەکاتێکدا زەکات لەسەر منداڵی مسوڵمان پێویست کراوە(جا پارەکەی لە میرات یان بەهەر جۆرێکی دی بۆ مابێتەوە هەر دەبێ زەکات بدات).

٤-ئەوانەی سەرانە دەدەن لە خزمەتی سەربازی دەبوردرێن(تەنانەت ژیانێکی پڕ هێمنی و ئاسایشی ڕەهایان بۆ دابین دەکرێت).

لەکاتێکدا مسوڵمان خزمەتی سەربازی لەکاتی پێویستدا لەسەر فەرز کراوە.

٥-سەرانە تەنیا لەسەر ئەو کەسانە پێویستکراوە کە توانای ماددییان هەیە(بەمەش هەژار و نەداران لەوە بەدەرکراون).

تەنانەت ئەوکەسەی هەژارە نەك هەر لە سەرانەدان دەبوردرێت بەڵکو لە خانەی سامانی مسوڵمانان پارەی پێدەدرێت. المبسوط ١٠/ ٨١.

عومەری کوری خەتتاب(خوا لێی ڕازی بێت)بەلای پیرەپیاوێکی پەیمانبەستودا دەڕوات، کە لە بەردەم دەرگای خەڵك خەریکی سواڵکردن بو، ئەویش پێی گوت: بەڕاستی ئەوە دادگەری نیە ئەگەر ئێمە لە گەنجیدا سەرانەمان لێوەرگرتبێ و لە پیریشدا وازت لێبێنین..پاشان بردیە خانەی سامانی مسوڵمانان و بە ئەندازەی پێویستی پارەی پێدا. کتاب الاموال:للامام أبي عبيد القاسم بن سلام، لا ١٠٣.

٦-سەرانە لە ڕاهیبەکان-ئەوانەی لە خەڵوەتدان بۆ خواپەرستی- وەرناگیرێت(بەڵام بۆ ئەوانەی لە خەڵوەتدانین زانایان ڕای جیایان هەیە).

٧-لەسەر پەککەوتەو نەخۆشی درێژخایەن و کوێر و پیر و..تاد پێویست نەکراوە.

٨-سەرانە لەبەرانبەر ئەو خزمەتگوزاریانە وەردەگیرێت کە دەوڵەت پێشکەشی



دەکات، وەکو(ڕێگاوبان و نەخۆشخانەو دادگاکان و هێمنی و ئاسایش و..تاد).

*دکتۆرە(ئیلیس لیختنستادتەر) دەڵێت: لە وڵاتی ڕۆم و فارس هەڵبژاردن لەنێوانی ئیسلام و شمشێر نەبو، بەڵکو هەڵبژاردن لەنێوان یان ئیسلام یان سەرانە بو ، ئەو پلانەش بەهۆی جوانی شایەنی مەحت کردن و پیاهەڵدانە..)الإسلام والعصر الحديث، لا ٢٢.

* * *

# تۆ.. ئەقڵت لەکوێیە؟!

﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ الصف: ٨

* * *

(ڕۆژئاوا بە دروستی ئیسلامی دیراسە نەکردووە، تەنانەت لە زانکۆکانیشیدا، بەداخەوە لەوانەیە ئەمەش بە ئەنقەست بوبێت)بیرمەندی فەرەنسی ڕوجێ گارودی.

* * *

ئەو کەسەی بڕوای وایە، کە(ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبوەتەوە)، لێی دەپرسین: ئەقڵت لە کوێیە؟!..

ئایا مێژوت خوێندوتەوەو خۆت بەدواداچونت کردووە؟!..

یان هەرچییەکت گوێ لێبێت بەبێ ئەوەی لە ڕاستی و دروستی بکۆڵیەوە دەیگێڕیەوە و بەمەش دەبیتە بەشداربوی بوختانەکە؟!..

ئەقڵت لە کوێیە کاتێك پێتوایە-قسەی خەڵکی بێت یان خۆت باوەڕت وابێت- کە ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبوەتەوە، لە کاتێکدا دەبینی هیچ کام لەو وڵاتانەی فەتحی ئیسلامییان گەیشتوتێ دوای ئەوەیش، کە مسوڵمانانیش لەو وڵاتە چونە دەرێ هەڵنەگەڕانەوە و وازیان لە ئیسلام نەهێنا؟!..

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ماوەی سێزدە ساڵ بە حیکمەت و ئامۆژگاری خەڵکی بۆ ئیسلام بانگەواز دەکرد و، قورەیشییەکانیش بە هەمو جۆرێکی ئازار و ئەشکەنجە ڕوبەڕوی خۆی و هاوەڵان و شوێنکەوتووانی دەبونەوە.. قورئانی پیرۆزیش پێی



دەفەرمو:

﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾ الأحقاف: ٣٥ واتە: کەواتە تۆ ئەی موحەممەد! خۆت ڕاگرە لەسەر دەرد و ئازاری ئەو کافرانە وەك چۆن پێغەمبەرە دڵ قایمەکانی تر خۆیان ڕاگرت.

پاشان بەرەو مەدینە کۆچی کرد و ماڵ و سامانی خۆی و مسوڵمانان تەخشان و پەخشان کراو، قورەیشییەکان بە ماڵ و سامان و کەل و پەل و چەك و تفاقی مسوڵمانان لە دژیان چونەدەرەوە و ژمارەیان نزیکەی ٩٥٠ کەس بو، خوای پەروەردگاریش مۆڵەتی بە مسوڵمانان دا، کە-بەرگری لە خۆیان بکەن- و شەڕبکەن و ژمارەیان لە ٣١٣ پیاو تێپەڕی نەدەکرد و تەنیا دو ئەسپ یان سێیان لەگەڵدابون..

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ * ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ الحج: ٣٩ - ٤٠ واتە: خوا ڕوخسەتی داوە بەو مسوڵمانانەی کە کافرەکان جەنگیان لەگەڵ ئەکەن، ڕوخسەتی وەڵامدانەوەو شەڕکردنی لەگەڵیان داوە چونکە ستەمیان لێکراوەو خوا توانای ئەوەی هەیە یارمەتییان بدا و سەریان بخات بەسەر ئەو کافرانەدا. ئەوانەی بە ناحەق لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دەرکراون تەنها لەبەرئەوەی ئەڵێن پەروەردگاری تاك و تەنیای ئێمە زاتی خوایە. ئەگەر خوا هەندێ کەسی بە هەندێ کەسی تر لەناو نەبردایە، چەندین پەرستگای ڕەبەنەکان و کڵێسەی گاوران و چەند کەنشتی جولەکەو چەند مزگەوتی مسوڵمانان کاول ئەبون کە هەمویان ناوی خوایان تێدا دەهێنرێت، بەڕاستی خوا یارمەتی هەرکەسێك ئەدات کە ئەویش یارمەتی ئایینی



خوا بدات. خوا بەهێزە ئەتوانێ یارمەتی ئەو کەسانە بدات و هیچ شتێك ڕێی لێناگرێت.

﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ البقرة: ١٩٠ واته: که چونه حەرەم و کافرەکان هاتن شەڕتان لەگەڵ بکەن، ئێوە دەستدرێژی مەکەن بەوەی بەوەی پێشدەستیان لێ بکەن و شەڕیان لەگەڵدا بکەن، بەڵام ئەگەر ئەوان پێشدەستیان کرد ئەوا ئێوەیش لێیان مەوەستن و شەڕیان لەگەڵ بکەن، خودا بنیادەمی دەستدرێژکەری خۆش ناوێت.

﴿ وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهۡلُهَا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴾ النساء: ٧٥ واته: ئەوە چیتان لێقەوماوە؟ بۆ دانیشتون؟ بۆچی لەپێناو ڕەزامەندی خودا ناجەنگن؟ بۆچی بۆ ڕزگارکردنی ئەو ژن و پیاو و منداڵە مسوڵمانە بێ دەسەڵاتانە ناجەنگن کە لە مەککە ماونەتەوە و لەسەردەستی کافرەکاندا توشی ئازار و سزا دەبن و بەتەواوی گەیشتوتە گیانیان و لە خودای گەورە ئەپاڕێنەوە و ئەڵێن: خودایە ڕزگارمان بفەرمو لەم دێیە کە کۆمەڵێکی زاڵم و ستەمکار دەستیان بەسەردا گرتووە و سزامان ئەدەن، خودایا لای خۆتەوە یارمەتیمان بدە و لای خۆتەوە پشتیوانمان بۆ بڕەخسێنە.

هەروەها کاتێك گەڕایەوە مەککە-کە بە ستەم لێی وەدەرنرابو- دە هەزار هاوەڵی لەگەڵدابو و سەری داخستبو و ملکەچی خودای گەورەبو، هەروەها فەرمانی بە هاوەڵانی کرد، کە جەنگ لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکەن مەگەر ئەوان لەگەڵیاندا بجەنگن و لەهەموو ئەو کەسانەش خۆش بو، کە بەسەختترین شێوە ستەمیان لێکردبو وئازاریان دابو، هیچ کام لەوانیشی ناچارنەکرد ببنە مسوڵمان .



هەركەسێ ڕاستگۆیانه و دادگەرانه لە کتێبەکاندا بگەڕێت، دەبینێت، کە مێژو هیچ ڕەحم و بەزەیییەکی -لەبەرانبەر مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك- تۆمارنەکردووە و هیچ دادگەرییەکی باس نەکردووە تەنیا هی مسوڵمانە ڕزگارکەر و فاتحەکان نەبێت.

بەڵگەش بۆ ئەو قسەیە، قسەی ئەبوبەکری سدیق(خوا لێی ڕازی بێت) بەسە، کە بە لەشکری ئوسامەی کوڕی زەیدی فەرمو: (خیانەت مەکەن، فێڵ مەکەن، کوشت و بڕ مەکەن، کەس ئازار مەدەن، منداڵی بچوك و پیاوی بەساڵاچو و ئافرەتان مەکوژن، هیچ درەختێکی تەڕ و بەبەرهەم مەبڕن و مەسوتێنن.. تەنیا بۆ خواردن نەبێت هیچ مەڕ و مانگا و وشترێك سەرمەبڕن، بەلای گەلانێك دا تێدەپەڕن، کە لە کەنیشتە و پەرستگاکاندا خەریکی خوداپەرستین، وازیان لێبێنن و ئازاریان مەدەن) الطبري: ٢٢٦/٣.

هەروەها (پەیمانامەی عومەری)، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

(بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان: ئەمە ئەو مافانەن، کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری پێشەوای باوەڕداران بە خەڵکی ئیلیا-قودس-ی داوە: پاراستنی گیان وماڵیان، پاراستنی کڵێسا و خاچ و، مرۆڤی ساغ و نەخۆش و هەمو گەلەکەی، نابێ کڵێساکانیان بکرێنە جێگای نیشتەجێبون و ناشبێ تێکبدرێن، تەنانەت نابێت ڕوبەری زەوییەکانیشیان بچوك بکرێنەوە، نابێ نزیکی خاچ و هیچ ماڵ و سامانێکیان بکەون و نابێ بەزۆرەملێ ئاینیان پێ بەیرەو بکرێت و نابێ هیچ کەسێکیان ئازار بدرێت.. ئەوەی لەو دەقەدا هاتووە هەموی پەیمانی خودا و پێغەمبەرەکەی و خەلیفەکان و هەمو مسوڵمانانەو لە ئەستۆی هەمواندایە) الطبري: ٦٠٩/٣.

شەرعزانان مافی نامسوڵمانانیان لە وڵاتی ئیسلامیدا لەو پەیمانامە هەڵێناوە کە لە قورئان و فەرمودەدا هاتون، کە لێرەدا وەکو نمونە هەندێ لەو مافانە وەکو نمونە دەخەینەڕو:



١-پاراستنی گيان، خوێنی پەیمان بەستو وەكو خوێنی مسوڵمان وايە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (من قتل قتيلا من أهل الذمة لم يجد ريح الجنة وإن ريحها ليوجد من مسيرة أربعين عاما)أخرجه أحمد: ٢/ ١٨٦، والنسائي : ٨/ ٢٥.

واتە: هەركەسێك پەیمان بەستويەك بكوژێت، ئەوا بۆنی بەهەشت ناكات، بۆنی بەهەشتيت چل ساڵ ڕۆيشتن دەڕوات.

هەروەها عەلی كوڕی ئەبو تالیب(خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: (من كان له ذمتنا فدمه كدمنا، و ديته كديتنا). مسند الشافعي:١/ ٣٤٤.واتە: هەركەسێك لە نێو پەیمانی ئێمەدابێت، ئەوا خوێنەكەی وەكو خوێنی ئێمەيەو خوێنبايیەكەيشی وەكو خوێنبايی ئێمەيە.

٢- لە ياسای سزاداندا، مسوڵمان و پەيمانبەستو وەك يەكن.

٣-مسوڵمان و پەيمانبەستو لە ياسای شارستانيدا يەكسانن و ماڵ و سامانيان وەك ماڵ و سامانی ئێمەيە.

٤- ئازاردانی نا مسوڵمان بە دەست و بە زمان قەدەغەيەو پێويستە لە ئازاردان بپارێزرێن و تەنانەت غيبەت كردنيشيان حەرامە.

٥-پەيمان بەستن بۆ هەتايە دەكەوێتە ئەستۆی هەمو مسوڵمانان و، هيچ مسوڵمانێك بۆی نييە هەڵی بوەشێنێتەوە، بەڵام پەيمان بەستوان سەربەستن لەسەرئەوەی بەردەوام بن، يان هەركاتێ ويستيان هەڵی بووەشێننەوە.

٦- پەيمانبەستووان بە باری شارستانی خۆيان كاردەكەن.

*ئەو بەشەش بە قسەی (هێنری دی كاستری) كۆتايی پێدێنم، كە لە كتێبی(الاسلام: خواطر و سوانح)دا دەڵێت: (.. هيچ كەس بۆ چونەنێو بازنەيەوە-



واته نێو بازنه‌ی ئیسلام-ناچارنه‌کراوه، بەڵکو دڵه‌کان به تاسه‌و ئاره‌زووه‌وه چونه‌ته ناویه‌وه، ئه‌مه‌ش له ئه‌نجامی ئه‌و به‌هره کاریگه‌ر و ئاقڵ ڕفێنانه‌بو، که له‌نێو قورئانی پیرۆزدا هه‌ن) ل٣٩.

ئێستا، دوای ئه‌و شتانه‌ی خرانه‌ڕو، ئایا بۆمان نییه له‌و که‌سه‌ی ده‌ڵێت ئیسلام ئاینی توندوتیژی و شمشێره.. لێی بپرسین: ئه‌قڵت له‌کوێیه؟!..

* * *

پێغەمبەری خوا( ﷺ ) دەفەرموێت :

(استوصوا بالنسـاء خيراً) رواه البخاري

واتە : لـە گەڵ ئافرەتاندا چاکە کاربن.



## ئافرەت لەدیدی ئیسلامدا

ئەحمەد نەسیم سوسە، ئەندامی کۆمەڵی زانستی عیراقییە، بوەتە مسوڵمان، لەکتێبی (في طريقي إلى الإسلام)دا دەڵێت (پێویستە هەرگیز ئەوە لەیاد نەکەین، کە تا ئیسلام هات ئافرەت هیچ مافێکی نەبو، ئیسلام بۆ یەکەمین جار پایەی ئافرەتی بەرزکردەوەو، لەژیاندا وەکو پیاوان مافی پێدان) ١٨٧/١.

پاشان باس لە بارودۆخی ئافرەت بەر لە هاتنی ئیسلام دەکات و دەڵێت : (لە کۆندا ئافرەت لەلای عەرەب تەنیا کالآیەك بو، تەنانەت ناوهێنانیشی سوکایەتی بو! بەڵێ، بارودۆخ بەم شێوەیە بو کاتێك (محمد) -صلی الله علیه وسلم- هات ئیتر پێگەی ئافرەتی لە ئاسیادا لە کالآیەکی بێنرخ بۆ ئاستی کەسایەتییەکی ڕێزدار بەرزکردەوە، کە مافی ژیانێکی ڕێزداری هەیە، هەروەك چۆن مافی خاوەنداریەتی و میراتگرتنیشی هەیە) ٢/ ٤٢.

"مارسێل پۆزار، بیرمەندو یاساناسێکی فەرەنسییە، لە کتێبی(انسانیة الإسلام)دا دەڵێت : (شاعیرە موسڵمانەکان لە ڕێی ئیسپانیاوە مەسیحییەکانی ئەوروپایان فێری ڕێزگرتن لە ئافرەت کرد ) لا ١٠٨.

پاشان دەڵێت : ...قورئانی پیرۆز باسی ئەوەی نەکردووە، کەئافرەت وای لە پیاوکردووە تاوانە بنچینەییەکە -خواردنی بەری درەختەکە ئەنجام بدات- وەك ئەوەی لە سفری تەکوینی تەوڕاتدا باسکراوە، هەروەها بیروباوەڕی ئیسلامی هیچ دەستەواژەیەکی وای بەکارنەهێناوە، کە لە پلەوپایەی ئافرەت کەم بکاتەوە، وەك



چۆن پیاوانی کڵێسا ئافره‌ت به‌سه‌ربازو یاریده‌ده‌ری شه‌یتان داده‌نێن، ته‌نانه‌ت قورئانی پیرۆز سیفاتی ره‌وشت به‌رزو ته‌واوێتی ده‌داته پاڵ دو ئافره‌ت : هاوسه‌ری فیرعه‌ون (ئاسیه خاتون) ومه‌ریه‌می کچی عیمرانی دایکی عیسا مه‌سیح(علیه السلام)لا١١٣.

هه‌روه‌ها پۆزار ده‌ڵێت : (قورئانی پیرۆز و موحه‌مه‌د ئه‌وه‌یان سه‌لماندووه، که‌پارێزه‌ری مافی ئافره‌تن وڕێناده‌ن ماف خوراوبێت)لا١٤٠ .

ڕۆجێرگارودی، بیرمه‌ندێکی فه‌ره‌نسی ناسراوه‌و، یه‌کێکه له گه‌وره به‌رپرسانی پێشوی حیزبی شیوعی فه‌ره‌نسی بوه‌ته موسڵمان و له‌کتێبی(دعوة الإسلام)داده‌ڵێت : (قورئان ئافره‌ت به‌به‌رپرسی یه‌که‌می تاوان دانانێت )لا٨٧.

پاشان ده‌ڵێت: (..ئه‌گه‌ر به‌راوردێکی یاساکانی قورئان به‌یاساکانی کۆمه‌ڵگاکانی پێشو بکه‌ین ئه‌وا درك به پێشکه‌وتنێکی به‌رچاوده‌که‌ین، به‌تایبه‌ت له ئه‌سینا و ڕۆمادا، که ئافره‌ت تێیاندا مـــاف خـورابو)لا٨٧.

هه‌روه‌هاده‌رباره‌ی مافی ئافره‌ت له ئیسلامدا ده‌ڵێت : (له ئیسلامدا ئافره‌ت مافی ئه‌وه‌ی هه‌یه به‌ئاره‌زوی خۆی مامه‌ڵه به‌ماڵ وسامانییه‌وه بکات، له کاتێکدا ئه‌و مافه له ڕێبازه‌کانی ڕۆژئاوادا–به‌تایبه‌تی فه‌ره‌نسا، تا سه‌ده‌ی نۆزده‌و بیسته‌م–نه‌بو، هه‌رچی مافی میراته، ڕاسته ئافره‌ت نیوه‌ی پیاوی هه‌یه، بـه‌ڵام له به‌رانبه‌ردا هه‌مو ئه‌رکێك (به‌تایبه‌تی ئـه‌رکـی یارمه‌تیدانی ئه‌ندامه‌کانی تری خـێزان) له‌ئه‌ستۆی پیاودایه بـه‌ڵام ئافره‌ت هیچ کـام لـه‌م جۆره ئه‌رکانه‌ی له‌سه‌ر نییه، له هه‌مان کاتدا قورئان مافی داواکردنی ته‌لاق ده‌داته ئافره‌ت، له کاتێکدا تا دوای(سـێـزده ســه‌ده)ئافره‌ت له ڕۆژئاوادا ئه‌و مافه‌ی پێنه‌درا)لا٧٨–٧٩.

*هاملتۆن ئه‌لیکسانده‌ر جه‌ب، پێشه‌وای ڕۆژهه‌ڵاتناسه ئینگـلیزه‌کان، له کتێبی(المحمدية)داده‌ڵێت: (ئه‌وه‌ی هه‌مو جیهان دانی پێداده‌نێت ئه‌وه‌یه، که ئه‌و محمد

(ﷺ ) پلەوپایەو پێگەی شـەرعی وکۆمەڵایەتی بەرزکردۆتەوە)لا٣٣.

*گۆستاف لۆبۆن، پزیشك ومێژونوسی فەرەنسی، لە کتێبی (حضارة العرب)دا دەڵێت : (بنچینەکانی میرات، کە لەقورئاندا هاتون) زۆر دادگەرانەن، ئەمەش بە بەراوردکردنی بەیاساکانی فەرەنسی وئینگلیزی بەڕۆشنی دەردەکەوێت، ئەوەی کە شەریعەتی ئیسلامی مافی تەواوی داوەتە هاوسەرەکان-ئەوانەی، کەدەڵێن مسوڵمانان بەباشی مامەڵەیان لەگەڵداناکەن- بەڵام ئیسلام مافی تەواوی لە میراتدا داونەتێ، کە هاوشێوەی لە یـاسـاکانی ئێمەدا نییە)لا٣٨٩.

هەروەها دەربارەی بەرزی پلەوپایەی ئافرەت لەشەریعەتی ئیسلامدا دەڵێت : (...ئیسلام پلەوپایەی ئافرەتی بەرزکردەوە، بەپێچەوانەی ئەو قسە دوبارەو قەوانە کۆنانەی کوێرانە لێدەدرێنەوە ...باشترین ڕێگاش بۆ درك کردن بە کاریگەری ئیسلام لە سەر ماڵی ئافرەتانی ڕۆژهەڵات ئەوەیە سەرنجی بارودۆخی ئافرەتان بەر لە هاتنی قورئان و دوای قورئان بدەین )لا ٤٠١.

پاشان دەڵێت : (ئیسلام ئافرەتی زۆر بەرزکردۆتەوە و ئێمەش یەکەم کەس نین، کەبەرگری لەو ڕایە دەکەین، بەڵکو زۆر کەسانی دی بەر لە ئێمە ئەو کارەیان کردووە)لا٤٠٥.

*ئیفلین گۆبۆڵد، کچە خانەدانێکی ئینگلیزییە، موسڵمان بوە، لە کتێبی(البحث عن الله )دا دەڵێت: (ئافرەتانی مسوڵمان بەهیچ جۆرێك لە مەیدانی زانست و زانیاریدا لە پیاوان کەمترنەبورن، ئەوەتا زانای ئافرەتی مسوڵمان لەبواری فەلسەفە و مێژو و ئەدەب و شیعرو هەمو بوارەکانی ژیان هەڵکەوتوون)لا٥١.

پاشان دەڵێت : (کاتێك ئیسلام هات ئازادییەکانی بۆ ئافرەت گێڕایەوەو کردیە هاوشانی پیاو، بەوەی هەمان مافەکانی ئەوی هەیە و هەمان ئەرکی ئەویشی لەسەرەو هیچ فەزڵ و گەورەییەکی بەسەردا نییە، تەنیا بەهێزی بازو و کارکردن وبیرتیژی



نەبێت، ئیتر بەمە مافی سەرپەرشتی کردنی هەیە و بەهێزی بازوی پارێزگاری لێدەکات و لەبەرهەمی دەستی خۆی پێدەبەخشێ..هەروەها خوای پەروەردگار لە کاروبارەکانی ژیاندا هەمان مافی داونەتێ لەتەوبەکردن وپاداشت و گەیشتن بەپلە بەرزەکانی دنیاو دوارۆژ..)لا ٨١-٨٢.

پاشان دەڵێت: (ئەگەر پیاو بەرگەی قورسییەکانی ژیان و ماندوێتی کارکردن بگرێت و لاشەو لاری تێك بچێت لە پێناو ژیانی خۆی و هاوسەرەکەیدا ژیانی بەخت بکات، ئەوە تۆزقاڵێکیش لەوە کەمتر نییە، کە ئافرەت دڵسۆز بێت بۆ هاوسەرەکەی وکاروبارەکانی ماڵەوەبەباشی ڕاپەڕێنێت)لا ٨١-٨٢.

پاشان گۆبۆلد دەربارەی ئەو درۆ و دەلەسانەی هەندێ نوسەر دەربارەی ئافرەت لە ئاینی ئیسلامدا دەیخەنەڕو دەڵێت: (خاتو(ماری مۆنتکاد) هاوسەری باڵیۆزی بەریتانیا لەتورکیا لە پەیامێکدا بۆ خوشکەکەی نوسیبوی: ( دەڵێن ئافرەتانی مسوڵمان دورەپەرێزو داخراون، بەڵام من دەمەوێ ئەمە بەدرۆ بخەمەوە، چونکە نوسەرانی ئەورووپا هەوڵ نادەن بە راستی بگەن و بەدوایدانگەڕێن ..من لەگەڵ ئافرەتانی مسوڵماندا ژیاوم و شتی وا بونی نییە، من گوێبیستی دەنگوباس و ڕوداوەکانیان و شێوازی ژیانیانم، ئەوەی بەچاوی خۆم دیومە قسەی هەمو نوسەرانی ئەورووپا بەدرۆدەخاتەوە)لا ٨٥.

هەروەها دەربارەی هاندانی ئیسلام بۆ فێربونی ئافرەت و داواکردنی زانست دەڵێت : (نەزانی ئافرەتانی مسوڵمان لەگەڵ فەرمانەکانی پێغەمبەری ئیسلامدا دژیەکن، چونکە پێغەمبەری خوا فەرمانی داواکردنی زانستی بە ئافرەتانی کردووە و باوەڕبون بە نەزانی لەلای مسوڵمان بەکارێکی نەشیاو دادەنێت و بەتوندی ڕوبەڕوی ئەو جۆرە بیروباوەڕە بوەتەوە، بەمەش هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە)لا ٨٦.

*لۆرافیشیا فاگلێری، کچە توێژەرێکی ئیتاڵییە، لە کتێبی ( دفاع عن الإسلام)دا



دەڵێت : (بۆ پارێزگاری کردن و ڕێزگرتن له دەستدرێژی کردنەسەری، لە سەر ئافرەتی موسڵمان پێویستکراوه حیجاب بکات و خۆی داپۆشێت، جگه لەو بەشانەی، که لەبەر پێویستی ڕەها دەرخستیان ڕەوایه، وەك چاوەکان و دەست و پێ ئەمەش بێرێزی کردن، یاخود سنووردارکردن و کپ کردنەوەی ویستی ئافرەتان نییه، بەڵکو بۆ پاراستنیانه لە ستەم و چاوی تەماعکاری پیاوان )لا۱۰۳.

*ویل دیورانت، فەیلەسوف و مێژونوس و نوسەرێکی ئەمریکییه، له کتێبی (قصةالحضارة)دا، دەربارەی مافەکانی ئیسلام بۆ ئافرەت دەڵێت :

١- ئیسلام پێگەی ئافرەتی لە وڵاتە عەرەبییەکاندا بەرزکـردوە.

٢- دیـاردەی زیندەبەچاڵکردنی ئافرەتانـی لــه ناوبـرد.

٣- لە مافە دادگاییەکان و ئازادی ڕەفتارکردن بەماڵ و سامان ئافرەت وپیاوی یەکسان کرد.

٤-مافی ئەوەی داوەتێ، کە لەهەربوارێکی ڕەوادا کاربکات وماڵ و سامانەکەشی بۆ خۆی بێت.

٥- میرات دەگرێت ومافی مامەڵەکردنی تەواوی بە سامانەکەی هــەیه.

٦- دیاردەی مانەوە و گواستنەوەی ئافرەتانی لە باوکانەوە بۆ منداڵەکان لەناوبرد.

٧- مافی ئەوەی داینکرد، کە ئافرەت نیوەی ئەندازەی میراتی پیاو بگرێت.

٨- قەدەغەیکرد ئافرەت بە زۆرەملێ مارەبکرێت.٦٠\١٣.

پاشان دەڵێت : (پلەو پایەی ئافرەتی مسوڵمان بە شتێکی زۆرگرنگ لە پێگەی ئافرەتانی وڵاتانی ئەورووپا جیادەکرێتەوە، ئەویش ئەوەیە، کە ئافرەت ئازادی تەواوی هەیەلە مامەڵەکردن بەو ماڵ وسامانەی هەیەتی و نەهاوسەری نە هیچ کەسێك هیچ مافێکیان لەمافی ئەو دانییه).١٤٠\١٣.

# حیكمەتی چەندژنیی

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴾ النساء: ٣ واتە: وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن، لە مارەیی ئەو ئافرەتە بێباوكانەدا مارەیان مەكەن ئەوە مارە بكەن لەو ئافرەتانەی حەلاڵن بۆتان دو دو یان سیان سیان یان چوار چوار، جا ئەگەر ترسان دادگەر نەبن، ئەوا یەك ئافرەت مارە بكەن، لە ئافرەتە ئازادەكان یان ئەو كەنیزەكانەی كە موڵكتانن و ئەوە نزیكترە كە ستەم نەكەن.

* * *

﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوا أَن تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِن تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ النساء: ١٢٩ واتە: ئێوە هەرگیز ناتوانن لە نێو ژنەكانتاندا دادپەروەر بن هەرچەندە سوربن و هەوڵبدەن جا كەواتە بە تەواوی خوار مەبنەوە لە هاوسەری یەكێكیان، بەو هۆیەوە وازبهێنن لەوەی تریان وەك هەڵواسراوی لێبێت، نە ئەوەی مێردی هەبێت نە بەرەڵا كرابێت، وە ئەگەر بسازێن و پارێزكار بن، ئەوا بەڕاستی خوا هەمیشە لێبوردە و میهرەبانە.

* ڕۆجێرگارودی، بیرمەندێكی ناسراوی فەڕەنسییە و یەكێكە لە گەورە



بەرپرسانی پێشوی حیزبی شیوعی فەرەنسی، مسوڵمان بوە، لەکتێبی(وعود الإسلام)دا دەڵێت : (قورئان چەندژنیی بڕیارداوە بەڵام ئەو دیاردەیە لەپێشتریشدا هەبووە، ئەوەی ئیسلام کردویەتی دانانی چەند بەندوبارێکە لەسەری، وەکو: دادگەری تەواو لە چاودێری کردن و پارەپێدان و خۆشەویستی و پێوەندی سێکسی، ئەو ڕێسایانەیش ئەگەر وەکو خۆیان جێبەجێ بکرێن-چەندژنیی دەکاتە کارێکی مەحاڵ!)لا ٨٠.

*هێنری دێ کاستری، ئەفسەرە بە پلەی (موقەددەم) لە لەشکری فەرەنسیدا، لە کتێبی(الإسلام : خواطر و سوانح)دا دەڵێت : (خەڵك زۆرڕەوی دەکەن لە زیانەکانی چەندژنی لەلای مسوڵمانان، ئەگەر نەڵێین لەو قسانەیاندا ڕاست ناکەن، چونکە ئیسلام نەبو، کە لەڕۆژهەڵاتدا دیاردەی ئابڕوبەری داهێنان، بەڵکو کاری لەسەر چاککردن و جوانکردنیان کردووە)لا٥٦.

ویلیام مۆنتگۆمری وات، ڕۆژهەڵاتناسێکی هاوچەرخی بەریتانییە، ڕاگری بەشی توێژینەوەی زانستە عەرەبییەکانی زانکۆی (ئەدنبرا)یە، لەکتێبی (محمد في المدينة)دا دەڵێت : (..چەندژنیی بوار بۆ زۆر ئافرەت دەڕەخسێنێ تا بە سەربەرزی هاوسەرگیری بکەن و سنورێکیش بۆ چەوساندنەوەی بێوەژنان دادەنێت..)لا٤٢٣.

لۆرا فیشیا فاگلێری، کچە توێژەرێکی ئیتاڵییە، لەکتێبی (دفاع عن الإسلام) دادەڵێت: (..تائێستایش هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەرئەوەی، کەچەندژنیی لەڕوی کۆمەڵایەتییەوە خراپە و بەربەستی بەردەم پێشکەوتنە..دەتوانین بڵێین و پێداگربین لەسەر ئەوەی، کە لەهەندێ بارودۆخدا دەبێتە پێویستییەکی کۆمەڵایەتی، یاخود لەکاتی دروستبونی بارودۆخێکی تایبەتیدا، وەك ئەوەی ژمارەیەکی زۆری پیاوان لەجەنگدا بکوژرێن)لا٩٧..

دواتردەڵێت : (..لەڕاستیدا شەریعەتی ئیسلامی-کە ئەمڕۆ وا دەرەکەوێت، کە



کارئاسانی زۆری لەو بابەتەدا کرووە چەندژنیی بەچەند بەندوبارێکی دیاریکراو سنوردار کردووە، لەکاتێکدا بەر لە هاتنی ئیسلام بە شێوەیەکی ڕەها بووە و داماڵراو بووە لە هەموبەندوبارێك، سەرەڕای ئەوەش ئیسلام چەندمافێکی وای داوەتە ئافرەت، کە بەهیچ جۆرێك پێشتر بونیان نەبو) ل٩٨.

* د.ئەحمەد نەسیم سوسە، ئەندامی کۆمەڵەی زانستی عێراقی، مسوڵمان بوە، لە کتێبی : (في طريقي إلى الإسلام)دا دەڵێت: (ئەوەی دەیسەلمێنێت، کە ئیسلام ئاینیی هەمیشەییەو بۆ هەموکات و شوێنێك هاتووە، ئەوەیەدەبینین چەندژنیی لەزۆر جێگای جیهانی ئیسلامیدا پەیڕەو ناکرێت، ئەمەش بەهۆی ئەو پێشکەوتنەی بەسەر زۆر لە کۆمەلأنی خەڵکدا هاتووە، چونکە بارودۆخی ئابوری و بارودۆخی ئێستای خەڵك، وایکردووە جێبەجێکردنی ئاستەم بێت.. ئەمەو ئەگەر لە ئێستادا ڕێژەی سەدی ئەو مسوڵمانانە وەربگرین، کەزیاتر لە ژنێکیان هەیە ئەوا دەبینین، کە ڕێژەیەکی یەکجار کەمە) ٢/١٤٥,١٤٤.

*لایتەر، توێژەرێکی ئینگلیزییە، دکتۆرای لە شەریعەت وفەلسەفە و ئایینناسی(لاهوت)هەیە، لە کتێبی (دين الإسلام)دا دەڵێت: (هەرچی بابەتی چەندژنییە..بەچاوپۆشین لە سودە ڕاستەقینەکانی، لەهەمانکاتدا ژمارەی ئەو ئافرەتانە کەمدەکاتەوە، کە بێ هاوسەر دەمێننەوە، بەتایبەتی لەو شوێنانەدا، کە تێیاندا ژنان لە پیاوان زۆرترن، بەچاوپۆشین لەوەی، کە ڕێژەی ئافرەتانی سۆزانی کەم دەکاتەوەو ڕێ لە دروستبونی منداڵی زینا دەگرێت، ناتوانین نکۆڵی لەوە بکەین، کە زۆرینەی مسوڵمانان تەنیا یەك هاوسەریان هەیە و ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پەیڕەوی فرمانەکانی ئیسلام)ل١١

هەر لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێت: (...محمد لە نێوگەلێکدا لە دایك بو، کە لەدایك بونی ئافرەت تێیدا کارەساتێکی گەورە بوو، لە بەر ئەوە زیندەبەچاڵیان



دەکرد، پیاوانیش سنورێکی دیاریکراویان نەبو لە هاوسەرگیریدا و، ئافرەتانیان وەکو کاڵایەك تەماشا دەکردو وەکو میرات دوای مردنی مێردەکەی بە میرات دەگیرا بەڵام ئیسلام سنورێکی بۆ ئەمە دانا، ئیتر پیاو ناتوانێت لە چوار ژن زیاتر بهێنێت، ئەوەش بەمەرجی ئەوەی لە هەمو شتێکدا یەکسانییان لە نێواندا بەرپا بکات، تەنانەت لە خۆشەویستیشدا، ئەگەر تواناى جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەشی نەبو، ئەوە نابێت لە یەك ژن زیاتری هەبێت ..)لا١١.

هەروەها دەربارەی ئەوەی، کە بنچینە لە هاوسەرگیریدا یەك ژنە، دەڵێت : (..هەرکەسێك لێی وردبێتەوە –واتە لە ئیسلام – بۆی دەردەکەوێت، کە ئیسلام هانی مارەکردنی تەنها یەك ئافرەت دەدات و پێگەی ئافرەتی زۆر بەرز ڕاگرتووە، ئەو ئافرەتەی پێشتر خاوەنی هەبو ئێستا خاوەنی خۆیەتی، مافەکانی پارێزراون و هەمو شتێك لەبەرژەوەندی ئەو دایە)لا١٢.

*ئیتین دینێت، ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسییە، لە کتێبی : (أشعة خاصة بنور الإسلام)دا دەڵێت : (ئایا ڕاستە، کە ئایینی مەسیحی بەبڕیارە زۆرەملێکەی بۆ یەك ژنی و پێداگیری لەسەر جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە توانیویەتی ڕێ لە چەندژنیی بگرێت؟! کەسێك هەیە بتوانێ ئەمە بڵێت و بەخۆی پێنەکەنێت و پێی پێنەکەنن؟!)لا٣٢.

پاشان دەڵێت : (..چەندژنیی یاسایەکی سروشتییەو تاجیهان ماوە ئەو یاسایەش هەردەمێنێت، بۆیە ئەو مەبەستەی مەسیحییەکان هەوڵیان بۆ دەدا پێی نەگەیشتن، بەڵکو بەپێچەوانەوە، خراپ بەسەریاندا شکایەوە، ئیتر هەمو جۆرەکانی ئارەزووبازی هاتەکایەوە..تیۆری یەك ژنیی، کەمەسیحییەت داوای دەکات، زۆرشتی خراپی لێیەیدا دەبن، کە دەتوانین لە (سێ) ئاکامی مەترسیدار و کارەساتدا کورتیان بکەینەوە، ئەوانیش: داوێنپیسی و قەیرەیی و منداڵی ناشەرعین! ئەو پەتا کۆمەڵایەتییە



بەدڕەوشتیانە، بەهیچ شێوەیەك لەوجێگایانەدابونیان نەبو، کەشەریعەتی ئیسلامییان بەتەواوی تێداجێبەجێ دەکرا، بەلاَم دوای تێکەلَ بونی کۆمەلَگا ئیسلامییەکان بەکۆمەلَگا ڕۆژئاواییەکان ئەو پەتا کوشندەیە بۆ ئەوانیش گوازرایەوە..)لا٣٣

*عەبدوللاَ کویلیم، بیرمەندێکی ئینگلیزە و مسولَمان بوە لەکتێبی (العقیدةالإسلامیة)دا دەلَێت : (موسا چەندژنیی قەدەغە نەکردووە، داوودیش خۆی پەیڕەوی کردووە وبەڕەوای داناوە و، لەئینجیلیشدا تائەو ماوانەی دوایی قەدەغەنەکرابو..بەلاَم محمد هات و زۆڕەوی کردنی لەو بوارەدا سنوردارکرد و، بەهەرجۆرێك بێت چەندژنیی لە دەستوری ولاَتە ئیسلامییە پێشکەوتووەکان دا ڕێسایەکی ڕیزپەڕە..بەلاَم سەرەڕای ئەو قسە بێ بنەمایانەی دەربارەیەوە دەکرێن سودو کەلَکی خۆی هەیە و یارمەتیدەری ئافرەت بووە تا ژیانی پارێزراو بێت.. دەبێ ئەوەش بلَێین، کە چەندژنیی حەوجار حەوجار سودمەندترو کەم زیانترە لەو خراپەکارییەی گەلانی مەسیحی لەژێر پەردەی شارستانیەت و پێشکەوتنخوازیدا ئەنجامی دەدەن ..بالەپێشدا درەختی نێوچاوی خۆمان دەربێنین ئینجا باز بدەینە زلی ناو چاوی خەلَك) لا ٢٢-٢٣ )(ئیلەر لەوتارەکەیدا)..

*ئیمیل دێرمینگهەم : لە کتێبی(حیاة محمد)دا دەپرسێت: (کامیان باشترە : چەندژنیی شەرعی و ڕەوا، یان چەندژنیی نهێنی و ناڕەوا؟ بێگومان چەندژنیی دەتوانێت دیاردەی مەترسیداری قەیرەیی لە ڕەگوڕیشە هەلَکێشێت)لا ٣٣١.

# هەڵوەستەیەك لەسەر چەندژنیی

پێشەوا محمدی ئەبوزەهرە دەپرسێ : (یان چەندژنیی ڕەوا یان چەند دۆستی پەنهان!) پاشان دەڵێت : (..چەندژنیی ئیسلام لە بەرانبەر خیانەتی هاوسەری ئەوروپایە، بۆیە ئەگەر چەندژنیی قەدەغەبکەین دەبێت چاوەڕوانی زیادبونی خیانەتی هاوسەری بکەین..) گۆڤاری(العربی)ژمارە(٣٠) لا٨٦-٨٧.

*بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە، کە زۆر خەڵك دەبینی چەندژنیی ئیسلام، کە خودا بەڕەوای داناوە بەخراپ دەزانن، کەچی چەند دۆستی بەخراپ نابینن و زینا و داوێنپیسی بەئاشکرا و نهێنی بەڕەوا دەبینن و هیچ سنورێکی خودا ناپارێزن، هەروەها درك بە مەترسی بێ ناسنامەیی و ئەو نەخۆشیانەش ناکەن، کە بەهۆی ئەو پێوەندییە نا شەرعییانەوە پەیدادەبن...

*هەروەها ئەوەی زیاترجێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە، کە چەندژنیی لە ئایین و ڕێساکانی خۆشیاندا هەیە، بەڵام پێی نازانن و کوێرانە ڕەتی دەکەنەوە. مامۆستا(محمد فوئاد هاشمی)، کە زانایەکی مەسیحییە و مسوڵمان بوە، دەڵێت : (چەندژنیی تا سەدەی نۆزدەهەم لەئایینی مەسیحیدا بونی هەبو) کتێبی : (الادیان فی کفة المیزان)لا١٠٥-١٠٦.

*لەهەمو ئەوانەش سەیرتر ئەوەیە، کە ئیسلام تاکە ئاینە ڕێژەی چەندژنیی دیاریکردووە و بەدادگەریی سنورداری کردووە، ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی، کە بنچینە لە ئیسلامدا(یەك ژن)یە، سەرەڕای ئەوەش دوژمنانی ئیسلام خۆیان کوێردەکەن ودەیانەوێ بەزۆری بیسەلمێنن، کە بنچینە لە ئیسلامدا (چەند ژنی)یە

وپێداگری لە سەر ئەوە دەكەن، كە هەردەبێت ددان بەوەدا بنێین، كە زیانی كۆمەڵایەتی زۆری هەن ..خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴾ النساء: ٣ . واته: وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن، لە مارەیی ئەو ئافرەتە بێباوكانەدا مارەیان مەكەن ئەوە مارە بكەن لەو ئافرەتانەی حەلاڵن بۆتان دو دو یان سیان سیان یان چوار چوار، جا ئەگەر ترسان دادگەر نەبن، ئەوا یەك ئافرەت مارە بكەن، لە ئافرەتە ئازادەكان یان ئەو كەنیزەكانەی كە موڵكتانن و ئەوە نزیكترە كە ستەم نەكەن.

دادگەریش بەوەدەكرێت، كە هەمو هاوسەرەكان لەرووی: پشك و ماف و خەرجی و پۆشاك و شوێنی نیشتەجێبون، یەكسان بن، پاشان خوای پەروەردگار لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت. : ﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوا أَن تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ۖ فَلَا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ ۚ وَإِن تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ النساء: ١٢٩. واته: ئێوە هەرگیز ناتوانن لە نێو ژنەكانتاندا دادپەروەر بن هەرچەندە سوربن هەوڵبدەن جا كەواتە بە تەواوی خوار مەبنەوە لە هاوسەری یەكێكیان، بەو هۆیەوە وازبهێنن لەوەی تریان وەك هەڵواسراوی لێبێت، نە ئەوە مێردی هەبێت نە بەڕەڵا كرابێت، وە ئەگەر بسازێن و پارێزكار بن، ئەوا بەڕاستی خوا هەمیشە لێبوردە و میهرەبانە.

*ئەوان پێشتر لەئیسلامدا تەڵاقیشیان بەخراپ دەزانی و قەدەغەیانكردبو، بەڵام ئەوەتا ئەمرۆ دركیان بە حیكمەتی تەڵاق كردووەو بە ناوێكی تر ڕەوایان كردووە و لە كتێبەكەیاندا هەر بە حەرامی ماوەتەوە!..لەوانەیە هێشتا دركیان بەوە نەكردبێت، كەچارەسەری هەموو كێشەكانیان لەڕێساكانی ئیسلامدایە و، ئەمرۆ– سبەی



هەردەبێت بۆ چارەسەری کێشەکانیان لە نێو یاسا جوان و دادگەرەکانی ئیسلامدا بەدوای چارەسەردا بگەڕێن .

*پاشان، کارنەکردن بە یاسا خوداییەکان و دانانی ڕێسای زەمینی لە جێگایاندا، جگە لە ئەنجامی نەخوازراوو زیانبەخش و دارمانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان هیچی تری لێ پەیدانابێت، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەو کۆمەڵگایانەی یاساخوداییەکانیان بەڕێسا و زەمینییەکان گۆڕیوە پێشکەوتنی ماددیان بەخۆوە نەدیوە، لەڕوی پێشکەوتنی ماددییەوە سەرکەوتوبوون و ئەوروپاش باشترین بەڵگەیە و ئەو وێنەیەی بەرجەستەکردووە پێشکەوتنی ماددی و داتەپینی ڕەوشت و بەها بەرزکان، ئەگەربێین بە شێوەیەکی مەنتیقی سادەوساکار باسەکە بخەینەڕو و گفتوگۆی لەسەر بکەین، دەڵێین: وادابنێ خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان-جولەکەو مەسیحی-ددان بەوەدانانێن، کە ئایینەکەیان دەستکاری کراوە و گۆڕاوە، لە کاتێکدا لە ژێر سایەی ئەو گۆڕینە چەند حوکمێك داهێنراون، کە ئەوەی خودا حەلاڵی کردووە حەرامی دەکات و ئەوەیش، کە خودا حەرامی کردووە حەلاڵی دەکات، جا کاتێ دەتەوێ بەبەڵگەی عەقڵی- بەبێ گەڕانەوە بۆ بەڵگەی شەرعی- بۆیان بسەلمێنی، کە ئەوان حەلاڵی خودایان حەرام کردووە و حەرامیشیان حەلاڵ کردووە، ئەوا مەنتیق پێمان دەڵێ با سەیری کۆمەڵگاکانیان بکەین، کە ئەو حوکمانەیان تێداپەیڕەو دەکرێت و ببینین چ شوێنەوارێکی لێپەیدادەبێت، لە دو ڕوی مەنتیقیدا ئەمە دەخەینەڕو :

**یەکەم : ئایائەو یاسایانە سودی بۆیان هەیەیا زیان؟ :**

بۆنمونە: زینا، کە لە شوێنی چەندژنی دایە، مەی خواردنەوە، قەدەغەکردنی تۆڵەی دادگەرانە(القصاص)- قەدەغەکردنی تەلاق...تاد.



**دووەمیان : ئایا دەتوانی بەکرداریش ئەوحوکمانە جێبەجێ بکەن؟ :**

بۆنمونە : ئەگەر کەسێك زللەیەکی لە ڕومەتی چەپت دا ڕومەتی ڕاستیشی بۆڕابگری- یاخود ڕەهبانیەت (ژن نەهێنان و شونەکردن) و...تاد. ئەگەر ئەو یاسایانە سودیان بۆیان هەبێت و بتوانن جێبەجێیان بکەن، ئەوا دیارە هەر یاسا خوداییەکانن و بێگومان سودبەخشن، بەڵام ئەگەر وانەبێت، بێگومان دەستکاری کراون و گۆڕاون و لە یاسای خودایی بونەتە ڕێسای زەمینی.

"بامرۆڤی عاقڵ دەحوکمەکانی ئیسلام ڕامێنێت و کاریگەرییەکانی لە کۆمەڵگادا هەڵسەنگێنێت و لەگەڵ ڕێساکانی تردا بەراوردیان بکات ئاخۆ کامیان بۆ ئێمە شیاوتر و پڕسودتر و بەسۆزترن ؟ و کامیان لەگەڵ فیترەتی ئێمەی مرۆڤدا دەگونجێت؟!.. ئیسلام چەندین جار و لەهەمو بوارەکانی ژیاندا ئەوەی سەلماندووە، کە تاکە ئاینە حوکمی وای لەخۆگرتووە، کە لەگەڵ بەرژەوندییەکانی ئێمەی مرۆڤدا تێکناگیرێن و هیچ ڕێگایەکی تر جگەلە ئیسلام نییە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی دامەزراو لەسەر بنچینەی دادگەری و زانست و بەزەیی –بەڵێ! هەر ئیسلام چارەسەربووەو هەرئەویشە کلیلی چارەسەری ئایندەی گیروگرفتەکان، هەتا ئەگەر نەیارانیش نەیانەوێ.

خوای پەروەدگار دەفەرموێت : ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ﴾ الأنعام: ٣٨

واتە : هیچ گەڕۆکێکی گیانلەبەر نییە لە زەویدا و هیچ باڵندەیەك نییە کە بە دو باڵ دەفڕێت، مەگەر وەك ئێوە ئومەتانێکن، لەم کتێبەدا(لوح المحفوظ، یان قورئاندا)، هیچ شتێکمان فەراموش نەکردووە، پاشان ئەوانە لە ڕوژی دواییدا لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە.

# زانست لە دیدی ئیسلامدا

(خاچپەرستان دژایەتی شتێکیان کرد کە دەبو لە بەردەمیدا زەلیلانە کڕنوش بەرن، لە بەردەم شارستانییەتێك کە سەدەی نۆزدەمی ئێمە بەبەراورد لەگەڵیدا زۆر هەژار و دواکەوتووە) فریدریك نیچە لە کتێبی (عدوّ المسیح، لا ٦٠.

* * *

(.. ئیسلام لەوەدا ترسی لەسەرنییە کە بیر ئازاددەکات، بەڵکو سەرەڕای ئەوە هەمو بیروهۆش داگیردەکات) عەبدولحەکیم بەحلاق (أبحث عن هویة).

* * *

*گۆستاڤ لۆبۆن لە کتێبەکەی (حضارة العرب)دا دەڵێت: (ئیسلام لەهەمو ئایینەکانی تر زیاتر لەگەڵ دۆزینەوە زانستیەکاندا دەگونجێت و لەهەمو ئایینەکان زیاتر گرنگی بە پاکی دەرون و دادگەری و چاکەکاری و لێبوردەیی و... دەدات) لا ١٢٦.

پاشان دەڵێت: (گەلێکی وەکو عەرەبە مسوڵمانەکان لەمێژودا بەدی ناکەی، چونکە هەمو ئەو گەلانەی پێوەندییان بە عەرەبە مسوڵمانەکانەوە هەبوبێت ئەگەر بۆماوەیەکی کەمیش بوبێت بڕێکیان لەو شارستانییەتە هەر وەرگرتووە) لا ٥٨٥.

لەشوێنێکی دیکەشدا دەڵێت: (کاریگەری عەرەبە مسوڵمانەکان لە ڕۆژهەڵاتدا



بەتەنیا لە ئاین و زمان و هونەر خۆی نابینێتەوە، بەڵکو کاریگەری بەرچاویان لە ڕۆشنبیری و زانستیشدا هەبو)لا۵۹۱.

لە (لیبری)یەوە هاتووە، کە گوتویەتی: (ئەگەر عەرەبە مسوڵمانەکان لەسەر شانۆی مێژو دەرنەکەوتبان، ئەوا بوژانەوەی ئەوروپا بۆ چەند سەدەیەك دوادەکەوت)لا۵۹۱.

*ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی(د.ماکس مایرۆهۆف)دەڵێت: (..زانستە ئیسلامییەکان کە لە لوتکەدابون دەدرەوشانەوە وەك چۆن مانگ دەدرەوشێتەوە و توانی ئەو تاریکییەی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوروپای داگیرکردبو بڕەوێنێتەوە)تراث الاسلام، توماس ارنولد، لا٥٠٦.

*(د.مۆریس بوکای) لە کتێبی(القران الكريم والتوراة و الانجيل والعلم)دا دەڵێت: (سەرەتا هەستام بە دیراسەکردنی قورئانی پیرۆز، بەبێ هیچ ڕایەکی پێشنە و بە شێوازێکی بابەتیانە، ئامانجیشم زانینی ئاستی گونجانی دەقەکانی قورئان بو لەگەڵ زانستی هاوچەرخدا.. دوای لێکۆڵینەوەیەکی هۆشیارانەی دەقی عەرەبی، توانیم لیستێکم دەستبکەوێت، کە بەهۆیەوە گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە لە ڕوی زانستی هاوچەرخەوە قورئان هیچ زانیارییەکی تێدا نییە جێگای ڕەخنەگرتن بێت)لا١٥٠.

هەروەها دەڵێت: (لەسەرەتادا لایەنە زانستییەکانی قورئان منیان توشی سەرسوڕمان کرد، چونکە هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبوم، کە دەکرێ ئەو ئەندازە زۆر و جۆراوجۆرانەی بابەتی زانستیم دەستکەوێت و هەموشیان لەگەڵ زانستی هاوچەرخدا بگونجێن، ئەمەش لە کتێبێکدا کە بەر لە زیاتر لە سێزدە سەدە نوسراوە!.. لەسەرەتادا هیچ باوەڕێکم بە ئاینی ئیسلام نەبو و بەوپەڕی ئازادی و بابەتیانەو بەبێ هیچ حوکمێکی پێشین دەستم بە لێکدانەوەی دەقەکان کرد)لا١٤٥.

پاشان دەڵێت: (کاتێ لە قورئانم کۆڵییەوە بەتەواوی درکم بەو وەسفە



تێروتەسەلەی قورئان دەکرد کە بۆ زۆر دیاردەی سروشتی دەیکرد، بەڕاستی وردی هەندێك لەو وەسفانە منیان توشی سەرسوڕمان کرد، ئەو جۆرە شتە وردە تایبەتانەش تەنها لە دەقی ئەسڵی قورئاندا درکیان پێدەکرێت، ئەوە منی توشی سەرسامی کرد کە لەگەڵ هەمان ئەو دیدو بۆچونە دێتەوە کە ئەمڕۆ ئێمە بەرانبەر دیاردەیەك هەمانەو قورئانیش بەهەمان شێوە باسی کردووە، هەروەها هەرگیز لە توانای هیچ مرۆڤێکی سەردەمی محمد دا نەبووە کە بیرۆکەیەکی سەرەتاییشی دەربارەی ئەو دیاردانە هەبێت)لا١٤٥ .

هەروەها لە کتێبی(دراسة الكتب المقدسة في ضوء المعارف الحديثة)دا دەڵێت: (هەموکاتێك ئیسلام ئایین و زانستی وەکو دو جمك داناون، لە سەرەتادا ئەو گرنگییەی بە زانست دەدرا کەمتر نەبو لەو گرنگییەی بەو ئەرکانە دەدرا کە ئیسلام فەرمانی پێکردبون، جێبەجێکردنی ئەو بنچینەیەش بو بووەهۆی ئەو بوژانەوە گەورەیەی زانستەکانی سەردەمی شارستانییەتی ئیسلامی، کە دواتر لە سەردەمی بوژانەوەی ئەوروپادا ڕۆژئاوا سودی لێوەرگرت..)لا١٤١ .

پاشان (بۆکای)دەڵێت: (پێویستە ئەوەمان لەیادبێت کە لەسەردەمی گەورەیی ئیسلام–واتە لە نێوان سەدەکانی هەشت تا دوازدەی سەردەمی مەسیحیدا، کە چەندین کوێت و بەند خرابونە سەر پێشکەوتنی زانستی لە وڵاتە مەسیحییەکانماندا–ئا لەوکاتەدا چەندین توێژینەوەو دۆزینەوەی گەورەو گرنگ لە زانکۆ ئیسلامییەکاندا ئەنجام دەدران.. ئەوسا توێژەر ئامرازی ڕۆشنبیری زۆر چاکی لەبەردەستدابون..ئەوەتا لە قورتبە کتێبخانەی خەلیفە بەتەنیا چوارسەد هەزار کتێبی تێدابو..)لا١٤٠ .

هەروەها دەربارەی گەورەیی زانایانی مسوڵمان دەڵێت: (..دەستنوسی زۆرمان لەڕێی ئەدیبە عەرەبەکانەوە بۆ بەجێماون، کە کلتور و ئاستی ڕۆشنبیری وڵاتە ڕزگارکراوەکانمان بۆ دەردەخەن، بەڕاستی ئێمە قەرزاری ڕۆشنبیری و کلتوری



عەرەبین لە بواری بیرکاری و گەردونناسی و فیزیا و جیولۆجیا و زانستی ڕووەکی و پزیشکی و...تاد، بۆ یەکەمین جار زانست لە زانکۆ ئیسلامییەکاندا خاسیەتی جیهانی بونی بەخۆیەوەبینی، لەو سەردەمەدا خەڵك زیاتر لەو سەردەمەی ئێستامان بە ئایین کاریگەربون، بەڵام ئەوە ڕێگر نییە لەبەردەم ئەوەی کە لەیەك کاتدا باوەڕدار و زانا بن، زانست برای جمکی ئایین بو و پێویستە زانستیش هەردەم ئەو خاسیەتەی پێوە دیاربێت)لا ١٤٠-١٤١.

*لویس سیدیۆ، لە کتێبی (تأریخ العرب)دا دەڵێت: (لە سەدەکانی ناوەڕاستدا مسوڵمانان تاك بون لە: زانست و فەلسەفە و هونەردا و گەیشتبنە هەرکوێیەك ئەو زانستانەیان بڵاوکردونەتەوە و دواتر دزەیان کردە ئەوروپا، بۆیە ئەوان هۆکاری گەشەسەندن و بوژانەوەی ئەوروپا بون).

*هەروەها (مارتن پلێسەر)، کە لە پەیمانگای زانستە ڕۆژهەڵاتییەکانی زانکۆی فرانکفۆرت وانەبێژە، دەڵێت: (..ئەستەمە هەوڵێك یان بەرهەمێکی مسوڵمانان بدۆزیتەوە کە ڕۆژئاوا بەجۆرێك لە جۆرەکان پێی کاریگەر نەبوبێت)تراث الاسلام، دانراوی شاخت و بۆزۆس:٧٩/٣.

*ئەحمەد نەسیم سوسە، لە کتێبی(في طريقي الى الاسلام) باس لە ڕێبازی زانستی تاقیکاری لەلای مسوڵمانان دەکات و دەڵێت: (ئاشکرایە، کە ژیاری ئیسلامی دوربینی و بێداربونەوەی داهێناوە لاسایکردنەوەی وەلانا و دورکەوتەوە لە گومان، بەڵگە و تاقیکاری ئامرازی کارکردنی بون، بەمەش مسوڵمانان بنچینەی نەگۆڕیان بۆ زانستە دروست و پڕ سودەکان دانا و تاقیکردنەوە و تێبینی کردنیان کردنە بنچینەی توێژینەوە زانستییەکان و کوڵەگەی لێکوڵینەوە، بەجۆرێك کە یۆنانییەکان بە سەرقاڵبونیان بە فەلسەفە و توێژینەوە پێی نەگەیشتن، بەمەش مسوڵمانان کلتور و ڕۆشنبیرییەکی تایبەت بەخۆیان دروستکرد و فەلسەفەیەکی ئیسلامی سەربەخۆیان

بۆخۆیان بنیاتنا.. هەروەك چۆن بنچینەیان بۆ زانستە سروشتییەکان و بیرکارییەکان بە جۆرە جیاوازەکانییەوە دانا، بەمەش لەڕێگەی ئەوانەوە ئەو زانستانە گەیشتنە ئەوروپا)لا۱۰۲.

*لە وتەیەکی هاوشێوەدا(هێربێرت جۆرج وێلز) لە کتێبەکەی(موجز تأریخ العالم)دا دەڵێت: (..زانا عەرەبە کیمیاگەرەکان توانیان ڕێبازی زانستی تاقیکاری دابێنن کە لەوانەیە دەسەڵاتێکی وا بە مرۆڤ ببەخشێت کە لە جیهاندا وێنەی نەبێت و نەك هەر بەسەر جیهاندا بەڵکو لەوانەیە دەسەڵاتی بەسەر سەرەنجامی خۆشیدا هەبێت)لا۲۰٦.

هەروەها دەربارەی پلەوپایەی زانکۆ ئیسلامییەکان دەڵێت: (جیهانی ئیسلامی بە سەدەیەك یان زیاتر پێش ڕۆژئاوا کەوتبو، کۆمەڵێك زانکۆی گەورەیان دامەزراندبون، کە ڕوناکی ئەو زانکۆیانە دەرەوەی جیهانی ئیسلامیشی تا مەودایەکی دور ڕوناك دەکردەوە و فێرخوازان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و لەهەمو لایەکەوە بۆ خوێندن لەو زانکۆیانە دەهاتن)۳/٦٦٤.

*هەروەها جاك ریزلەر، کە توێژەرێکی هاوچەرخی فەرەنسییە دەڵێت: (کاتێك ژیاری پڕ شکۆمەندی ئیسلامی سەرنجی هەندێ لە پیاوانی ئایین و عەلمانی ئەورووپای مەسیحی ڕاکێشا و خەریك بون لە خۆشەویستی بۆ ئەو ئازادییەی ئەو زانکۆیانە هەیان بون بەرەو قورتبە و تولەیتلە و ئیشبیلیە دەچون تا لە وانەی ئەو زانکۆ ئیسلامیانە ئامادەبن)الحضارة العربية، لا١٥٤.

*هەروەها جۆن براند ترێند، کە یەکێکە لە پێشەوایانی مێژوی ئیسپانیا، دەڵێت: .(قوتابخانەکانی تولەیتلە لەهەمو لایەکی ئەوروپا فێرخوازی بۆ دەهاتن، ئەو فێرخوازانەش بەهۆی فێربونی زمانی عەرەبی..توانیان کتێب لە عەرەبییەوە وەربگێڕنە سەر زمانی لاتینی، بەوەش بەشداربون لە پێشکەوتنی زانستی لە جیهاندا.. بەڵێ جیهان



له قوتابخانه‌كانی سالرنۆ و بەغدا و دیمەشق و قورتبه و غەرناتەو مەڵەگەدا ڕۆشنبیری و زانستی له مسوڵمانان وەرگرت..)تأريخ العالم، سێر جۆن بلاّوی کردوتەوە. هامرتن: ٧٥٩/٥.

*خانمه توێژەری ئیتاڵی (لۆرا فیشیا فاگلیێری)له كتێبەكەیدا (دفاع عن الإسلام)دا پرسیارێك دەكات، دەڵێت: (چۆن دەتوانین بڵێین: ئیسلام گەشەسەندنی ڕۆشنبیری سەدەكانی ڕابردوی وەستاندووە، لەكاتێكدا دەزانین كه حوجره و قوتابخانەكانی ئیسلام ئەوسا چرای ڕوناكی بەخشی ڕۆشنبیری بون بۆ ئەوروپا كه لەسەدەكانی ناوەڕاستدا له تاریكیدا نقوم بوبون، هەروەها هزر و دیدی فەیلەسوفه عەرەبەكان گەیشته پێگەیەكی وا بەرز وای له زانایانی ڕۆژئاوا كرد كه شوێنپێی ئەوان بكەون!)ل١٣٠.

جارێكی تر پرسیار دەكات: (ئایا عەرەبەكان نەبون كه بۆ یەكەمین جار ڕێگای تاقیكاریيان داهێنا، به ماوەیەكی زۆر بەرلەوەی(بیكۆن) باس له پێویستی بكات؟!

پێشكەوتنی كیمیا و زانستی گەردونناسی و بلاّوكردنەوەی زانستی ئیغریقی و بەهێزكردنی زانستی پزیشكی و دۆزینەوەی یاسا جۆراوجۆرەكانی فیزیایی..ئایا هەمو ئەوانه له گەورەیی و شوێنەوارەكانی عەرەب نین؟!)ل١٣١.

*هەروەها (ئیڤلین گۆبوڵد)له كتێبەكەیدا(البحث عن الله) دا دەڵێت: (ئیسلام وەكو چرایەك بو بۆ زانست و زانیاری..(كۆلۆمبۆس) له زانكۆ ئیسلامیەكانی ئیسپانیا زانی كه زەوی بازنەییه.. ئەو زانكۆیانه پێشوازییان له هەمو فێرخوازان دەكرد، تەنانەت جولەكەو مەسیحییەكانیش، كه تێیاندا زانست و زانیاریان وەرگرت و بڕوانامەیان بەدەستهێنا)ل٩٢.

*هەروەها دكتۆر(ستانلی لین.بوڵ) كه زانایەكی شوێنەوارناسی میسرییه، دەڵێت: (..هەمو ئەو زانستانەی ئەوروپا له سەدەكانی ناوەڕاستدا بەدەستیان هێنا، له

فه‌لسه‌فه‌ى ئيغريقى و زانستى بيركارى و كيميا و گه‌ردونناسى و پزيشكى، هه‌مويان له سه‌رچاوه عه‌ره‌بييه‌كان وه‌رگيرابون كه وه‌رگێڕرابونه سه‌ر زمانى لاتينى)تاريخ العالم، سێر جۆن بلاَوى كردوته‌وه.هامرتن: ٤/٦٠٨.

*بارۆن كارا دى فۆ، ڕۆژهه‌لاَتناسێكى فه‌ره‌نسى ناسراوه له په‌يمانگاى كاسوليكى پاريس وانه‌ده‌لێته‌وه، ده‌لێت: (به‌ڕاستى عه‌ره‌به‌كان گه‌وره‌ترين دۆزينه‌وه‌ى زانستييان ئه‌نجامدان، ئه‌وان فێريان كردين (سفر) به‌كاربێنين و (جه‌بر)يان كرده زانستێكى ته‌واو و پێشيان خست و بنچينه‌كانى زانستى ئه‌ندازيارى شيكارييان دامه‌زراند و ئه‌وان زانسته‌كانى سێگۆشه‌ى كراوه‌و وه‌ستاو و..يان دۆزينه‌وه)تراث الإسلام، سير تۆماس ئارنولد، ل٥٦٣.

پاشان ده‌لێت: (عه‌ره‌به‌كان ژيانى عه‌قلّى و توێژينه‌وه‌ى زانستييان به‌ره‌و پێگه‌يه‌كى به‌رز برد، له‌وكاته‌ى جيهانى مه‌سيحى له هه‌ولّدابو بۆ ده‌ربازبون له كۆت و به‌نده‌كانى دواكه‌وتويى)ل٥٦٣.

*خانمه توێژه‌رى ئه‌لّمانى(زيگريد هوتكه) له كتێبه‌كه‌يدا(شمس العرب تسطع على الغرب)ده‌لێت: (ئه‌و هه‌نگاوه خێرا و سه‌رسوڕهێنه‌ره‌ى نه‌وه‌كانى بيابان به‌سه‌ر په‌يژه‌كانى ژيار و شارستانييه‌تدا ئه‌نجاميان دا، كه له هيچه‌وه ده‌ستيان پێكرد، به‌ڕاستى جێگاى به‌هه‌ند وه‌رگرتن و په‌ند وه‌رگرتنه له مێژوى هزرى مرۆڤايه‌تيدا..سه‌ركه‌وتنه زانستييه يه‌ك به‌دواى يه‌كه‌كانيان، كه كردنيه گه‌وره‌و سه‌ردارى گه‌له شارستانييه‌كان، به‌ڕاستى جێگاى پێداهه‌لّدانه، تا ئاستێك كه زۆر گه‌وره‌تره له‌وه‌ى به شارستانييه‌ته‌كانى تر به‌راورد بكرێت..)ل١٤٨.

هه‌روه‌ها ده‌لێت: (له‌ڕاستيدا (ڕۆجه‌ر بيكۆن) و (گاليلۆ) و (دافينشى) نه‌بون كه توێژينه‌وه‌ى زانستييان داهێنا، به‌لّكو ئه‌وانه‌ى ده‌ستپێشخه‌ربون عه‌ره‌به- مسولّمانه‌كان-بون، كه-به‌پێچه‌وانه‌ى برا مه‌سيحييه‌كانيان- له توێژينه‌وه‌كانيان



پەنایان بردە بەر عەقڵ و تێبینی کردن و لێکۆڵینەوە و گەڕانی ڕاستەقینە.. مسوڵمانان گرانبەهاترین دیاریان پێشکەشکرد، ئەویش: (توێژینەوەی زانستی دروست)، کە ڕێگای لە بەردەم ڕۆژئاوادا والآکرد تا پەی بە نهێنیەکان ببات و ئەمڕۆش دەستی بەسەردا بگرێت..)لا ٢٦٩.

پاشان دەربارەی پلەوپایەی زانایانی مسوڵمان دەڵێت: (.. هەر نەخۆشخانەیەك، هەر ناوەندێکی زانستی ئەو ڕۆژگارەمان، لەڕاستیدا پەیکەر و شاکارێکی هزری ڕون و زیرەکی عەرەبی-ئیسلامییە-..)لا ٣١٥.

لەجێگایەکی تریشدا دەڵێت: (پزیشکیی ڕۆژئاوا بۆ ماوەی چەند سەدەیەك کۆپی پزیشکیی عەرەبی بو، سەرەڕای سوتاندنی کتێبەکانی(ئیبن سینا) لە شاری (بازل) لە کردارێکی دوژمنکاری مەسیحیدا، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ڕەفەکانی کتێبخانەکان هەرگیز خاڵی نەبوون لە کتێبەکانی عەرەبەکان و هەردەم لە گیرفانەکانی زانایان و پزیشکاندا بونیان هەبووە، بەڵکو هەر پارێزراو بوون و هەندێ جاریش تالآن کراون)لا ٣٤٥.

*ئەو بەشەش بە وتەی (نەسری سەلەب) کوتایی پێدێنین کە لە کتێبی(في خطا محمد)دا دەڵێت: (عەقڵی ئیسلامی و عەرەبی لە سەردەمێکی مێژودا گەیشتە چ پلەیەکی بەرز، یاخود لە هەمو سەردەمەکانی مێژودا؟.. هەمو ئەوانەش ئەنجامێکی سروشتی ئامۆژگارییەکانی قورئان و محمدی پێغەمبەری خوا بون)لا ٤٦٩.

*هەرکەسێك لە ئاینەکانی تری کۆڵیبێتەوە ئەوا لەو لایەنەوە باوەڕی بە ئیسلام زیاد دەبێت، چونکە ئەگەر سەرنجی (العهد القديم) یان (العهد الجديد) بدەی ئەوا ئەستەمە چاوت بکەوێتە سەر ئەو وشانە:

زانست- عەقڵ- بەڵگە- دانایی- بیر- ڕوانین، یاخود هەر وشەیەکی وەرگیراو یان نزیك لەو وشانە.

بەڵام کاتێك قورئانی پیرۆز دەخوێنیتەوە، دەبینیت:

-وشەی زانست(العلم) ٨٠ جار بە ناسراو و نەناسراو هاتووە.

هەرچی وشە داتاشراوەکانە لە وشەی زانست(العلم) وەکو (یعلم- یعلمون- علیم- علام..تاد، سەدان جار هاتوون.

- وشەی بیر(العقل): ئەوا وشەی (الألباب) لە جێگایدا بەکارهاتووە و ١٦ جار هاتووە.

- وشەی عەقڵەکان(النهی): ٢ جار هاتووە.

- وشەی بەڵگە(البرهان): ٧ جار هاتووە.

- وشەی دانایی(الحکمە): ٢٠ جار هاتووە.

- داتاشراوەکانی وشەی شارەزایی(فقه): ٢١ جار هاتووە.

- داتاشراوەکانی وشەی بیر(فکر): ١٨ جار هاتووە.

ئەوە سەرەڕای ئەو وشانەی پێوەندیان بە زانست و هزرەوە هەیە، وەکو : انظروا- ینظروا[١]..

*ئا ئەمەیە ئەو ئیسلامەی گەورە زانا و پزیشك و فەیلەسوفەکان لەو قوتابخانەیەدا دەرچوون و پێگەیشتون، لەوانە:

ئیبن نەفیس، ئیبن سینا، شەریف ئیدریسی، ئیبن ڕوشد، ڕازی، ئیبن زەهر، جابری کوری حەییان، موسای کوڕی شاکر، عەبدولڕەحمان خازن، ئیبن خەلدون کە شوێنپەنجەی لە فەلسەفە و کۆمەڵایەتی و فەلسەفەی مێژودا دیارە، خوارزمی کە خاوەنی لۆگاریتمە، ئیبن هەیسەم کە پێشەوای زانستی ڕۆشنگەری و باوکی ڕێبازی زانستییە، هەزارانی تریش لەوانەی ڕۆڵیان هەبووە لە گۆڕینی ڕوی جیهان بۆ باشترین،

---

(١) سەرچاوە:المعجم المفهرس لألفاظ القرآن الکریم.



لە هەمو ڕوویێکی زانستی و کۆمەڵایەتی و سیاسی.

*گومان لەو ڕاستییەدا نییە کە ئیسلام بەتەنیا -لە ماوەیەکی کورتدا- توانی ژیار و شارستانییەتێك بنیات بنێت کە لە گەورەترین و تەمەن درێژترین شارستانییەتەکانی مێژو بو، ئەو گومانەیش کە دەڵێت: (ئیسلام هۆکاری دواکەوتویی مسوڵمانانە) بەڕاستی زۆر لەوە کەمترە کە شایەنی لەسەر وەستان یان وەڵامدانەوەبێت، چۆن ئیسلام-کە دژی هەمو جۆرە دواکەوتوییەکە-هۆکاری دواکەوتنی مسوڵمانان دەبێت؟!

*ئەورروپا لە سەدەکانی دوازدە و سێزدەدا هەستا بە هەڵمەتێکی گەورەی وەرگێڕان، کە بووە بناغەیەکی بەهێز بۆ ئەوەی شارستانییەتە هاوچەرخەکەی لەسەر بنیات بنێت، ئەوە لە کاتێکدا کە مسوڵمانان دڵسۆزانە بۆ خوا بەدوای ئەو زانستانەوەبون و ئەویش یاساکانی بۆ دەرخستن و نهێنیەکانی نیشاندان، هەتا ئەو کاتەش کە ئیسلامیان لە کاروبارەکانیان وەدەرنا و دوای ئارەزووەکانیان کەوتن توشی کەوتن و دواکەوتویی نەبون..

(مالیکی کوڕی نەبی)، کە بیرمەندێکی جەزائیرییە دەڵێت: (ئەو دواکەوتوییەی ئێستا مسوڵمانان بە دەستییەوە دەناڵێنن هۆکارەکەی ئیسلام نییە، بەڵکو ئەوە سزایەکی شیاوی ئیسلامە بۆ مسوڵمانان، بەهۆی وازهێنانیان لێی نەك شوێنکەوتنی).

## بانگەوازی قورئانی پیرۆز بۆزانست وزانیاری

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ البقرة: ١٦٤

واته[1]: بێگومان لە دروست کردنی ئەرزو ئاسمان ودوابەدوای یەکداهاتنی شەوو ڕۆژو جیاوازییان لە کورتی و درێژی و قازانج ومەبەستدا و، لە دانی بیرو هۆشدا بە بنیادەم بۆ دروست کردنی کەشتیی هەمەجۆرە، کە لە دەریادا هاتوچۆ ئەکەن و قازانج بە خەڵك ئەگەیێنن بە بازرگانی وشتی تر، هەروەها لەو ئاوو بارانەدا کە خودا لە ئاسمانەوە ئەیبارێنێ و زەوی پێ زیندوو ئەکاتەوە پاش مردنی و سەوزی ئەکا پاش وشك بوونی و، ئەو هەموو گیان لە بەرانەی تێیدا بڵاوی کردوونەتەوە، هەروەها لە ڕامکردن و وەرچەرخاندنی هەور و با لەنێوان ئاسمان و ئەرزدا، لە هەمو ئەمانەدا نیشانەو دەلیلی گەورەیی ودەستەڵاتداری و تاقانەیی خودا هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن عەقڵن و بیرئەکەنەوە.

ئیسلام گرنگییەکی زۆری بەزانست و زانیاری داوە وپلەی بەرز ڕاگرتووە و هانی داواکردنی داوە و فێربون وفێرکردنی بە کارێکی مەزن زانیوەو لەبەرانبەر

---

(١) بۆ واتاکردنی ئایەتەکان تەفسیری(نامی) دانراوی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس(ڕەحمەتی خوای لێبێت) بەکارهاتووە.



کەمتەرخەمی لەداواکردنیدا هۆشیاری داوەو، ئادابەکانی داواکردن و بەخشین و شوێنەوارەکانی خستونەتەڕو و بانگەوازی بۆ کردووە، ئەم بانگەوازەش لەزۆر ئایاتی قورئانیدا ڕەنگی داوەتەوە و خراوەتەڕو، لەوانە:

**یەکەم: بانگەواز بۆ زانستە سروشتی و گەردونییەکان:**

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ * وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ فاطر: ٢٧ - ٢٨

واتە: ئایە تۆ نەتدیوە خوا ئاوی لەئاسمانەوە ناردوەتە خوارەوەو بەو ئاوە چەندین بەرو بەرهەمی ڕەنگ وجۆر جیاجیامان پێگەیاندوە؟ لەکێوەکانیش چەندین ڕێگاو هێڵی سپی وسوری ڕەنگ جیاواز و ڕەشی فرە ڕەش، واتە ئەمانیشمان دروست کردووە؟ لەجۆری ئادەمیزادو کرم و مار و مێروو و چوارپێ و ئاژەڵیش هەروەها ڕەنگ وجۆری جیاجیامان دروست کردووە. لە ناو بەندەکانی خوادا هەرزانایان لە خوا ئەترسن چونکە ئەوان باش شارەزای کارو کردەوەی خوان و پەی بە گەورەیی خوا ئەبەن. بێ گومان خوا بەسەر خواستی خۆیدا زاڵەو لە بەندەکانی خۆی خۆش ئەبێ.

﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴾ الحجر: ٢٢

واتە: باکانمان بە سکپڕی، یا بۆ پێوەندو تەلقیحکردنی دارو درەخت ناردو، لەئاسمانەوە ئاومان بۆ ناردن و دامانە دەرخواردتان، یا کردمانن بە ئاودێری



دارودرخت و، کشتوکاڵتان بەو ئاوە ئاودا کە ئێوە خۆتان ئەو ئاوەتان هەڵنەگرتووەو نەتانکردووەتە چاڵاوەوە.

## دووەم : بانگەواز بۆ زانستی زیندەزانی(بایۆلۆژیا)

﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ * خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ * يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴾ الطارق: ٥ - ٧ ـ واتە: دەسا با ئادەمیزاد وردبێتەوە لە چی دروست کراوە؟ لەئاوێکی هەڵقوڵاو دروست کراوە. لەنێوان پشتی پیاوو ئێسکی سنگی ئافرەتەوە دەرئەچێ.

﴿ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ * ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ * فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴾ القيامة: ٣٧ - ٣٩

واتە: ئایە ئەو تۆوێ نەبوە لەئاوی پیاو ئەهێنرێتەوەو ئەکرێتە منداڵدانی ئافرەتەوە؟ پاشانیش بوە بەپارچە خوێنێك و ئەوجا بەپارچە گۆشتێك و جاخوا کردویە بەئادەمی و ڕێکی خستوەو سەرو سیمای داوەتێ؟جا خوا هەردوو جۆرەکەی لێدروست کردووە کە نێر و مێ یا ژن و مێردن؟

## سێیەم : بانگەواز بۆ زانستی مێژو و بابەتە کۆمەلایەتییەکان:

﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ الروم: ٩

واتە: ئایە ئەوان بەزەویدا نەگەڕاون تاسەیر بکەن سەرەنجامی ئەوانە چۆن بوە کەپێش ئەمان بوون ؟ ئەوان لەمان بەهێزتربوون و زەویان هەڵگێڕایەوە بۆ تۆو تێداکردن و دارو درەخت تێدا ناشتن و ئاوەدانیان کردەوەو شارو لادێیان تێدا دروست کرد زیاتر لەوەی ئەمانەی ئێستا کردوویانە و پێغەمبەرانی ئێمە بەموعجیزەی ئاشکراو





دیاره‌وه هاتنه‌وه سه‌ریان، که‌چی ئه‌وان ئینکاریان کردن و باوه‌ڕیان پێ نه‌کردن و خوایش له سزای ئه‌وه‌دا غه‌زه‌بی لێ گرتن. خوا له‌وانه نه‌بوو سته‌میان لێ بکا که وای لێ کردن، ئه‌وان خۆیان سته‌میان له خۆیان ئه‌کردو به کرده‌وه‌ی خراپیان خۆیان به‌ودەرده برد.

﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا فِي الْبِلَادِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ﴾ ق: ٣٦ واته: خه‌ڵکی چه‌ندین سه‌ده‌مان به‌ر له‌م کافرانی مه‌ککه‌یه به‌رباد کردو فه‌وتاند که ئه‌وان له‌مان زۆر به‌هێزترو به هه‌ڵمه‌تتر بوون و به‌وڵاتاندا گه‌ڕابوون بۆ ئه‌وه‌ی خۆیان بپارێزن له‌مه‌رگ، به‌ڵام هیچ ده‌رفه‌تێکیان ده‌ستگیر بوو؟

## چواره‌م: بانگه‌واز بۆ زانستی گه‌ردونناسی:

﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا﴾ الفرقان: ٦١

واته: گه‌وره‌یی بۆ خوایه‌که چه‌ند بورجی له‌ئاسماندا درووست کردووه که مه‌نزڵی ئه‌ستێره گه‌رۆکه‌کانن و چرای ڕۆژ و مانگی ڕوناك که‌ره‌وه‌ی تێدا داناوه.

﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا * وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ نوح: ١٥ - ١٦

واته: نابینن چۆن خوا حه‌وت ئاسمانی چین له‌سه‌ر چین درومست کردووه و، مانگیشی له‌ئاسمانه‌کاندا کردووه به مایه‌ی روناکی و خۆری کردووه به چرای جیهان ئارا؟

* دوو بانگه‌وازی تری گرنگیش ماون:

١ـ بانگه‌وازی باوه‌ڕهێنان به‌یه‌ك خودا، ئه‌و خودایه‌ی هیچ دژو هاوشان و هاوبه‌شی نین...



﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ آل عمران: ٦٤

**واته: بڵێ: ئه‌ی کیتابییه‌کان وه‌رن بۆ وه‌رگرتنی وته‌یه‌ك که‌ هه‌موو پێغه‌مه‌ران و هه‌موو کتێبه‌ خودایه‌کان یه‌ك قسه‌ن تێیداو هیچ جیاوازییه‌کیان نییه‌، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه‌ که‌ عیباده‌ت بۆ که‌س نه‌که‌ین بۆ (الله) نه‌بێ و هاوڕێی بۆ دانه‌نێین له‌ په‌رستنداو به‌ته‌نها ئه‌و بپه‌رستین و، هه‌ندێکمان هه‌ندێکی ترمان نه‌که‌ینه‌ خوداو نه‌یانپه‌رستین و، جائه‌گه‌ر رویان وه‌رچه‌رخاندو به‌گوێیان نه‌کردی ئه‌وا پێیان بڵێن، ده‌ی ئێوه‌ شاهید بن که‌ ئێمه‌ ئیمانمان به‌م ڕاستییانه‌ هه‌یه‌و ئێوه‌ ئیمانتان پێیان نییه‌.**

**ـ خودایه‌کی بێ وه‌چه‌و منداڵ ...**

﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا * لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا * تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا * أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا * وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا * إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا﴾ مريم: ٨٨ - ٩٣

**واته : کافره‌کان وتیان : خودای میهره‌بان ئه‌ولادی بۆخۆی ڕاگرتووه‌.ئه‌ی کافرینه‌! به‌ڕاستی، ئێوه‌ به‌م قسه‌یه‌تان کارێکی ناڕه‌واتان کردووه‌.له‌وانه‌یه‌ ئاسمانه‌کان له‌وقسه‌ ناشیرینه‌ له‌ت له‌ت بن و زه‌وی شه‌ق بێ و کێوه‌کان بکه‌ون و بڕوخێن.له‌به‌ر ئه‌وه‌ که‌ نیسبه‌تی ئه‌ولادیان داوه‌ته‌ پاڵ خوا. بۆ خودای میهره‌بان ناشێ ئه‌ولادی بێ.که‌س له‌ئاسمان وئه‌ردزا نیه‌ به‌به‌نده‌یی نه‌یه‌ته‌ به‌رده‌ستی خودای میهره‌بان.**

**ـ خودایه‌کی بێ هاوشێوه‌و هاوشان ..**



﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ الشوری: ١١

واتە: ئەو خودایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە. هاوجوتی نێرو مێی لەخوتان بۆ دروست کردون و، لەئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ بەرزو هەمو چوار پێیەکیش هاو جوتی نێرو مێی بۆ دروست کردوون. لەم هاوجوت و نێر و مێی دروست کردوە لەخوتان، زۆرتان ئەکات وبلاٌوتان ئەکاتەوە بەسەر زەویدا. هیچ شتێ وێنەی خوا نیەو خوا خوایەکی شنەواو بینایە گوێی لەهەر چییەکە بوترێ و چاوی لە هەر شتێکە بکرێ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا﴾ النساء:٣٦

واتە: ئەی مسوڵمانەکان، یا ئەی منافقەکان، یا ئەی ئیمانداره کیتابییەکان ئیمان بێنن بە دڵ و بەزمان و بەڕاستی بەخودا و بە پێغەمبەری خودا و بەو قورئانەی بۆی ناردووە و بەو کتێبەی کە خودا پێش محمد ناردویەتی و، لەسەر ئەو ئیمانە بەردەوام بن، بێگومان هەرکەس ئیمانی بە خودا نەبێ یا ئیمانی بە مەلایکەی خودا نەبێ، بە پێغەمبەرانی خودا یا بەڕۆژی قیامەت نەبێ، ئیتر ئیمانی بەهەموو ئەمانە نەبێ یا خۆ بەیەکێکیان، ئەوە ئەو کەسە زۆر زۆر گومڕا بووەو زۆر لەحەق دورکەوتوەتەوە.

- ئەو پێغەمبەرەی خەڵکی لەتاریکییەوە بەرەو ڕوناکی ڕێنمونی کرد..

﴿هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ الحدید: ٩



واته: خودا ئەو خوایەیە کەئایەتی ڕۆشن و ئاشکرا نازڵ ئەکا بۆسەر بەندەی خۆی بۆئەوەی لەتاریکی نەزانی و خوا نەناسیەوە دەرتان کاو بتانخاتە ڕوناکیی باوەڕو خواناسین و، خوابەڕاستی میهرەبان و بەڕەحمە لەگەڵتان.

- ئەو پێغەمبەرەی ڕەحمەت ومیهرەبانییە بۆ جیهانییان...

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبیاء: ١٠٧

واته: ئەی محمد! تۆشمان بەهیچ حاڵێ نەناردووە بەرەحمەت وخێر وبەرەکەت نەبێ بۆهەمو ئەهلی جیهان بۆ فێرکردنی خواپەرستی و خوا بەیەکزانین و فێری زانست و ڕەوشتی چاك بوون.

## چەند ڕاستییەكی زانستی لە ئایەتەكانی قورئان دا..

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلت: ٥٣

واتە: ئێمە لەمەوپاش بەڵگە و نیشانەكانی خۆمانیان لەجیهان و لە نەفسی خۆیان پیشان ئەدەین تا بۆیان دەركەوێ قورئان ڕاستەو كەلامی خوایە و لەخواوە هاتووەتە خوار بۆ سەر پێغەمبەر. ئاخۆ بەس نییە ئادەمزاد بۆ گێڕانەوەی لەگوناە و لەبێفەرمانی خوا ئەمە كەخوای تۆ ئاگای لەهەموو شتێ هەیە؟

* * *

ڕاستی دۆزینەوە زانستییەكان لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا هاوتەریین، لەهەمان كاتدا لەگەڵ كتێبە ئاسمانییە كانی تردا تێك دەگیرێن، ئەمە ئەگەر ئەو كتێبانە ــ كە دەستكاری كراون ــ شتی وایان تێدابێت!

ئەوەی ئێستا دەیخەینەڕو و هەندێ ڕاستی و دۆزینەوەی زانستی سەلمێنراوی هاوچەرخن، لەگەڵ خستنەڕوی ئەو ئایەتانە ئاماژەیان بۆ ئەو ڕاستییە زانستییانە كردوە، لەوانە :

### ١ ـ جیابونەوەی ئاسمان لەزەمین (تەقینەوە گەورەكە):

﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴾ الأنبياء: ٣٠ واتە: ئایا كافرەكان نازانن كەوا ئاسمانەكان و زەوی پارچەیەكی پێكەوە لكاو بون ولێكمان كردنەوە و هەمو شتێكی



زیندومان لەناو دروست کردووە دەی ئایا هێشتا هەر ئیمان ناهێنن ؟

## ٢ــ کشانی گەردون و فراوان بونی:

﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾ الذاريات: ٤٧

واتە: ئاسمانیشمان بەهێز دروست کردو ئێمە ئەتوانین گەورەتریشی بکەین.

## ٣ـ باران بارینی هەمیشەیی و دوبارە لەئاسمانەوە:

﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴾ الطارق: ١١

واتە: سوێند بەو هەوایەی ئاو هەڵدەگرێ و دەیداتەوە. .

## ٤ـ ئاسمان سەرچاوەی ئاسنە {نەیزەکەکان}:

﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ﴾ الحديد: ٢٥

واتە: بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرەکانی خۆمانمان بە موعجیزەی ئاشکرا و دیارەوە ناردووەو هەریەکە کیتابی خۆیمان لەگەڵ ناردووەو سەنگ و ترازووی مامەڵەمان لەگەڵ ناردووە تا خەڵك داد بەرپا بکەن و، ئاسنیشمان ناردووەتە خوارەوە هێزێکی زۆر توندو چەند جۆرە سودو قازانجی بۆ خەڵك تێدایە ئەدەواتی جەنگ و کشتوکاڵ و پیشەسازی و شتی تری لێ دروست ئەکەن و، ئەو کاتە خوایش بزانێ کێ لە پەنامەکی و نادیارەوە یارمەتی ئەوو پێغەمبەرانی ئەدا، بەڕاستی خوا بەهێزو خاوەن عیزەتە.



**٥- چینەکانی بەرگەهەوا :**

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٩.

واتە: خودا ئەو خودایەیە پاش ئەوەی ئێوەی لەنەبونەوە دروست کرد زەویشی دروست کرد بۆ هەموتان، بۆژیان ومانەوەتان و بۆ ئەوەی لەپێناوی قازانجی ئەمڕۆو سبەینێتان و، دنیاو قیامەتتاندا بەکاری بێنن و سوودی لێوەر بگرن، دوای ڕووی خواستی کردە دروست کردنی ئاسمان و شتە شوێن بەرزەکان و حەوت ئاسمانی دروست کرد، ئەو خودایە هەمو شت ئەزانێ ولەهەموی ئاگادارە.

**٦- جولەی خۆر :**

﴿ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾ یس: ٣٨

واتە: هەروەها ڕۆژیش نیشانەی گەورەیی خوایە کە لە مەداری خۆیا دێ و ئەچێ ئەمەیش بەقەدیر و ڕێك خستنی خوایە کەدەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا ئەشکێ وبەهەموو شتێ ئەزانێ.

**٧- خڕێتی زەوی :**

﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴾ النازعات: ٣٠واتە: پاش ئەوەی زەوییشی پان وبەربلاۆ و(خڕ) کردووە.

**٨- سوڕانەوەی زەمین :**

﴿ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴾ النمل: ٨٨



واته: کێوه‌کانی سه‌ر زه‌وی ئه‌بینی وا گومان ئه‌به‌ی که وه‌ستاو و ئارامن و له‌ڕاستیدا وه‌ك په‌ڵه هه‌ور ئه‌بزوون چونکه شتی گه‌وره که به‌جارێ بجووڵێ ئاده‌میزاد هه‌ست به‌جوڵه‌ی ناکا. ئه‌میش کاری ئه‌و خوایه‌یه که‌هه‌موو شتێکی دروست کردووه، بێگومان خوا ئاگاداره له‌هه‌ر کارێ که‌ئێوه ئه‌یکه‌ن .

### ٩- بچوك بونه‌وه‌ی زه‌وی :

﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ﴾ الأنبياء: ٤ - ٤٤

واته: ئه‌دی ئه‌وه‌نده نازانن که ئێمه له هه‌مولا له‌و زه‌وییه که‌م ده‌که‌ینه‌وه؟

﴿وَٱلْأَرْضِ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ﴾ الطارق: ١٢ واته: سوێند به‌و زه‌مینه‌ش که درز و که‌لێنی زۆری هه‌ن.

### ١١- له‌رزینی زه‌مین به‌هۆی بارانه‌وه :

﴿وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ﴾ الحج: ٥

واته: زه‌وی ده‌بینی له زستاندا خامۆشه وشك و بێگیانه، جا کاتێ بارانمان به‌سه‌ردا باراند زه‌وی ڕووه‌کی لێده‌ڕوێ، زه‌وی ده‌جوڵێ و هه‌ڵده‌دات و به‌رز ده‌بێت و له هه‌مو گیاو گوڵێکی جوانی تێدا ده‌ڕوێ.

### ١٣- به‌ربه‌ستی نێوان ده‌ریا و زه‌ریاکان:

﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾﴾

الرحمن: ١٩ – ٢١ واته: دوو ده‌ریای سوێرو شیرینی ناردووه تا سنوورێ که‌تیایدا



ئه‌گه‌نه یه‌ك. له‌نێوان ئه‌و دوو ده‌ریایه‌یه دا په‌رده‌یه‌كی قودره‌تی هه‌یه به‌هۆی ئه‌و په‌رده‌وه هیچ كام له‌دوو ده‌ریای سور وشیرینه كه ده‌ست درێژی ناكا به‌سه‌ر ئه‌وه‌یاندا .ده‌ی كه‌واته ئێوه ئه‌ی به‌ره‌ی ئاده‌میزاد و په‌ریان، به‌كام نیعمه‌ته له‌نیعمه‌ته‌كانی خوای خوتان بێباوه‌ڕن و ئینكاری ئه‌كه‌ن ؟

### ١٤ ـ تاریكییه‌كانی ده‌ریا وزه‌ریاكان و شه‌پۆله ناوه‌كییه‌كانیان:

﴿أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ظُلُمَٰتُۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾ النور: ٤٠

واته: یاخود كرده‌وه‌كانیان وه‌ك چه‌ند په‌رده‌ی یه‌ك له‌سه‌ر یه‌كی تاریكی وایه له‌ده‌ریایه‌كی قوڵی بێ بنه، ئه‌و ده‌ریایه شه‌پۆلی به‌سه‌ردا بێت وبه‌سه‌ر شه‌پۆله كه‌شیا شه‌پۆلی تریێت و به‌سه‌ر هه‌موو شه‌پۆله‌كانیشه‌وه هه‌ورێكی ڕه‌ش بێ تاریكستانێك بێ هه‌ندی به‌سه‌ر هه‌ندێكی تریه‌وه .ته‌نانه‌ت كه كابرا ده‌ستی ده‌ركا له‌وانه‌بێ له‌به‌ر تاریكی نه‌یبینێ. ڕاسته‌كه‌یشی ئه‌وه‌یه كه‌سێ خوا ڕوناكی پێنه‌به‌خشێ هیچ ڕوناكیه‌كی نابێ.

### 15ـ ڕێژه‌یی كات:

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ ۚ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ الحج: ٤٧

واته: ئه‌و كافرانه په‌له‌په‌لت لێ ئه‌كه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی عه‌زابی خوایان به‌سه‌ردا بێ و، خوایش هه‌رگیز پێچه‌وانه‌ی وه‌عده‌ی خۆی ناجولێته‌وه‌و عه‌زابیان هه‌ر ئه‌داو شته‌كه په‌له‌په‌لی ناوێ و، یه‌ك ڕۆژی خوای وه‌كو هه‌زار ساڵ وایه له‌و ساڵانه‌ی كه ئێوه ئه‌یان ژمێرن.



### 16ـ ڕێژەی (نەگۆڕی) باران:

﴿وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾﴾ الزخرف: ١١.واتە: ئەو خوایەش کە لە ئاسمانەوە بە ئەندازەی پێویست ئاوی داباراندووە بۆ سەر زەوی و بەو ئاوە شارێکی بێ بەروبومان زیندو کردوتەوە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەو جۆرە ئێوە زیندو دەکرێنەوە و لە گۆڕ دەرئەهێنرێن.

### 17ـ دروستبونی باران:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِى سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾﴾ النور: ٤٣

واتە: ئایە تۆ نابینی خوا پەڵە هەور پاڵ پێوە ئەنێ وئەیان خاتە گەڕو پاشان ئەیانداتە دەم یەك ورێکیان ئەخاو پاشان ئەیانیشێنێتە سەریەك و کەڵەکەیان پێ ئەکا؟جا ئەبینی بارانی لێوە دائەبارێ و، لەئاسمانەوە لەکێوانی تەرزەوە کەلەهەوادان تەرزە دائەوەرێنی و باخ و باخات و دەغڵودان و ئاوەدانی هەرکەسێ ئارەزووی لێ بێ لەو تەرزانە ئەگرێتەوەو هەرکەسیشی ئارەزوو لێ بێ لێی لائەداو بروسکەیش لەو هەورە دەرئەچێ کەلەوانەیە تیشکەکە چاوی ئادەمیزاد کوێر بکاو ڕووناکییەکەی بەرێ.

### 18ـ دیاریکردنی جۆری کۆرپەلەو دروست بونی لەدلۆپە ئاوێك:

﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِىٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾﴾ القيامة: ٣٦ - ٤٠



واتە: ئادەمیزاد گومانی وایە هەروا بێ لێ پرسینەوە لێی ئەگەڕێن؟. ئایە ئەو تۆوێ نەبووە لە ئاوی پیاو ئەهێنرێتەوەو ئەکرێتە منداڵدانی ئافرەتەوە؟ . پاشانیش بووە بە پارچە خوێنێك و ئەوجا بەپارچە گۆشتێك و، جاخوا کردوویە بە ئادەمی و ڕێکیخستووەو سەرو سیمای داوەتێ؟. جاخوا هەردوو جۆرەکەی لێ دروست کردووە کەنێرو مێ یا ژن و مێردن؟. ئایا ئەو خوایەی ئەمەی کردووە ناتوانێ مردوویش زیندوو بکاتەوە؟.

## 19ـ قۆناغەکانی دروستبونی کۆرپەلە:

﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾

المؤمنون: ١٤

واتە: پاش ئەوە ئەو تۆوەمان کرد بە پارچەیێ خوێن، پاشان ئەو پارچە خوێنەمان کرد بەپارچە گۆشتێ، پاش ئەوە ئەو پارچە گۆشتەمان کرد بە ئێسقان، ئەوجا گۆشتمان کردە بەری پارچە ئێسقانەکە، ئەوجا کردمان بە دروستکراوێکی تر کە ئەو منداڵەیە لەمنداڵدانی دایکی دێتە دەرەوەو لەدایك ئەبێ، ماشەڵڵا چەندگەورەو پیرۆزە خوا کە جوانترین دروستکەرێکە بەخەیاڵی ئادەمیزادا بێت.

پسپۆڕانی بواری ئیعجازی زانستی لە قورئاندا چەندان کتێبی باش و سەرسوڕهێنەریان لەو بوارەدا نوسیوە، بۆبەرچاوڕونی ئەو کەسەی دەیەوێ لەو بوارەدا زیاتر بزانێ.

ئەوەی لێرەدا گرنگەو پێویستە ئاماژەی پێبدەین، ئەوەیە، کە ئەو ڕاستییە زانستیانەی پێغەمبەرمان محمد (صلی الله علیە وسلم )لەپەروەردگارییەوە پێی

ڕاگه‌یه‌نراون و ئه‌ویش ڕایگه‌یاندون، له‌وسه‌رده‌مه‌دا زانراو نه‌بوون، ئه‌وه‌ش هه‌مو گومانه‌کان پوچه‌ڵ ده‌کاته‌وه‌و ده‌یسه‌لمێنی، که له‌لای خوداوه هاتووه‌و فه‌رموده‌ی خوای هه‌مو پێغه‌مبه‌ران و په‌روه‌ردگاری جیهانییانه، خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت:

﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ ﴾ الأنعام: ١٥٥

واته :ئه‌م قورئانه‌یش کتێبێکی به‌فازانجه ناردوومانه بۆتان په‌یڕه‌وی بکه‌ن و به‌گوێره‌ی ئامۆژگارییه‌کانی بجوڵێنه‌وه‌و، خۆتان له‌گوناه بپارێزن به‌ڵکو خودای گه‌وره ڕه‌حمتان پێ بکات.

## هەندێ ڕوی ئیعجازی قورئانی

لێرەدا پێویستە هوشیاری دەربارەی شتێك بدەین كە: ئیعجازی قورئانی بە تەنیا ئیعجازی زانسق نییەو زوّر ڕوی ئیعجازی تریشی هەن، لەوانە:

### ١-كورتبڕیی:

كە بریتییە لە دەربڕینی مانایەكی زوّر بە كەمترین وشە، خوای پەروەردگار دەفەرمویّت:

﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ هود: ٤٤.واتە: جا پاش خنكانی كافرەكان و تەواوبونی قەزای خوا لەلایەن خواوە بە زەوی وترا:ئەی زەوی! ئاوی خوّت قوت بدەرەوە. بە ئاسمانیش وترا: ئەی ئاسمان چی دی مەبارێنە. هەروەها كەشتییەكە لەسەر چیای(جودی) گیرسایەوەو ئینجا جاڕدرا كە دوری لە ڕەحمەتی خودا بوّ قەومی ستەمكارانە.

### ٢-ئیعجاز لە دارِشتن دا:

دەقی قورئانی لە دەقی شیعری و پەخشان دەردەچێت، نە شیعرە نە هوتراوەی ڕەجەزە نە كێش و سەرواداری نە وتارە، لە هەمو جوّرەكانی قسە جیاوازە ئەگەرچی لە هەمان پیتەكانیشە.

لە سیرەی ئیبن هیشامدا هاتووە: (هەندێ لە قورەیشییەكان چونەلای وەلیدی

کوڕی موغه‌یره، ده‌رباره‌ی باس و خواسی محمد گفتوگۆیان له‌گه‌ڵدا کرد..

پێیان گوت: شتێکمان پێبڵێ ده‌رباره‌ی ئه‌و-محمد- بیڵێین.

گوتی: نا ئێوه قسه بکه‌ن من گوێده‌گرم.

گوتیان: ده‌ڵێین: کاهینه.

گوتی: نا، سوێند به‌خوا ئه‌و کاهین نییه، خۆ ئێمه کاهینان ده‌ناسین، ئه‌و قورئانه سه‌روا و ورته‌ورتی کاهینان نییه.

گوتیان: ده‌ڵێین: شێته؟

گوتی: نه‌خێر، ئه‌و شێت نییه، خۆ ئێمه ده‌زانین شێتی چییه، ئه‌وه لالاچون و وه‌سوه‌سه‌ی شێتان نییه.

گوتیان: ده‌ڵێین: شاعیره؟

گوتی: نه‌خێر، ئه‌و شاعیر نییه، خۆ ئێمه هه‌مو جۆرێکی شیعر و نهێنییه‌کانی ده‌زانین، ڕه‌جه‌ز و هه‌زه‌ج و قه‌ریزه و مه‌قبوزه و مه‌بسوته..نه‌خێر ئه‌وه شیعر نییه.

گوتیان: ده‌ڵێین: جادوگه‌ره؟

گوتی: نه‌خێر ئه‌و جادوگه‌ر نییه، خۆ ئێمه جادوگه‌ر و جادووه‌که‌یان چاك ده‌ناسین، نه‌خێر ئه‌وه فاڵ و جادوی جادوگه‌ران نییه.

گوتیان: ئه‌دی چی بڵێین ئه‌ی(أبا عبد شمس)؟

گوتی: سوێند به‌خوا گوفتاره‌که‌ی شیرینه! ڕه‌گی له زه‌ویدا و قه‌دی له ئاسماندایه! ئێوه هه‌ر شتێك له‌و شتانه‌ی پێشو بڵێین هه‌مو که‌س ده‌زانن که باتڵه و نادروسته.

## ٣-ئیعجاز له زۆری واتا:

ئه‌و واتایانه‌ی که به قسه‌ی مرۆڤه‌کان ده‌رنابڕێت و واتای زۆر به وشه‌ی که‌م



دەردەبڕێت، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ أُمِّ مُوسَىٰ أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾ القصص: ٧.واتە: خستمانە دڵی دایکی موسا کە بەخێوی بکەو شیری بدەریێ، هەرکاتێك ترست پەیدابو کە بێن بیبەن فڕێی دەرە ناو دەریاوە و مەترسە کە هیچی بەسەربێ و خەفەتی بۆ مەخۆ کەوا لێت دورئەکەوێتەوە، ئێمە سەرەنجام ئەیهێنینەوە بۆلای خۆت و ئەیکەین بە یەکێ لە پێغەمبەران.

لە تاکە ئایەتێکدا دو ئەمر و دو نەهی و، دو هەواڵ و دو مژدەی تێداهەن.

### ٤-ئیعجاز لە بەڵگەهێنانەوەدا:

بەڵگە لەسەر یەکتاپەرستی: ﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ المؤمنون: ٩١.واتە: خوا منداڵی بۆخۆی بڕیارنەداوە، چونکە هاوشێوەی نییەو هیچ خوایەکی لەخۆیشی بەولاوە لەگەڵ نەبووەو نییە.ئەگەر خوایەکی دیکەی لەگەڵدابوایەو هاوبەشی هەبوایە، هەرخوایەك لە خوایەکان بەشە دروستکراوی خۆی ئەبرد و ئەبو بە شەڕیان و ئەچون بەگژی یەکدا و هەندێکیان زاڵ ئەبون بەسەر هەندێکیاندا. خودا پاك و دورە لەو قسە پڕوپوچانەی ئەو هاوبەش بۆ خوا بڕیاردەرانە ئەیانڵێن و دێن بە دەمیاندا.

بەڵگە لەسەر زیندوبونەوەی دوای مردن: ﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾﴾ نوح: ١٧ – ١٨.واتە: خوا ئێوەی سەوزکردووە لە زەویدا بە سەوزبون.پاشان ئەتانخاتەوە زەوی و دوبارە لەوێ دەرتان ئەکاتەوە بە دەرکردن.



بەڵگە لەسەر بنەڕەتی مرۆڤ: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى (٣٦) أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ (٣٧) ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ (٣٨) فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ (٣٩) أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ (٤٠)﴾ القيامة: ٣٦ – ٤٠.واتە: ئایا ئادەمیزاد گومانی وایە هەروا بێ لێپرسینەوە لێی ئەگەڕێن؟ ئایا ئەو تۆوێ نەبووە لە ئاوی پیاو ئەهێنرێتەوە و ئەکرێتە منداڵدانی ئافرەتەوە؟پاشانیش بووە بە پارچە خوێنێك و ئەوجا بە پارچە گۆشتێك و جا خوا کردویەتی بە ئادەمی و ڕێکیخستووە و سەروسیمای داوەتێ؟ جا خوا هەردو جۆرەکەی لێ دروستکردووە کە نێر و مێ یان ژن و مێردن؟ ئایا ئەو خوایەی ئەمەی کردووە ناتوانێ مردویش زیندو بکاتەوە؟

بەڵگە لەسەر ئەوکەسانەی بانگەشەی خوایەتیيان کردووە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (٢٥٨)﴾ البقرة: ٢٥٨.واتە: سەیری ئەو کەسە ناکەن کە لەگەڵ ئیبراهیم کەوتە موجادەلەو غەوغا دەربارەی خوا" چونکە خودا دەسەڵاتی پێدابو لەخۆی گۆڕابو.ئیبراهیم پێی گوت: خودای من ئەو زاتە بێ وێنەیەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا مردو زیندو دەکاتەوە و لە دنیادا ئەیمرێنێ.ئەویش گوتی: منیش مردو زیندو ئەکەمەوەو زیندوش ئەمرێنم" واتە: مەحکوم بە ئیعدام عەفو ئەکەم و لە مردن ڕزگاری ئەبێ و زیندوش ئەکوژم! ئینجا ئیبراهیم گوتی: خودای من خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە ئەهێنێ، تۆ ئەگەر ئازای لە خۆرئاواوە بیهێنە. کابرای کافری چەنەباز مات بو و دەمی بو بە تەڵەی تەقیو و هیچی پێنەکرا. خودای بەخشندە کۆمەڵی ستەمکار هیدایەت نادات.

لەگەڵ چەندین بەڵگەی دی لەسەر بابەتە جۆراوجۆرەکان.



٥-ئیعجاز له خستنه‌ڕوی مێژوی گه‌لانی پێشو:

قورئانی پیرۆز هه‌واڵی سه‌رده‌مانی کۆن و چیرۆکی گه‌لانی پێشوی تێدایه، که پێغه‌مبه‌رمان(ﷺ) هیچ زانیاریه‌کی ده‌رباره نه‌بووه، ئه‌مه‌ش به‌ڵگه‌یه‌کی ڕونه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی که ئه‌و قورئانه که چه‌ندین شتی غه‌یبی تێدا هاتووه عه‌قڵ قه‌بوڵی ناکات که له‌لایه‌ن که‌سێکی نه‌خوێنده‌وار یاخود هه‌رکه‌سێکی دیکه‌وه‌بێت.

قورئانی پیرۆز پڕه له‌و باس و خواسانه‌و له‌شێوه‌ی چیرۆکدا به‌رجه‌سته‌ی کردون، له‌وانه:

چیرۆکی موسا-علیه السلام- خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێت: ﴿ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ البقرة: ٥١ - ٥٧.واته: یادی ئه‌وه بکه‌نه‌وه که چۆن وه‌عدی چل شه‌ومان دا به مووسا خۆی ته‌رخان بکات بۆ ئه‌وه‌ی ته‌ورات وه‌ربگرێ، به‌ڵام که ئه‌و هات بۆ ( میقات ) و ماوه‌یه‌ك به‌جێی هێشتن ئێوه گوێره‌که‌تان کرد به خودای خۆتان. ئێوه به‌م کاره ناڕه‌وایه سته‌مه‌تان له خۆتان کردو زیانتان له خۆتاندا . پاش ئه‌و کرده‌وه ناله‌باره عه‌فومان کردن به‌هیوای ئه‌وه‌ی بگه‌ڕێنه‌وه بۆ ڕاسته‌ڕێ و سوپاسی خودا بکه‌ن . هه‌روه‌ها یادی ئه‌وه بکه‌نه‌وه که پاش ئه‌و کاره‌ساتانه ته‌وراتمان دا به مووساو له‌و ته‌وراته‌دا شتی حه‌ق و ڕاستمان له شتی ناڕه‌واو ناڕاست جیاکرده‌وه چ له‌بیروباوه‌ڕو چ

له كردەوەو گوفتارو شتی تر، تا ئێوه ئاگایی پەیدا بكەن و بكەونه سەر ڕێی ڕاست و چاكه بكەن و له خراپه دوور بكەونەوە . باسی ئەوە بكه كه مووسا وتی به ئومەتەكەی: ئەی پەیڕەوانی من بێ گومان ئێوە بەهۆی پەرستنی گوێرەكەكەوە ستەمتان له خۆتان كردو تاوانباربوون: دە لە گوناهەكەتان پەشیمان بنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خودای خۆتان. نەفسی خۆتان بكوژن به مەنع كردنی له ئارەزووی بەدو كرداری ناڕەوا، یا هەر بەڕاستی یەكتری بكوژن چونكە ڕیوایەت كراوە خودای گەورە له كەففارەتی ئەو تاوانەدا ئەمری پێ كردوون یەكتر بكوژن، یا ئەوانە بكوژن كه گوێرەكەیان پەرستووە. ئەمە بۆ ئێوە باشترە لای خودا. خودا تەوبەی لێ قبوولْ كردن. خودا زۆر تەوبە وەرگرەو زۆر میهرەبان و دەهەنیە. یادی ئەوە بكەنەوە كه وتتان به مووسا: ئیمان ناهێنین بەوەی كه خودا قسەت لەگەلْ دەكات تا خودا بەرەوڕوو نەبینین. ئینجا لەتۆڵەی ئەم داوا ناڕەوایەدا تریشقەمان لێ دان و خۆتان چاوتان له یەكتربوو كه دەمردن. له پاشاندا به نزاو پاڕانەوەی مووسا پاش مردنتان زیندووم كردنەوە بەشكم باوەڕتان بەهێز بێ و سوپاس و ستایشی خودای خۆتان بەجێبهێنن. یادی ئەوە بكەنەوە كه چۆن له تەیهدا هەورمان كردە سێبەر به ڕاسەری باوباپیرانتانەوە بۆ دەفعی گەرما لێیان و له ئاسمانەوە گەزۆمان بۆ باراندن كه وەك هەنگوین شیرین بوو. هەروەها پەلەوەری شەلاقەیشمان باراند بەسەرتاناو پێمان وتن: دەی بخۆن لەو ڕۆزییە پاكه كه بۆمان ئاسان كردوون. كەچی سوپاسی خودایان نەكردو شوكرانە بژێر نەبوون. ئەو سپڵەیی و سوپاس ناگوزارییەیان زیانی له ئێمه نەدا بەڵكو بۆ خۆیان خراپ بوو زیانیان له خۆیان دا.

هەروەها چیرۆكی مەریەمی كچی عیمران، دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ



لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ آل عمران: ٤٤ – ٤٥.واتە: ئەوانەی پێم گەیاندی ئەی پێغەمبەر! دەنگوباسی عالەمی غەیبن و بە وەحی بۆمان ناردوی. ئەگەر ئاگادارمان نەکردیتایە نەتدەزانین. تۆ لای ئەوان نەبوی کە زەکەریاو زانایانی(بیت المقدس) قورعەیان ئەکرد تا بزانن سەرپەرشتی مەریەم بەر کامیان ئەکەوێت؟ تۆ لەلایان نەبوی کە لەسەر ئەو مەسەلەیە لەناو خۆیاندا بو بە دەمەقاڵێیان و لەسەر بەخێوکردنی مونافەسەی یەکتریان ئەکرد. یادی ئەوە بکەنەوە کە فریشتە بە مەریەمی وت: ئەی مریەم خودا مژدەت پێدەدا کە کوڕێکت ئەبێ بە کەلیمەی خودا و بە ئەمری(کن فیکون) بێ باوك.ناوی نازناوی مەسیحە و ناوی ئەسڵی عیسای کوڕی مەریەمە. لای خودا خاوەن پایەیە و لە دنیاو قیامەتدا یەکێکە لەوانەی لە خوداوە نزیکن و پایەی تایبەتییان هەیە.

چەندین چیرۆکی تری وەکو یارانی ئەشکەوت و ذي القرنين و...تاد.

ئەو هەواڵانە هی پێغەمبەرانی گەلانی ترە و لە کتێبەکانیاندا هاتون بەڵام دەستکاری کراون و گۆڕاون و قورئان بۆی ڕاستکردونەتەوە.

### ٦-ئیعجازی هەواڵدان بەوەی کە لە ئاییندەدا ڕودەدات:

بریتییە لەو هەواڵانەی غەیبین و هاتونەتەدی، خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿غُلِبَتِ الرُّومُ ﴿٢﴾ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ ﴾ الروم: ٢ – ٤. واتە: ڕۆمییەکان شکان. لەوڵاتی نزیك لە وڵاتی عەرەبەکانداو ئەم ڕۆمیانە، پاش ئەم شکانەیان، زاڵ ئەبنەوە بەسەر ئەوانەدا کە شکاندبونیان کە فارسەکانن. لە ماوەی چەندساڵێکدا. سەرەنجامی کاری لەمەوپێشیش بۆ خوا بووەو لەمەو پاشیش



هەربوتەوە. سەرەنجامی کار هەر بۆ خوا خۆیەتی. جا ئەو ڕۆژە کە ڕۆمییەکان زاڵ ئەبن بەسەر فارسەکاندا. مسوڵمانان شاد ئەبن.

ڕاستی ئەو ڕوداوە ئەوەیە، کە وڵاتی ڕۆم-ی مەسیحی- لە بەرانبەر وڵاتی فارس-ی بت پەرست-دا لە جەنگێکدا کە لە ساڵی٦١٤ز لەنێوانیاندا ڕویدا، لەو جەنگەدا ڕۆمەکان شکستیان خوارد، بەمەش مسوڵمانان خەمباربون و بێباوەڕەکانیش خۆشحاڵ بون و بە مسوڵمانانیان دەگوت:

(ڕۆمەکان خاوەن کتێبن و ئاگرپەرستان(مەجوسەکان) بەسەریاندا سەرکەوتن، ئێوەش دەڵێن کە بە کتێبەکەتان بەسەرماندا سەردەکەون، وەك چۆن فارسەکان شکستیان بە ڕۆمەکان خوارد ئێمەش ئاوا بەسەرتاندا سەردەکەوین)تفسیر ابن جریر الطبري ٢١/ ١٦-١٧.

خوای پەروەردگار ئەو چەند ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە، کە تێیاندا مژدە دەداتە مسوڵمانان کە ئەو شکستەی ڕۆمەکان سەرکەوتنێکی بەدوادادێت لە ماوەی چەند ساڵێکدا، کە بە سێ تا نۆ ساڵ مەزەندە دەکرا.

ئەمە لەکاتێکدابو، کە هەمو هۆکارەکان بێهێزی و دوری ئەم سەرکەوتنەی ڕۆمەکانیان بەدور دەزانی بەهۆی بێهێزی ڕۆمەکان و بەهێزی فارسەکان، بەڵام خودای پەروەردگار بەڵێنەکەی بەجێهێنا و لەساڵی ٦٢٢ز سەرکەوتنەکە هاتەدی.

هەروەها خودای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ۝٤٤ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ۝٤٥ ﴾ القمر: ٤٤ – ٤٥.واتە: یاخود ئەڵێن: ئێمە کۆمەڵێکین زاڵین و کەس ناتوانێ بمانبەزێنێ. ئەم کۆمەڵە کافرە لەمەولا لە جەنگدا ئەبەزن و پشت پێهەڵئەکەن.

ئەوەش لە جەنگی بەدر بو.



هەروەها دەربارەی کۆچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەککەوە بۆ مەدینە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِی فَرَضَ عَلَیۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٖۚ قُل رَّبِّیۤ أَعۡلَمُ مَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ وَمَنۡ هُوَ فِی ضَلَـٰلٖ مُّبِینٖ﴾ القصص: ٨٥.واته: بێگومان ئەو خوایەی قورئانی لەسەر تۆ فەرز کردووەو بۆی ناردوی و پێویستی کردووە لەسەرت کە ڕەفتاری پێبکەیت و بیگەیێنی بە خەڵك و تێبکۆشی بۆ بڵاوکردنەوەی، ئەتگێڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی هاتوی کە شاری مەککەیە.تۆش بە خەڵکی دەوروپشتت بڵێ خوای من لە هەرکەسی تر چاکتر ئەزانێ کێ ڕێنمایی بۆ خەڵك هێناوەو کێ لە گومڕایی ئاشکرادایە.

خوای پەروەردگاریش لە ساڵی فەتح گێڕایەوە بۆ مەککە: ﴿لَّقَدۡ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءۡیَا بِٱلۡحَقِّۖ لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِینَ مُحَلِّقِینَ رُءُوسَكُمۡ وَمُقَصِّرِینَ لَا تَخَافُونَۖ فَعَلِمَ مَا لَمۡ تَعۡلَمُواْ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَ ٰلِكَ فَتۡحࣰا قَرِیبًا﴾ الفتح: ٢٧.واته: بێگومان خوا ڕاستی کرد لەگەڵ پێغەمبەری خۆی لەو خەوە ڕاستەدا کە دیبوی و بە گوێرەی ئەو خەوە ئێوە بە ئیزنی خوا ئەمین و بێ ترس ئەڕوتە ناو مەسجیدولحەرام و هەندێکتان سەرتان ئەتاشن و هەندێکیشتان موی سەرتان کورت ئەکەنەوەو لە کەس ناترسن، خوا شتێکی ئەزانی کە ئێوە نەتانئەزانی، بۆیە چونە مەککەو هاتنەدی خەوەکەی دواخست بۆ ساڵێکی تر و بێجگە لەوەش فەتحێکی نزیکی شاری مەککەی بڕیاردا.

چەندین ئایەتی تری لەو جۆرەش هەن.

### ٧-ئیعجازی باسکردن و دەرخستنی ئەوەی لەناو دڵاندایە:

باسکردنی ئەو شتە نهێنی و پەنهانانەی بەسەردڵی مرۆڤەکاندادێت و جگە لە پەروەردگاری زانا بە دڵەکان، هیچ کەس پێیان نازانێت، دەفەرموێت: ﴿إِذۡ هَمَّت



طَآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ آل عمران: ١٢٢.واتە: ئا لەو کاتەدا کە دو تاقم لە ئێوە، بەنوسەلەی خەزرەج و بەنو حاریسەی ئەوس خەتەرەی ئەوە هات بە دڵیاندا کە بێهێزی پیشاندەن و بترسن و ئەوەندەی نەمابو دوای جەماعەتی ئیبنو ئوبەی بکەون و هەڵێن، بەڵام خودا لەو خەتەرەیە پاراستنی و لە جەنگدا بەردەوام بون. ئەبێ مسوڵمانان هەر پشت بە خودا ببەستن و داوای یارمەتی و سەرکەوتن تەنها لەو بکەن.

بەبێئەوەی هیچ گوفتار و کردارێك ئەنجام بدەن..هەروەها فەرمویەتی: ﴿ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ الأنفال: ٧.واتە: باسی منەت و نیعمەتی خودا بکەن بەسەرتان کە چۆن بەڵێنی پێدان یەکێ لەو دو کۆمەڵەتان بکاتە نسیب، ئێوە حەزتان ئەکرد ئاسانەکەتان ببوایە بە نسیب. خوداش ئەیویست ئایینی خۆی بەرزبکاتەوەو قسەی جێگیر بکات بە وەحی و بە یارمەتیدانی مەلائیکەو، کافرە بەدنیازەکان بنبڕ بکات و هێز و توانایان نەهێڵێت.

هەر بەوجۆرەیش بو، کە پەروەردگار باسی کردبو، چەندین ئایەتی تری لەم شێوەیەش هەن.

## ٨-ئیعجازی پارێزرانی و دەستکاری نەکردنی:

قورئانی پیرۆز بە وشەو دەق و واتا بۆمان گوازراوەتەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەك خۆی بە پێشەواکانی گەیاندووە و، نە وشەیەکی فەوتاوە و نە واتایەکی گۆڕاوە و نە ڕیزبەندیەکەی شێواوە، پارێزراوە لە هەڵە و گۆڕان و، گۆڕانی کات و دوری شوێن کاری تێناکات، لەکاتێکدا کتێبەکانی تر تەنیا هەوڵی پارێزرانی واتایان دراوە ئەگەر وشەکانیشیان گۆڕابێت.



**٩-ئیعجازی واتای جۆراوجۆر و گۆڕاو و بونی واتای هاوشێوە لە سورەتەکانی تردا:**

لە سورەتێکدا لە مژدەو بەڵێن دەچێتە سەر ئاگادارکردنەوە و تۆقاندن، لە ئارەزوکردن بەرەو ترساندن، لە ڕابوردو بەرەو ئاینده، لە چیرۆك بۆ پەند، لە حوکم و بڕیار بۆ گفتوگۆ و دەمەتەقێ، نە لە واتا لادەدات نە لێی دوردەکەوێتەوە.

**١٠-ئیعجاز لە شێوازی ڕەوانبێژییەکەیدا:**

کورت و درێژی ئایەتەکانی لە شێوازەکەی دوری ناخاتەوە، هەروەك چۆن ڕێك و پێکییەکەیشی لانادات، لەکاتێکدا دەقەکانی تری شیعر و پەخشان ئەگەر بەشەکانیان کورت و درێژی تێکەوت کێش و سەروایان تێکدەچێت و دەشێوێت.

**١١-ئیعجاز لە ئاسانی لەبەرکردنی:**

قورئانی پیرۆز لەسەر هەمو زمانێك ئاسان و ڕەوانە، تەنانەت کەسی غەیرە عەرەبیش دەتوانێت لەبەری بکات و کتێبەکانی تر وەك قورئان لەبەرکردنیان ئاسان نییە.

**١٢-ئیعجازی قورئان لە بەرزبون و سەرکەوتنی بەسەر هەمو جۆرە دەقە ڕەوانەکانی شیعر و پەخشان:**

بەوەی کە هیچ زیادکردن و کەم کردنێك قەبوڵ ناکات، لە سەردەمانێکدا کە قسەی ڕەوانی ڕەوانبێژان و زمانزانانی تێدا بەربڵاوبو، دەبینی هەمو ئەوانە لە ڕوبەڕوبونەوەی قورئان و هێنانی هاوشێوەی قورئان شکستیان خوارد، هەروەکو خوای پەروەردگار تەحەددای کردون، دەفەرموێت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ الطور: ٣٣ - ٣٤.واته: یان ئەڵێن: ئەم



قورئانه‌ی بۆخۆی هه‌ڵبه‌ستووه. نه‌خێر ئه‌مانه تاقمێکن ئیمانیان نییه ده‌ی با قسه‌یه‌کی وا بهێنن ئه‌گه‌ر ڕاست ئه‌که‌ن.

جا کاتێ نه‌یانتوانی، په‌ته‌که‌ی بۆ درێژکردن و داوای لێکردن ته‌نیا ده سوره‌تی هاوشێوه‌ی قورئان بێنن: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا أُنْزِلَ بِعِلْمِ اللَّهِ وَأَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَهَلْ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴿١٤﴾﴾ هود: ١٣ - ١٤.واته: یاخود ئه‌ڵێن ئه‌م قورئانه‌ی به‌ده‌م خواوه هه‌ڵبه‌ستووه‌و هی خودا نییه! بلێ ده ئه‌گه‌ر ئازان و ئه‌توانن ١٠ سوره‌تی هه‌ڵبه‌ستراوی وه‌ك سوره‌ته‌کانی ئه‌و بێنن و بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ش بێجگه له خودا کێتان ئه‌وێ بانگی بکه‌ن و داوای یارمه‌تی لێبکه‌ن. جا ئه‌گه‌ر پێیان نه‌کرا ئه‌وا زۆر چاك بزانن ئه‌و قورئانه پیرۆزه به جۆرێ نازل کراوه هه‌ر خودا خۆی ئه‌زانێ و زۆر چاك بزانن هیچ په‌رستراوێکی ڕاسته‌قینه نییه خودای تاك و ته‌نیا نه‌بێ. ئایا ئێوه که بۆتان ده‌رکه‌ت قورئان موعجیزه‌یه، له‌سه‌ر ئایینی ئیسلام به‌رده‌وام ئه‌بن؟

کاتێ ئه‌وجاره‌ش شکستیان خوارد داوای لێکردن که ته‌نیا سوره‌تێکی هاوشێوه‌ی قورئان بێنن: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾ البقرة: ٢٣ - ٢٤.واته: ئه‌گه‌ر دودڵن له ڕاستی ئه‌و قورئانه‌ی ناردومانه‌ته‌خوار بۆسه‌ر به‌نده‌ی خۆمان، به وتاری ئاده‌میزادی ئه‌زانن، ده‌ی ئه‌گه‌ر وایه‌و ئازان تاقه سوره‌تێك له وێنه‌ی ئه‌و قورئانه بێنن و بێجگه له خودا هه‌مو ئه‌وانه‌ش بانگ بکه‌ن که به یاریده‌ده‌ری خۆتانیان ئه‌زانن تا یارمه‌تیتان بده‌ن. بێگومان به‌هه‌موتانه‌وه ناتوانن وێنه‌ی بێنن. ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌تان پێنه‌کرا



کە بێگومان پێشتان ناکرێت، دە خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە سوتەمەنییەکەی ئادەمیزادە و ئەو بتە بەردانەیە کە لە دنیادا ئەیانپەرستن و بە تەمای قازانجیانن. ئەو ئاگرە بۆ کافران ئامادەکراوە.

ئەوەتا لەکاتی هاتنەخوارەوەی قورئان تا ئێستا زمانی عەرەبی بە چەندین ڕۆڵ و گۆڕانکاریدا تێپەڕیوە، لە بەرزبونەوە و نزم بونەوەو فراوان بون و تەنگ بونەوە و چالاك بون و خاوبونەوەو شارستانییەتی و دەشتەکییەتی، بەڵام سەرەڕای ئەوەش قورئانی پیرۆز هەر بە بەرزی ماوەتەوەو، نور و هیدایەت پەخش دەکات و ڕەوانی و گەورەیی دەبەخشێ و ناسکی و جوانی لێدەچوڕێ و تائێستایش قورئانی پیرۆز ئاڵای ئیعجازی شەکاوەیەو تەحەددای هەمو جیهانیان دەکات کە هاوشێوەی بێنن[1]، دەفەرموێت: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴾ الإسراء: ٨٨.واتە: تۆ بڵێ: ئەگەر هەمو ئینسان و جین کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ناتوانن وێنەی بێنن، هەرچەند لەناو خۆشیاندا پشتی یەکتر بگرن.

(١) سەرچاوە: أعلام النبوة، للإمام أبي الحسن علي بن محمد الماوردي.



﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا
عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ
ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ
عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ
وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾

الأعراف: ١٥٧

## پێشەوانی ئایین

*ئیبراهیم ئەحمەد فیلوپس: قەشەیەکی مژدەدەربو، لەساڵی ١٩١٩ز لە ئەسکەندەرییە لەدایك بووە، ماستەری لە ئاییناسی (لاهوت)دا لە زانکۆی (برنستۆن)ی ئەمریکی وەرگرتووە، هەروەها چەند بڕوانامەیەکی بەرزیشی لە کۆلێژی لاهوتی میسری بە دەستهێناوە، ئەرکی فەرمی بە مەسیحی کردن و کارکردن لە دژی ئیسلام بو ، بەڵام قوڵبونەوەی لە ئیسلام بەرەو ئیسلام ڕێنمونی کرد، بەمەش لەساڵی ١٩٥٩ز بەفەرمی مسوڵمانێتی خۆی ڕاگەیاند و ژمارەیەکی زۆر خەڵك لەسەردەستی مسوڵمان بوون و خوای پەروەردگاریش حەجی ماڵی پیرۆزی خۆی بە قسمەت کردووە.

ئیبراهیم دەربارەی گەشتەکەی بەرەو ئیسلام دەڵێت: (لەکۆنگرەیەکی مژدەدەری مەسیحیدا بانگهێشت کرام تا قسەبکەم، لەو کۆنگرەیەدا زۆر قسەم کرد و هەرچی قسەی خراپ و تانەوتەشەر بو لە دژی ئیسلام گوتم، دوای ئەوەی قسەکانم تەواوبون، لەخۆمم پرسی: لەبەرچی من ئەو قسانە دەکەم لەکاتێکدا دەزانم درۆ دەکەم؟! بۆیە بەر لەکۆتایی هاتنی کۆنگرەکە مۆڵەتم وەرگرت و گەڕامەوە ماڵەوە، هەمو گیانم دەلەرزی، زۆر پەشۆکابوم، ئەو شەوە تا بەیانی لە کتێبخانەکەمدا خەریکی خوێندنەوەی قورئان بوم، زۆر لەسەر ئەو ئایەتە ڕاوەستام و زۆر کاریگەری لەسەر دانام، ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ۚ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الحشر:

٢١.واته: ئه‌گه‌ر ئێمه ئه‌م قورئانه‌مان بناردایه‌ته خواره‌وه بۆ سه‌ر كێوێ له جیاتیی ئه‌وه‌ی كه بۆ سه‌ر ئاده‌میزادمان ناردووه‌ته خواره‌وه، ئه‌و كێوه‌ت ئه‌دی له ترسی خوا سامی لێ نیشتووه‌و پارچه پارچه بووه، ئێمه ئه‌م جۆره نمونانه ئه‌هێنینه‌وه بۆ خه‌ڵك به‌هیوای ئه‌وه‌ی بیربكه‌نه‌وه له خواو له توانایی خواو له دوارِۆژو پاداشت و سزای ئه‌و دنیا.

هه‌ر له‌و شه‌وه‌دا بڕیاری خۆمم داو مسوڵمان بوم، پاشان هه‌مو منداڵه‌كانیشم له‌گه‌ڵمدا مسوڵمان بون).

له به‌رهه‌مه‌كانی: (محمد في التوراة والإنجيل والقرآن، المسيح إنسان لا إله، الإسلام في الكتب السماوية، اعرف عدوّك إسرائيل، المبشرون و المستشرقون في العالم العربي الإسلامي).

*ماری واتسۆن، خانمه مامۆستایه‌كی لاهوتی ئه‌مریكییه، زۆربه‌ی ته‌مه‌نی له كاری مژده‌ده‌ری له‌نێوان لۆس ئانجلۆس و فلیپین به‌سه‌ربردووه.

ڕۆژێكیان هاوڕێیه‌كی دوازده نامیلكه‌ی له‌سه‌ر ئیسلام پێداو ئه‌ویش بۆ ماوه‌ی هه‌فته‌یه‌ك خه‌ریكی خوێندنه‌وه‌یان بو، له‌كۆتاییشدا بۆی ده‌ركه‌وت كه ئیسلام ئاینی ڕاسته‌و خودا یه‌كه‌و هاوبه‌شی نییه و هه‌ر ئه‌وه له گوناه و تاوانه‌كان ده‌بورێت.

له ته‌مه‌نی چل ساڵیدا مسوڵمان بو و بووه هۆكاری مسوڵمان بونی كوڕه‌كه‌یشی كریستۆڤه‌ر.

كاتێك ده‌رباره‌ی هۆكاری مسوڵمان بونی پرسیاری لێكرا، گوتی: ئیسلام باشترین و ته‌واوترین ڕێبازی ژیانه.. ئه‌و ئه‌و پێوه‌ره‌یه كه هه‌مو بواره‌كانی ژیانی ئابوری و كۆمه‌لایه‌تی و..تاد پێده‌پێورێن.

هه‌روه‌ها گوتویه‌تی: (من بۆماوه‌ی هه‌شت ساڵ ئاینی مه‌سیحیم خوێند و به



هه‌فته‌یه‌ك مسوڵمان بوم).

وته‌یه‌كی جوانی هه‌یه ده‌ڵێت: (ڕۆژی مسوڵمان بونم، ڕۆژی له‌دایك بونمه) رجال و نساء أسلموا، لا١٣٢.

*كینیث جینكینز(عه‌بدوڵڵا فاروق) قه‌شه‌یه‌كی ئه‌مریكی بو، یه‌كێك بو له لایه‌نگره ده‌مارگیره‌كانی ئاینه‌كه‌ی، زۆر پرسیار هه‌بون كه نه‌یتوانی له ئاینه‌كه‌یدا وه‌ڵامه‌كه‌یانی ده‌ستبكه‌وێت، زانیارییه‌كانی له‌سه‌ر ئیسلام له‌وه تێپه‌ڕی نه‌ده‌كرد كه لای وابو كۆمه‌ڵێك ڕه‌شپێست ئاینێكی تایبه‌تییان بۆخۆیان دروستكردووه و ئاینێكه جگه له خۆیان كه‌سی دی قه‌بوڵ ناكات، به‌ڵام كاتێك گه‌شتی كرد به‌ره‌و سعودیه بۆی ده‌ركه‌وت كه ئیسلام ئاینێكه هه‌مو چین و توێژێك له‌خۆده‌گرێت، ئه‌وه‌ش ئاره‌زوی ناسینی ئه‌و ئاینه‌ی له‌لا دروستكرد و له‌ڕێگه‌ی قورئانی پیرۆز و ئه‌و كتێبانه‌ی له یه‌كێك له مسوڵمانانی ئه‌وێی وه‌رگرتبو وه‌ڵامی هه‌مو ئه‌و پرسیارانه‌ی ده‌ستكه‌وت كه به‌درێژایی ژیانی به‌دوایاندا ده‌گه‌ڕا، تا له‌كۆتاییدا مسوڵمان بو و ئێستایش كاری بۆ ده‌كات، ده‌ڵێت:

(وه‌ڵامی كێشه‌كانی مه‌سیحیه‌كانت له‌لای مه‌سیحیه‌كان خۆیان ده‌ستناكه‌وێت" چونكه زۆربه‌ی كات ئه‌وان خۆیان هۆكاری كێشه‌كانیانن.. به‌ڵام له ئیسلامدا چاره‌سه‌ری هه‌مو كێشه‌كانی مه‌سیحییه‌كان و مه‌سیحییه‌ت و هه‌مو ئاینه‌كانی تری جیهانت ده‌ستده‌كه‌وێت). رجال ونساء أسلموا، لا٤٥.

*ئیسحاق هیلال مه‌سیحه، قه‌شه‌یه‌كی میسری بو، له ساڵی ١٩٥٣ز له‌دایك بووه، بانگخوازی كڵێسا و سه‌رۆكی فه‌خری كۆمه‌ڵه‌ی ڕزگاركردنی خه‌ڵكی میسر بو له ئه‌فریقیا و ڕۆژئاوای ئاسیا، ده‌ڵێت: (ڕۆژێكیان چاوم كه‌وته‌سه‌ر سوره‌تی(الإخلاص): ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بێداربومه‌وه و گیانمی له‌رزاند، هه‌ر ئه‌و



سورەتەم دوبارە دەکردەوە تا لەبەرم کرد، کاتێك دەمخوێندەوە هەستم بە ئاسودەیی دەرون و ئارامی دڵ و دڵخۆشی گیانم دەکرد).

ڕۆژێکیان کە لەبەردەم کورسی دانپێدانان دانیشتبو تا دانپێدانانی ئەو کەسانەی گوێ لێبێت کە باوەڕیان بەوە هەیە کە لێخۆشبون لە تاوانەکان بە دەستی قەشەکانە" لەوکاتەدا ئافرەتێك هاتە لای و داوای لێخۆشبونی دەکرد، بەرلەوەی یەك وشە بڵێت ئایەتی ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی دەکەوێتە دڵەوە، دەڵێت: (زمانم لاڵ بو، زۆر بەکوڵ گریام، دەمگوت: ئەوە هاتووە تا داوای لێخۆشبون لەمن بکات، ئەدی کێ لە ڕۆژی قیامەتدا لە تاوانەکانی من خۆشدەبێت؟!) تا لە دواییدا مسوڵمان بو. رجال ونساء أسلموا،لا ٧.

*ناجیمۆ رامۆتی، لە غانا لە دایك و باوکێکی مەسیحی لەدایك بووە، کە هەردوکیان ئەندامی کڵێسای(البعثة المعمدانية) لە قوتابخانە مژدەدەرییەکاندا خوێندویەتی، کاتێ تەمەنی گەیشتە بیستساڵ وەکو مژدەدەرێك دەستی بەکارکرد، ڕۆژێکیان کتێبێکی لەسەر ئیسلام خوێندەوە کە یەکێك لە هاوڕێکانی پێی دابو، هەر لە گەڕان بەدوای ڕاستیدا بەردەوام بو تا لە پایزی ١٩٦٣ز مسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند. رجال ونساء أسلموا،لا ٥٤.

*بەشیر ئەحمەد شاد، لە ساڵی ١٩٢٨ز لە خێزانێکی مەسیحی هیندی لەدایك بووە، باوکی(ماتیاس) مژدەدەرێکی مەسیحی بو" لەبەرئەوە هەوڵی دەدا کوڕەکەیشی هەمان ڕێچکە بگرێت و، لە ساڵی ١٩٤٧ز خوێندنەکەی تەواوکرد و دەستی کرد بە کاری مژدەدەری لە (لاهور)، بەڵام-وەك زۆرکەسی تر- باوەڕی بە ئاینەکەی لەدەستدا و دوای بیست ساڵ لە گەڕان و ئێش و ئازار لە حوزەیرانی ١٩٦٨ز مسوڵمان بو. رجال ونساء أسلموا،لا ١٩.



*عیززەت ئیسحاق موعەوویز(محمد ئەحمەد ریفاعی)، قەشەیەکی میسری بو، یەکێك بو لە بانگخوازانی مەسیحی، لە کڵێسادا پلەی گەورەو جیاجیای وەرگرتووە تا گەیشتوتە پلەی (قومموص)، دوای قوڵبونەوەی لە لێکوڵینەوە لە بیروباوەڕەکەی هەستی گومانی لە هزردا پەیدابو بەرانبەر ئەو بیروباوەڕەی بانگەوازی بۆ دەکرد، لەبەرانبەردا بە گوێگرتن لە قورئان هەستی بە دڵخۆشییەکی زۆر دەکرد..لەو بارەیەوە دەڵێت:

(لەکاتێکدا کە لەبەرانبەر ئاینی مەسیحیدا گومانم لەلا دروست بوبو، شکڵ و شێوازی مسوڵمانان لەکاتی نوێژ و ئەو کەشە ئاینی و ڕۆحییەی ئەو شوێنەی داگیرکردبو..ئەو دیمەنە زۆر سەرنجمی ڕادەکێشا، سەرەڕای ئەوەی نەمدەزانی چی دەڵێن.. کاتێك قورئان دەخوێنرا زۆر بەوردی سەرنجم دەدا و گوێم لێدەگرت و لە دەروندا هەستم بە شتێکی سەیر دەکرد..هەروەها بە ڕۆژوگرتنی مانگی ڕەمەزان سەرسام بوم و هەستم دەکرد لە ڕۆژوی(الزیت)ی مەسیحییەکان زۆر باشتربو کە لەکتێبی پیرۆزدا نەهاتووە، با ددان بەوەدا بنێم کە بەر لە مسوڵمان بونم چەند ڕۆژوویێکی مانگی ڕەمەزانم گرتووە)لە ساڵی ١٩٨٨ز مسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند . رجال ونساء أسلموا، لا ١٢٢.

*یوسف ئێدوارد ئیستس، لەساڵی ١٩٤٤ز لە خێزانێکی پرۆتستانتی مەسیحی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەدایك بووە، بوەتە قەشە، لەساڵی ١٩٧٤ز ماستەری لە(هونەر) بەدەستهێناوەو دکتۆراشی لە ئایینناسی(لاهوت)دا وەرگرتووە، دوای ئەوەی لەگەڵ بازرگانێکی مسوڵماندا کار و گوزەران دەکات، لەساڵی ١٩٩١ز مسوڵمان دەبێت و کوڕەکەی و هاوسەرەکەی و دایکیشی لەگەڵدا مسوڵمان دەبن، پاشان لەنێوان ساڵانی ١٩٩١ز تا ١٩٩٨ز لە میسر و مەغریب و تورکیا توانی فێری زمانی عەرەبی و زانستە ئیسلامییەکان ببێت..لە ئەمریکادا کاری



بانگخوازی کردووەو-ئێستایش بەردەوامە-زۆر کاسێت و وتاری ئینگلیزیی هەن.رجال ونساء أسلموا، لا ٢٧.

*بێنیامین کلدانی(عبدالاحد داود)، مامۆستای ئاییناسی(لاهوت) بو و قەشەی هۆزی کلدانی کاسولیکی بو، چەند زمانێکی زانیوەو بۆماوەیەکی زۆر لە جیهانی دەرەوە دورکەوتوتەوەو لە ماڵەکەیدا گۆشەگیربووە بوتەوەی کتێبی پیرۆز بە زمانە کۆنەکانی بخوێنێتەوە و بەراوردی نێوان دەقەکان بکات، هەندێك لەو هەوڵانەی لە کتێبی(محمد فی الکتاب المقدس)دا باس کردون، لە کۆتاییدا لەشاری ئیستەنبوڵ مسوڵمان بو..لەو کتێبەدا دەڵێت:

(لا إله إلا الله محمد رسول الله، ئەو بیروباوەڕە هەمیشە بیروباوەڕی هەمو باوەڕدارێکی ڕاستەقینە دەبێت.. من بەتەواوی دڵنیام کە تاکە ڕێگا بۆ تێگەیشتن لە کتێبی پیرۆز توێژینەوەیەتی لەدیدێکی ئیسلامییانەوە) لا١٦٢.

بەرهەمێکی تریشی هەیە بەناوونیشانی(الإنجیل والصلیب).

*ئارسەر میلاسنتۆس، پرۆفیسۆرێکی بەریتانییە، دکتۆرای لە ئاییناسیدا هەیەو سێیەم کەسایەتی کۆمەڵی کڵێساکانی ئاسیابو..لەمیانەی کارکردنیدا بۆبڵاوکردنەوەی مەسیحییەت لەساڵی ١٩٨٣ز دا بڕیاریدا بۆ بەرەنگاربونەوەی مسوڵمانان قورئان بخوێنێتەوە، لەو بارەیەوە دەڵێت: (لەسەرەتادا هەستم بە ململانێیەکی دەرونی توند دەکرد، دەنگێك بانگی دەکردم و هانی دەدام کە بێمە سەر ئەو ئایینە کە تێیدا بەندە پێوەندیەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ پەروەردگاریدا هەیە و پێویستی بەقەشە نییە بێتە نێوانەوەو بلیتی لێخۆشبونیش نابەخشرێتەوە-وەك لە ئایینی مەسیحیدا هەیە-ڕۆژێکیان دەستنوێژم شوشت و دەستمدایە قورئان، ئەو ئایەتەم خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ محمد:

٢٤واته: ئه‌مانه بۆ بیر له قورئان ناکه‌نه‌وه‌و لێی ورد نابنه‌وه تا لێی حاڵی بن، یان دڵیان قوفڵی لێ دراوه‌و کلیل و کلۆم کراوه‌و هیچی تێ ناچێ؟

دوای خوێندنه‌وه‌ی ئه‌و ئایه‌ته موچڕکم به‌له‌شدا هاتن، پاشان ئه‌و ئایه‌ته‌م خوێنده‌وه که ده‌فه‌رموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ المائدة: ٣.واته: ئه‌مڕۆ ئایینم بۆ ته‌واو کردن و ئایه‌ته‌کانم هه‌موو بۆ ناردن و، ڕێو شوێنی ئایینی ئیسلامتان بۆ ڕوون بوویه‌وه‌و نیعمه‌تی خۆمم ڕژاند به‌سه‌رتاندا و له‌ناو هه‌موو ئاینه‌کاندا ئایینی ئیسلامم بۆتان هه‌ڵبژارد.

ئیتر ئه‌و گیانه سه‌رگه‌ردانه‌م ئاسوده‌بو و وام هه‌ست ده‌کرد وه‌ك بڵێی تازه له‌دایك بومه‌ته‌وه).

له وته‌یه‌کی جوان و ناوازه‌یدا ده‌ڵێت: (پێش ئیسلام به‌نده‌ی خوم بوم، به‌لأم دوای ئیسلام به‌نده‌ی خودام)، به‌م شێوه‌یه ئارسه‌ر میلاسنتوس مسوڵمان بو و ناوی خوی گوڕی بو خالید میلاسنتوس. رجال ونساء أسلموا، لا ١٥٢.

*فریدریك دولامارك، گه‌وره‌ی ئه‌سقفه‌کانی جوهانسبێرگ بو، به حه‌ق بێژی و دادگه‌ری به‌ناوبانگ بو، مسوڵمان بو، مسوڵمان بونی شاری جنێفی سویسری توشی سه‌رسوڕمان کرد، دوای مسوڵمان بونی ده‌ستیکرد به بلاوکردنه‌وه‌ی ئایینی ئیسلام له کیشوه‌ری ئه‌فریقادا، ئه‌و به‌پێویستی ده‌زانی که ڕێگاکانی بانگه‌واز نوێ بکرێنه‌وه‌و پێشبخرێن، چونکه ئه‌و وایده‌بینی که که‌موکوڕی زۆر له‌ولایه‌نه‌دا هه‌یه.

*جان ماری دوشمان(عبدالمجيد جان ماری دوشمان) قه‌شه‌یه‌کی فه‌ره‌نسی بو، زۆر به‌وردی له‌و ئایه‌تانه‌دا ڕاماوه که ئاراسته‌ی خاوه‌ن کتێبه‌کان کراون، له‌وانه: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ﴾ النساء: ١٧١.واته: ئه‌ی ئه‌هلی کیتاب! زیاده‌ڕه‌وی مه‌که‌ن له دینی خۆتاندا. خودای ته‌نها به



خودا بزانن و پێغەمبەرەکان بە بەندەی خودا بزانن.

لەڕێی ڕەوەندی ئیسلامی لە فەرەنسا زیاتر بە ئیسلام ئاشنابو، تاوای لێهات بووە بەراوردکاری نێوان ئاینی مەسیحی و ئیسلام، لە مانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژوبو لە کاتێکدا هێشتا قەشەیەکی مەسیحی بو و لە دەوروبەری لۆمانس خەریکی نوێژخوێندن و ئامۆژگاری و بانگخوازی بو، لە ساڵی ١٩٨٣ز چووە مزگەوتی پاریس تا بەفەرمی مسوڵمان بونی خۆی ڕابگەیەنێت، دواتر فەرەنسای بەجێهێشت و بەرەو شاری(دارالبیضاء)ی مەغریبی عەرەبی کەوتەڕێ، چونکە زۆر ئارەزوی ئەوەی دەکرد کە ئەگەر مرد لە زەویەکی ئیسلامیدا بنێژرێت، لەوێدا توشی سەرسوڕمان بو، کاتێك ئەو جیاوازییەی بینی کە لەنێوان دیدی خۆی بەرانبەر ئیسلام و حاڵی مسوڵماناندا بەدیکرد، لەساڵی ١٩٨٨ز لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا لە مەغریب کۆچی دوایی کرد.رجال ونساء أسلموا، لا ١٢٨.

*ئیدریس تۆفیق:

(لەسەر ڕێگای ڤاتیکان بۆ میسر)، ئەمە ئەو ناونیشانەیە کە چیرۆکی مسوڵمان بونی کورتدەکاتەوە، ئەو بۆماوەی پازدەساڵ لە کۆمەڵی برایانی(دیَ لا سالی) ئەندام بو، پاشان لە ڕۆما ئایینناسی خوێند، بەڵام لە بەرانبەر ئایینەکەیدا گومانی لەلا دروست بو و وەکو گەشتیارێك بەرەو قاهیرە بەڕێکەوت، بەمەبەستی گۆڕینی جێگای ژیان و گوزەرانی، ئا لەوێدا بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا لەگەڵ مسوڵماناندا تێکەڵ بو و لەگەڵیاندا کەوتە گفتوگۆ و لە نزیکەوە ئاگاداری دروشمە ئایینییەکانیان بو، دەیدی کە بانگ دەدات چۆن مسوڵمانان هەمو چالاکییەکانیان ڕادەگرت و بەرەو مزگەوت دەچون تا بە خشوعەوە نوێژ بکەن، بەمەش کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دەرونی ئەودا بەجێهێشت..ئیدریس تۆفیق دەربارەی ئەو قوتاغەی ژیانی دەڵێت: (ئەو هەفتەیە لە هەمو تەمەنم لەسەر ژیانم کاریگەری زیاتر بو و خەریك بو تۆوی ئیسلامی لە



دەرونی مندا دەچاند، جاری یەکەمم بو لەگەڵ مسوڵمانانندا ڕوبەڕوبم و ڕوبەڕو قسەیان لەگەڵدا بکەم، بەهیچ جۆرێك مسوڵمانان توندڕەو و شەڕاوی نەبون، بەڵکو مرۆڤی سادەو ئاسایی بون، لەوەش زیاتر زۆر نەرمونیان بون و دەرونیان پڕبو لە باوەڕێکی وا کە لە ژیانمدا هاوشێوەیم نەدیبو).

کاتێ گەڕایەوە بەریتانیا، دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە لە ئایینی مەسیحی، بەڵام ڕوداوی ١١ی سێپتەمبەر بووە پاڵنەرێك بۆئەوەی زیاتر لە ئیسلام بکۆڵێتەوە، هەروەها لەو قۆناغەی ژیانیدا یوسف ئیسلام(کات ستیڤنس)ی لە مزگەوتی گەورەی لەندەن دیت، لێی پرسی: (دەبێ مرۆڤ چ بکات ئەگەر بیەوێت ببێتە مسوڵمان؟).

یوسفیش وەڵامی دایەوە: (پێویستە مسوڵمان باوەڕی بە خودایەکی تاك و تەنیا هەبێت و لەڕۆژێکدا پێنج نوێژ بکات و لە مانگی ڕەمەزانیشدا بەڕۆژوبێت).

(ئیدریس)قسەی پێبڕی و گوتی: (من باوەڕم بە هەمو ئەوانە هەیەو لەگەڵ قوتابییە مسوڵمانەکانمدا لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوبوم).

یوسفیش پێی گوت: (ئەدی چاوەڕێی چی؟ لەو کاتەشدا بانگ درا(قامەت کرا) و هەمویان ڕیزبون بۆ نوێژ، ئیدریسیش لەدواوە دانیشتبو زۆر بەکوڵ دەگریا، لەخۆی دەپرسی: (دەتەوێ فێڵ لە کێ بکەی؟) .

ماوەیەك بەر لە ئێستا بە دیداری گەیشتم و دەربارەی چیرۆکی مسوڵمان بونی پرسیارم لێکرد، بۆماوەیەکی دورودرێژ قسەمان کرد، دواتر دەربارەی هۆکاری سەرەکی مسوڵمان بونی پرسیارم لێکرد، وەڵامی دامەوە: تەنیا کاری خودا بو و هیچی تر).

ئیدریس لە قاهیرە بە فەرمی مسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند.

دەربارەی ئیسلام گوتویەتی: (ئیسلام ئایینێکە کە دروشمەکانی تەنیا ڕۆیشتن نییە لە یەکشەمماندا بۆ کڵێسا و هەمو بەیانیان بۆ(القداس)..ئیسلام فێرت دەکات چۆن



سلاو له خەڵك بكەی، چۆن خواردن بخۆی، چۆن دەچیته ژورەكەت-ماڵەكەت-..هەمو شتێكی ژیانت فێردەكات..ئیسلام مسوڵمانان هان دەدات كه هەمو ساتێك بەخوداوه پەیوەست بن و بیر له زاتی ئەو بكەنەوه، هەروەها دەڵێت: (من باوەڕم وایه ئەو كەسانەی بونەته مسوڵمان هێمنی و ئاسایش و ژیانی سادەییان دۆزیوەتەوه كه لەدەستیان دابو).

زۆر كەسی دیش هەن كه خودا منەتی ئیسلامی بەسەردا ڕشتون و بۆ نوری خۆی ڕێنمونی كردون، لەوانه:

-قەشه ئەنتۆنیۆ مەقار، خاوەنی كتێبی(لماذا أسلمت؟).

-قەشه (كەنەدی تۆماس ئەرفەنج).

-دكتۆری میسری وەدیع ئەحمەد شەمماس.

-سەرۆكی ئەسقوفەكانی لۆسری تەنزانی، ئەبوبەكر موایبیۆ.

-ڕاهیبی فلیپینی ماركۆ كۆریس.

-قەشەی میسری فەوزی سوبحی سەمعان.

-قەشەی ئەندۆنیسی ڕەحمە بۆرنۆمۆ.

-شەمماسی میسری، سەیفولئیسلام تەهامی.

-مژدەدەری ئەڵمانی جێ میشێل.

-قەشه محمد فوئاد هاشمی.

-زۆری دیش هەن له پیاوانی ئایین، لەوانەی مسوڵمان بوون، لەوانەی دەیانناسین و ئەوانەیش كه نایانناسین..بەڵام خودا دەیانناسێت.

* * *

## زانایان و پزیشکان

﴿ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ المائدة: ١٦ واته:ئەو کەسانەی دوای ڕەزامەندی خودا بکەون و مەبەستیان بیّ لیّی ڕازی بیّ، خودا بەئیزنی خوّی بەهوّی ئەو قورئانەوە لەتاریکی کوفر دەریان ئەهیّنیّ و ئەیانخاتە ڕووناکی ئیسلام و، شارەزای ڕیّگای ڕاستیان ئەکات و بەرەو بەختیاری دنیاو قیامەتیان ئەبات.

*جیفری لانگ، پرۆفیسۆری بیرکارییە، بەرەگەز ئەمریکییە، مسوڵمان بووە و کتیّبی (الصراع من اجل الايمان)ی داناوە، کەتیایدا باسی چیرۆکی مسوڵمان بونی خۆی کردوە، لەکتیّبی (حتى الملائكة تسأل)دا دەڵیّت :( پیّش مسوڵمان بونم خۆشەویستی لای من مانەیەکی نەبو، بەڵاّم کاتیّ قورئانی پیرۆزم خویّندەوە هەستم کرد سۆزو خۆشەویستییەکی فراوان لەخۆیم دەگریّت، ئیتر لەدڵمدا هەستم بەگوڕو تینی خۆشەویستی دەکرد، ئەوەی منی بەرەو ئیسلام ڕیّنمونی کرد خۆشەویستی بیّ ئەندازەی خودای پەروەردگار بو) لا ٢١١.

پاشان داوا لەخودا دەکات و دەڵیّت:( پەروەردگارا ئەگەر ڕۆژیّ لەرۆژان خەریك بو دووبارە بەرەو بیّ باوەڕی دەڕۆیشتم، خودایە بەر لەوە ژیانم کۆتایی پیّبیّنەو، لەو ژیانە ڕزگارم کە، خودایە من ناتوانم تەنانەت ڕۆژیّکیش بەبیّ باوەڕی تۆ بژیم) لا ٢٣٤.



*عەبدولكەریم جرمانۆس: ( خۆزگەم دەخواست سەد ساڵ بژیم تاهەموو ئاواتەكانم لەخزمەتی زمانی قورئاندا وەدی بێنم).

ئەمە قسەی زانای مەجەری(عەبدولكەریم جرمانۆس)ە، ئەوەی(عەققاد) بە(دە زانا لەیەك زانادا) وەسفی دەكات.. جگە لەزمانی خۆی حەوت زمانی زانیوە، ئەوانیش: عربی_فارسی_ توركی_ ئوردی _ ئەڵمانی_ ئیتاڵی و ئینگلیزی و، زیاتر لەسەدو پەنجا كتێبی بەزمانە جۆراو جۆرەكان نوسیوە..

دكتۆر (عەبدولكەریم جرمانۆس)دەڵێت: (بەهۆی پاكی و بێگەردی ئاینی ئیسلامم لەلا خۆشەویست بو: پاكو بێگەردی جەستەو ڕەفتاری كۆمەلأیەتی و هەستی مرۆڤایەتی...)النفخة السلامية في سير أعلامها المعاصرين، د.محمد رجب البيومي. ٢٠/ ٤٢١

هەروەها دەڵێت:( لەدڵی مسوڵمانانندا چەندان گەنجینەم دۆزییەوە، كە زۆر لەزێڕ بە بەهاتر بون، ئەوان هەستی خۆشەویستی و برایەتییان پێبەخشیم، فێری كاری چاكەیان كردم، فێری فەرمان بەچاكەو ڕێگری لەخراپەیان كردم، پێویستە مسوڵمانان دەست بەو بەها ڕەوشتیانە بگرن، كەپێی ناسراون و بەدوای باق و بریقی ڕۆژئاوانەكەون، چونكە لەباق و بریقێكی درۆیینەو ساختە هیچی تر نییە)هؤلاء المثقفون اختاروا السلام، محمد عثمان، لا٣٥.

هەروەها دەڵێت:( لەدروشمەكانی ئیسلامدا وشەیەك نادۆزیتەوە ڕێگر بێت لەبەردەم پێشكەوتنی مسوڵمان دا، یاخود ببێتە هۆی زیاد بونی پشكی لەسامان و هێز و زانیاری دا.. هیچ دروشمێكیش لەئیسلامدا نییە، كە نەتوانرێ جێ بەجێ بكرێ، ئەمەش موعجیزەیەكە، كەبەهۆیەوە لەڕێچكەو ڕێبازەكانی تر جیا دەكرێتەوە، چونكە ئیسلام ئاینی دید و هزری ڕوناكە و لەئایندەشدا بیروباوەڕی مرۆڤە جیاوازەكانی



جیهانە) هەمان سەرچاوە.ل٣٦٦.

لەبەرهەمەکانی(معانی القرآن)، (الله اکبر)، (شوامخ الأدب العربي)، (الحركات الحديثة في الاسلام).

*(تاگاتات تاگسن)سەرۆکی بەشی شیکاری زانکۆی (شیانك می)یە لەتایلاند، ئەو ڕاستییە زانستیيانەی لە قورئانی پیرۆزو فەرمودەی پێغەمبەردا هەن لەگەڵ دواین توێژینەوە زانستییەکاندا یەکدەگرنەوە ئەویان توشی سەرسوڕمان کرد، بۆ کۆنگرەی هەشتەمی پزیشکی لەسعودیە بانگهێشت کرا، کەتیایدا زانایانی مسوڵمان و نامسوڵمان بەشداربوون، لەکۆتایی کۆنگرەکەدا، پرۆفیسۆر تاگسۆن هەستایەوەو مسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاندا، ئەمەش دەقی وتەکانیەتی:( من باوەڕی تەواوم هەیە کەهەموو ئەو شتانەی لەقورئانی پیرۆزدا باسکراون دەکرێ بەزانستییانە بسەلمێنرێن، لەبەر ئەوەی (محمد)ی پێغەمبەری ئیسلام نەخوێندەوار بووە، کەواتە هەموو زانیاریيەکانی لەڕێی وەحیەوە لەوەدیهێنەرێکی زانا بەهەموو شتێك وەرگرتووە: من باوەڕم وایە، کەکاتی ئەوە هاتوە، شایەتی بدەم و بڵێم: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله..)( رجال ونساء أسلموا، لا١٨٥.)

*مۆریس بۆکای، پزیشکێکی فەڕەنسییە، لەبنەماڵەیەکی کاسۆلیکی لەدایك بووە، ئەکادیمیای فەڕەنسا لەساڵی ١٩٨٨ز دا خەلاّتێکی لە مێژو پێبەخشی، سەرۆکی نۆژدارانی فەرەنسا و بەرپرسی یەکەمی توێژینەوەی جەستەی مۆمیا کراوی فیرعەون بوو، کەلەکۆتاییەکانی هەشتاکان لەفەڕەنسا توێژینەوەی لەسەر کرا، دوای پشکنینی جەستە مۆمیاکراوەکە( بۆکای) توشی شۆك بوو، کاتێك یەکێك لەهاوڕێکانی پێی ڕاگەیاند، کە مسوڵمانان دەڵێن، کەلە قورئانەکەیاندا باسی فیرعەون هاتووە، کە چۆن دوای ئەوەی فیرعەون خنکاوە خودا جەستەکەی ڕزگار کردوەو پاراستویەتی،



( بۆکای) پرسی؟ چۆن ئەوە دەچێتە ئەقڵەوە، لەکاتێکدا تا ساڵی ١٨٩٨ز دا ئەمە ئاشکرا نەبووە لەکاتێکدا بەر لە١٤٠٠ساڵ لە قورئاندا باس کراوە؟..

چۆن! لەکاتێکدا کە عەرەبەکان تاماوەیەك بەر لەئێستا هیچیان دەربارەی میسرییە کۆنەکان نەدەزانی کە جەستەی فیرعەونەکانیان مۆمیا دەکرد؟.. ئەو پرسیارانە وایان لە بۆکای کرد، کەکتێبە پیرۆزەکانی هیندییەکان و مسوڵمانەکان دیراسە بکات لەگەڵ ئەو دەرەنجامانەدا بەراوردیان بکات، کەپێیان گەیشتووە، تائەو رۆژە هات، کە بۆکای گەیشتە ئەو ئایەتەی خودای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ یونس: ٩٢واتە:ئەمڕۆ لاشەکەت بەبێ گیان لەنوقوم بوون رزگار ئەکەین و ئەیخەینە سەر ئاو تا خەڵك بەخنکاوی بتبینن و، ببێتە پەندو عیبرەت بۆ ئەوانەی لە پاش تۆ دێن و، بزانن ئەنجامی ستەمکار نەمان و لەناو چونە.بێگومان زۆر کەس لە ئایەتەکانی ئێمە بێ ئاگان و تێیان نافکرن.

ئەو ئایەتە زۆر گاریگەری لەسەر ئەقڵی بۆکای دروستکرد، دەرونی هەژاند، تاوای لێکرد لەبەردەم ئامادەبوان دا هەستێتەوەو بەهەموو هێزی هاوار بکات:( من مسوڵمان بوم و باوەڕم بەم قورئانە هێنا)..

ئا بەم شێوەیە(مۆریس بۆکای) مسوڵمان بوو، کتێبی(تەورات و ئینجیل و قورئان و زانست)ی نوسی، کە بەگرینگترین کتێب لەبواری لێکۆڵینەوە لە کتێبە پیرۆزەکان لەژێر رۆشنایی زانستی هاوچەرخدا دادەنرێ ، کەبۆ نزیکەی حەڤدە زمان وەرگێڕدراوە..(بۆکای) بۆماوەی(دە) ساڵ تەنیاو تەنیاخەریکی بەراوردکردنی دۆزینەوە زانستییەکان بو لەگەڵ قورئان و، بەدوای تەنیا یەك تاکە راستی زانستی دا دەگەڕا، کەلەگەڵ قورئاندا تێك بگیرێت، تا دوا جار گەیشتە دەرەنجامی فەرموودەی پەروەردگار:



﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَـٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾ فصلت: ٤٢واته:. كتێبێكه شتی هیچ وپوچی نه‌له پێشیه‌وه‌و نه‌له دوایه‌وه تێدا نییه، واته نه له‌باسی ڕابوردووی و نه‌له‌باسی ئاینده‌دا شتی ناڕاست و نادروست نییه‌و، له‌لایه‌ن خوایه‌كه‌وه هاتوه‌ته خواره‌وه، كه خاوه‌ن حیكمه‌ته و ستایش كراوه .

(بۆكای) له كتێبی(ته‌ورات و ئینجیل و قورئان و زانست)دا ده‌ڵێت: ( قورئانی پیرۆزم به‌جه‌خت كردنه سه‌ر ئه‌و دیارده سروشتیه زۆرو زه‌وه‌ندانه‌ی باسی ده‌كات توێژیوه‌ته‌وه، باسی وردی هه‌ندێ له‌و دیاردانه سه‌رسامیان كردم، ئه‌و شتانه‌ش ته‌نیا له ده‌قی ئه‌سڵی قورئاندا هه‌ستیان پێ ده‌كرێت، ئه‌وه سه‌رسامی كردم، كه‌به‌ته‌واوی له‌گه‌ڵ ئه‌و چه‌مك وزانیارییانه یه‌كده‌گرێته‌وه، كه‌ئێمه له‌م ڕۆژگاره‌دا هه‌مانه و، به‌هیچ جۆرێ له‌توانای هیچ مرۆڤێكی سه‌رده‌می( محمد) نه‌بوه، كه‌هیچ زانیارییه‌كیان له‌سه‌ر ئه‌و دیاردانه هه‌بێت)لا١٤٥.

*كیث مور، یه‌كێكه له‌گه‌وره‌ترین زانایانی شیكاری و كۆرپه‌له‌ناسی له‌جیهان دا، خه‌ڵاتی(گرانت)ی له‌كۆمه‌ڵه‌ی كه‌نه‌دی بۆ پسپۆرانی شیكاری له‌ساڵی١٩٨٤ز وه‌رگرتوه و سه‌رۆكی ئه‌و به‌شه‌یه له زانكۆی (تۆرینتۆ) له‌كه‌نه‌دا.

له كۆنگره‌ی یه‌كه‌می ئیعجازی زانستی له‌قورئانی پیرۆزو له‌فه‌رموده‌ی به‌پێزدا، كه‌له‌ساڵی١٩٨٤ز له‌قاهیره به‌سترا، له‌وتاره‌كه‌یدا گوتی:(.. وا نازانم، كه(محمد) یان هه‌ركه‌سێكی دی بتوانێت قۆناغه‌كانی كۆرپه‌له‌و ئه‌و گۆڕانكاریانه‌ی به‌سه‌ر كۆرپه‌له‌دا دێت باس بكات، چونكه ئه‌و پێشكه‌وتنه تا كۆتایی سه‌ده‌ی بیسته‌م ئاشكرا نه‌بوو، بۆیه ده‌مه‌وێ جه‌خت له‌سه‌ر ئه‌وه بكه‌مه‌وه، كه‌هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی له‌قورئانی پیرۆزدا له‌سه‌ر گه‌شه‌كردنی كۆرپه‌له له‌ناو ڕه‌حمدا خوێندومه‌ته‌وه كت و مت وه‌ك ئه‌و زانسته‌یه، كه‌من ده‌رباره‌ی كۆرپه‌له ناسی هه‌مه).رجال ونساء أسلموا، لا١٨٢.

* د. گاری میله‌ر( عه‌بدولئه‌حه‌د عومه‌ر)، زانایه‌كی بواری بیركاری كه‌نه‌دییه،

قەشە بوو بانگەوازی بۆ مەسیحیەت دەکردو، یەکێك بوو لە گەورەترین بانگەوازخوازان، بەمەبەستی گەڕان لەچەند هەڵەیەك لە قورئانی پیرۆزدا بۆئەوەی بۆ بانگەوازەکەی یارمەتی بدات خەریکی دیراسەکردنی قورئان بو، بەلأم لەکۆتایی دا بۆی دەرکەوت کتێبەکە شتی وای تێدا هەیە، کەلە هیچ کتێبێکی تری جیهان دا نییە، ئایەتێکی پیرۆز زۆر سەرنجی ڕاکێشا، ئەو ئایەتەی دەفەرموێت:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا ﴾

النساء: ٨٢ واتە: بۆ لەم قورئانە ورد نابنەوە؟بۆ باش بیری لێناکەنەوە تابۆتان دەرکەویٚ کەلامی خودایەو لە غەیبەوە هاتوە؟ ئەگەر قسەی خودا نەبوایەو هی یەکێکی تر بوایە جیاوازی و ناکۆکییەکی زۆریان تێدا ئەبینیەو، هەندێکی پاراو و هەندێکی ناپاراو و، هەندێکی ڕەوان و هەندێکی نا ڕەوان و، هەندێکی لەگەڵ عەقڵ گونجاو و هەندێکی نەگونجاو دەبوو.

ئەو بڕوای وابو، کەیەکێك لە بنچینە سەردەمییەکان بریتییە لە دۆزینەوەی هەڵەو ڕاستکردنەوەیان لە تیۆرو توێژینەوەکاندا، بۆ ئەوەی ڕاست بکرێنەوە، لە کاتێکدا قورئانی پیرۆز مسوڵمان و نامسوڵمانان بانگ دەکات بۆ ئەوەی تاکە هەڵەیەکی تێدا بدۆزنەوە..

دوای ئەوەی مسوڵمان بو، بەخەڵکی دەگوت:( ئەی مسوڵمانان، ئەگەر درك بەگەورەیی ئەو خەڵاتە دەکەن، کەهەتانە، ئەوا سوپاسگوزاری خودا بکەن، کە لە دایك و باوکێکی مسوڵمان لەدایك بوون، و لەنێو گرۆی مسوڵماناندا پەروەردە بوون و لەسەر ئەو ئاینە گەورەیەدا گەورەبوون..)

هەروەها دەڵێت:( ئەوەی منی بۆ ئەو ئاینە ڕاکێشا، ڕونی بیروباوەڕەکەی بو، ئەو ڕونییەی لەهیچ بیروباوەڕێکی تردا نایبینم) رجال ونساء أسلموا. لا٦٣.

*د.ئەحمەد نەسیم سوسە، توێژەرو ئەندازیارەو ئەندامی کۆمەڵەی زانستی



عێراقیه، و یه‌كێكه له‌دیارترین پسپۆرانی مێژو له عێراق دا، پێشتر جوله‌كه بو، به‌لاّم به‌هۆی سه‌رسام بوونی به‌قورئانی پیرۆز مسولّمان بوو، پاشان له توێژینه‌وه‌یه‌كدا زۆر قسه‌ی له‌سه‌ر زایۆنیزمی جیهانی (الصهیونیة العالمیة) كردووه‌و له ڕوی مێژوییه‌وه ڕه‌تی ده‌كاته‌وه .

له‌به‌رهه‌مه‌كانی:( مفصل العرب والیهود في التأریخ)، ( في طریقي الی الاسلام) و چه‌ند به‌رهه‌مێكی تر.(رجال ونساء أسلموا، لا٣٠٢).

# بیرمەندان

﴿فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾﴾ آل عمران: ١٧٤.واتە: جا کە شەڕ تازە نەبوویەوەو کافرەکان بەرەو مەککە گەڕانەوە، ئەو موسوڵمانانە شوێنەکەیان بەجێ هێشت و، بە کۆڵێ نیعمەت و کەرەمی خوداوە گەڕانەوەو، باوەڕیان بە خوداو یارمەتیدانی بەهێزتر بوو. هەروەها لەو شوێنەدا هەندێ مامەڵەیان بۆ ڕێککەوت کە قازانجی باشیان تیا دەستکەوت. بێجگە لە مانەش هیچ جۆرە زیانێکیان تووش نەبوو، هەوڵیاندا بۆ ڕەزامەندیی خودا کە سەرچاوەی هەموو بەختیارییەکە. بێگومان خودا خاوەنی بەخششێکی گەورەیە.

*عەبدوڵلا کویلیم، بیرمەندێکی ئینگلیزییە لە ساڵی ١٨٠٦ز لە دایك بووە، لە ساڵی ١٨٨٧ز بووەتە مسوڵمان، نازناوی (شێخ عەبدوڵلا کویلیم)ەو یەکەمین مسوڵمانی ئینگلیزە کە بانگەوازی بۆ ئیسلام کردووە، لۆرد (ستانلی ئۆڵدرلی) و لۆرد(هیدلی) لەسەر دەستی ئەو مسوڵمان بوون..دوای مسوڵمان بونی ئازار و ئەشکەنجەی زۆری دیوە..بەم شێوەیە بۆمان باس دەکات: (لە وێنەکانی ئازارداغان لەلایەن ئەو بێبەزەییانەوە ئەوەبو کە لەکاتی نوێژکردندا پیسییان بەسەر نوێژکەراندا دەکرد و وردە شوشەیان دەخستە سەر بەڕماڵ تا نێوچاوانمان برینداربێت).

(کوێلیم)چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە بەسەری هاتووە، دەڵێت: (جارێکیان من و برایانم چوینە مزگەوت تا وتارێکیان بۆ بدەم، کاتێك چوینە ناو مزگەوت چەند کەسێکی نامۆمان لە مزگەوت دیت، من گوێم بەوە نەدا و دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان و لێکدانەوەیان، کاتێك لە وتارەکەم بومەوە، یەکێك لە کەسە نامۆکان هەستایەوە بەردێکی لە گیرفانی دەرهێناو فڕێی دایە سەر زەوی،



پاشان به هاوڕێکانی گوت: (هەرکەسێك لە ئێوە دەیەوێت بەرد دە مسوڵمانان بگرێت با منیش بەرد باران بکات، چونکە من مسوڵمان بوم) پاشان ئەوانیش بەردەکانیان فڕێداو هەمویان مسوڵمان بون.. ئەو پیاوەی سەرکردەیان بو دواتر بووە دەستەڕاستی من و ناوی خۆی گۆڕی بۆ (جمال الدین).

له بەرهەمەکانی: (العقیدة الاسلامیة)، (أحسن الأجوبة)رجال ونساء أسلموا، لا٣٠٤.

*لیۆپۆڵد ڤایس، بیرمەند و ڕۆژنامەنوسێکی نەمساوییە، لە دایك و باوکێکی جولەکە لەدایك بووە، مسوڵمان بوە و ناوی خۆی گۆڕی بۆ (محمد ئەسەد)، بە یارمەتی (ویلیەم بەکتول)-کە ئەویش مسوڵمان بو- توانیان گۆڤاری (الثقافة الإسلامیة) لە حەیدەرئاباد لە ساڵی ١٩٢٧ز دابمەزرێنن، لەو گۆڤارەدا چەند توێژینەوەیەکی بەهێزیان لەسەر ڕاستکردنەوەی ڕۆژهەڵاتناسان لە بەرانبەر ئیسلام بڵاوکردنەوەو، سەحیحی بوخاری وەرگێڕاو لێکدانەوەی بۆکرد.

لە پێشەکی کتێبی(الإسلام علی مفترق الطرق) دا دەڵێت: (ئیسلام وەکو ڕوناکی هاتە نێو دڵی تاریکمەوە، تا بۆ هەتاهەتایە تێیدا بمێنێتەوە..ئەوەی منی بەرەو ئیسلام ڕاکێشا ئەو بینا گەورە تەواو و تۆکمەیەیە، کە ناتوانرێ وەسف بکرێت..تا ئێستایش و سەرەڕای هەمو ئەو کۆسپ و تەگەرانەی بەهۆی دواکەوتویی مسوڵمانان هاتونەتەپێش، هێشتا ئیسلام گەورەترین هێزی بوژێنەرەوەی هیمەتەکانە..).

لە بەرهەمەکانی: (أصول الفقه الإسلامي)، (منهاج الإسلام في الحکم)، (الإسلام علی مفترق الطرق)رجال ونساء أسلموا، لا ٢٣٣.

*ڕۆجێ گارودی، بیرمەندێکی بەناوبانگی فەرەنسییەو یەکێکە لە گەورەترین پێشڕەوانی پێشوی حیزبی شیوعی فەرەنسی، بیرمەندێکی ئەو بە گشتگیری و وردی و



ئارەزوی گەڕان بەدوای حەقدا ناسراوە جا بەهەر نرخێك بێت، لەسەرەتای چلەکاندا هەلی ئەوەی بۆڕەخسا کە لەگەڵ هزری ئیسلامی و ژیانی ئیسلامیدا تێکەڵ ببێت، ئەو تێکەڵییەش بە تێپەڕبونی کات پەرەی سەند و بووە هۆی لەق کردنی بیروباوەڕە ماددییەکانی و هێواش هێواش گۆڕینیان بۆ باوەڕ، کە لە دوایشدا بووە هۆی جیابونەوەی لە حیزبی شیوعی فەرەنسی، هەروەك چۆن لە دواییدا–لە کۆتایی حەفتاکان–بەرەو ئیسلام ڕێنمونی کرد، ئەوکاتە ناوی خۆی گۆڕی بۆ(رجاء گارودی).

ئەو پیاوە ژیانێکی پڕ بەرەکەتی هەبووەو زۆر بەرهەمی هەن، کە دیارترینیان(وعود الإسلام)ە، سەرەڕای چەندین وتار کە لە وڵاتە جیاجیاکاندا پێشکەشی کردون.

لە بەرهەمەکانی: (الإسلام دين المستقبل، ما يعد به الإسلام، الأساطير المؤسسة لدولة إسرائيل).

*مارتن لینگز، ئەدیب و فەیلەسوفێکی ئینگلیزییە، لە ساڵی ۱۹۰۹ز لە دایك و باوکێکی پرۆتستانتی لەدایك بووە و بە هەمو توانا هەوڵیانداوە لەسەر پەیڕەوی مەسیحییەت پەروەردەی بکەن، کاتێ تەمەنی گەیشتە ۲۰ ساڵ و دیدی فراوان بو و هزری بەتەواوی پێگەیشت، بڕیاریدا واز لە ئایینەکەی بێنێت، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە باوەڕی بەوە نەبو کە مەسیحییەت ئایینی ڕاستی بێت، پاشان بڕوانامەی لیسانسی ئەدەبیاتی لە زمانی ئینگلیزی بەدەستهێنا، دواتر گەڕایەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئایینەکان، تا لەکۆتاییدا ئیسلامی هاتەڕێ و وای بینی کە ئایین و ڕێبازێکە لەگەڵ ئەقڵ و لۆژیکدا یەکدەگرێتەوەو ئاداب و ئاکارەکانی لەگەڵ دەروندا دەگونجێن، ئا لەوکاتەدا لەناو ئەو ئایینەدا خۆی دۆزییەوە، کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا دەگونجێت.



مارتن لینگز ده‌ڵێت: (له ئیسلامدا خودی خۆمم دۆزییه‌وه که به‌درێژایی ژیانم ونم کردبو، ئه‌وکات بۆ یه‌که‌م جار هه‌ستم کرد که مرۆڤم، ئیسلام ئایینێکه مرۆڤ ده‌گێڕێته‌وه بۆ سروشتی خۆی، به‌جۆرێك که له‌گه‌ڵ فیتره‌تدا بگونجێت و ویستی خودا وابو که من مسوڵمان بم، کاتێ خوداش شتێکی ویست هیچ که‌س ناتوانێ ڕێی پێبگرێت، به‌رله هه‌موشتێك ئه‌وه هۆکاری مسوڵمان بونم بو).

هه‌روه‌ها ده‌ڵێت: (ئیسلام ئایینێکه له‌گه‌ڵ عه‌قڵ و سروشتی مرۆڤدا ده‌گونجێت و ویژدان ده‌هه‌ژێنێت)رجال و نساء أسلموا، لا٥٢.

*فنسان مۆنتای(المنصور بالله الشافعي)، توێژه‌ر و گه‌ڕیده‌یه‌کی فه‌ره‌نسییه، پسپۆڕه له لێکۆڵینه‌وه له کێشه‌کانی ئیسلام و ڕۆژئاواو ساڵانێکی زۆری له ڕۆژئاوادا به‌سه‌ربردووه، تا له کۆتاییدا له‌ساڵی ١٩٧٧ز دا مسوڵمان بو.

زۆر کتێبی نوسیون، که له (٣٠) دانه تێپه‌ڕیان کردووه..ده‌رباره‌ی هۆکاری مسوڵمان بونی ده‌ڵێت: (کاتێ بۆ یه‌که‌مین جار قورئانم خوێنده‌وه و سه‌رنجی تێڕوانینی قورئانم دا بۆ حه‌زره‌تی(مه‌سیح) و دواتر زانیم که ئه‌ویش مرۆڤێکه و وه‌حی بۆهاتووه‌و لێبورده‌یی ئیسلامم له به‌رانبه‌ر ئایینه‌کانی تر بۆ ده‌رکه‌وت، مسوڵمان بونی خۆمم ڕاگه‌یاند، له سایه‌یدا هه‌ستم به ئارامی کرد، چونکه ئیسلام جیاوازی له نێوان ڕۆح و جه‌سته‌دا ناکات..).

پاشان ده‌ڵێت: (هیچ ئایینێك نییه وه‌کو ئیسلام هانی ڕه‌وشتی به‌رز و ڕێزی مرۆڤایه‌تی بدات.. ئیسلامم هه‌ڵبژارد چونکه ئایینی سروشته..من ئیسلامم وه‌ك ئه‌و ئایینه هه‌ڵبژارد که به‌وه‌وه به‌ڕوی په‌روه‌ردگارم شادبم).

له ڕسته‌یه‌کدا که ئاستی بیرڕونی ئه‌و ده‌رده‌خات، ده‌ڵێت: (وێنه‌ی هزرێکی عه‌ره‌بی که دوره له کاریگه‌ری قورئان وه‌ك که‌سێکه که خوێنیان له‌لاشه به‌تاڵ کردبێت).



لە بەرهەمەکانی: (الإرهاب الصهيوني، مفاتيح الفكر العربي، الملف السري وإسرائيل).

*مارك هانسن(هەمزە یوسف هانسن)، لە ساڵی ١٩٦٠ لە واشنتۆن لەخێزانێکی ئارسدۆکسی لەدایك بووە، لەگەڵ چەند مسوڵمانێکی ئەمریکی ڕەش پێست یەکتر دەبینن و کاریگەری لەسەر دادەنێن، بۆیە بڕیاریدا بەدوای ئیسلامدا بگەڕێت، بۆیە لەساڵی ١٩٧٧ز لە (سانتاباربرا)لە کالیفۆڕنیا مسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند، بەیەکێك لە بەناوبانگترین توێژەر و بانگخوازانی ئیسلامی لە ئەمریکا و ڕۆژئاوا دادەنرێت، چالاکی زۆر بەرچاوی هەن و جەماوەرێکی زۆری لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیە، بەهۆی ئەوەی ئەو ئیسلام بە ڕۆژئاواوە دەبەستێتەوە)رجال ونساء أسلموا، لا ٣٠٦.

*تیمۆسی وینتەر(عبدالحكیم موراد)، لە ساڵی ١٩٦٠ز لەدایك بووە، بڕوانامەی ماستەری لە زمانی عەرەبی لە زانکۆی (کامبریدج)دا لەساڵی ١٩٨٣ز وەرگرتووە، لە هەمان زانکۆدا دەستی کرد بە وانەگوتنەوە، مسوڵمان بو، پاشان بەرەو(ئەزهەری پیرۆز)لە میسر کەوتەڕێ و تاساڵی ١٩٨٩ز لە بابەتە ئیسلامییەکاندا کاری کردووە، پاشان لە زانکۆی ئۆکسفۆرد دکتۆرای وەرگرتووە و، دواتر بووە توێژەری بابەتە ئیسلامییەکان و زۆر کتێب و دانراوی هەن، هەروەها پۆستی جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی هاوڕێیانی بۆسنەو هێرسکی بەریتانی وەرگرتووە.

*ڕێنێ جینۆ(عبدالواحد یحیی)، زانا و فەیلەسوفی فەرەنسی، بەشێوەیەکی گشتی لە ئاینەکانی کۆڵیوەتەوە، پاشان مسوڵمان بوە، مسوڵمان بونی هەرایەکی زۆری لە ئەمریکا و ئەوروپا نایەوەو بووەهۆی مسوڵمان بونی زۆرکەس، زۆر دانراوی هەن و بۆ سەر چەند زمانێکی زیندو وەریگێڕاون، بەهۆی بەهێزی هزر و کاریگەریيان کڵێسا





خوێندنەوەی کتێبەکانی حەرام کرد، بەڵام سەرەڕای ئەوەش کتێبەکانی بۆ زۆر شوێنی جیهاندا بڵاوبونەتەوە..

(ڕینێ)دەڵێت: (ویستم دەست بە دەقێکەوە بگرم، کە بەهیچ جۆرێك باتڵ و ناڕاستی تێکەڵ نەبوبێت، دوای توێژینەوەیەکی دوورودرێژ و قوڵ، جگە لە قورئان هیچی وام دەستنەکەوت)الإسلام في قفص الإتهام، د.شوقي أبو خليل، لا١٦٧.

هەروەها دەڵێت: (ئەوروپا لە ڕێگای خودا دورکەوتوتەوە، بەمەش لە بەدڕەوشتی و بێباوەڕیدا نقوم بووە، ئەگەر زانایانی مسوڵمان نەبان، ئەوا ڕۆژئاواییەکان هەر لە تاریکیدا دەمانەوە).

لە بەرهەمەکانی: (أزمة العالم الحديث، الشرق والغرب، الثقافة الإسلامية و أثرها في الغرب).

*ڕۆجێ دۆبا سکوێر، بیرمەند و ڕۆژنامەنوسێکی فەرەنسییە، لە ژینگەیەکی مەسیحی پرۆتستانتی پێگەیشتووە، سەرەڕای ئەوەی کاریگەری فەلسەفەی هاوچەرخی لەسەر بووە، بەتایبەتی فەلسەفەی بونگەرایی، بۆیە بڕوای وابو کە ئایینەکان بیروباوەڕی ئەفسانەیین، لەکاتی کارکردنیدا لەبواری ڕۆژنامەگەریدا بەرەو سوید گەشتی کرد، بینی سەرەڕای پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی مرۆڤەکان زۆر بێزارن، بەڵام کاتێ بەرەو وڵاتە ئیسلامییەکان و ڕۆژهەڵاتییەکان گەشتی کرد پێچەوانەی ئەوەی بینی، مسوڵمانانی بینی-سەرەڕای هەژارییان-زۆر دڵخۆش بون و بینی کە ژیانیان مانای خۆی هەیە، ئەمە وایکرد بەڕاستی بەدوای واتای ژیاندا بگەڕێت و لەڕێی ئەو دو نمونەیەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی مسوڵمان ببێت و لەڕێی بڵاوکردنەوەی چەند وتارێك لە ڕۆژنامەی(جازێت دێ لوزان)، کە ڕۆژنامەیەکی نا ئیسلامییە مسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند.



ڕۆجێر له كتێبه‌كه‌یدا(إظهار الإسلام)دا ده‌ڵێت: (شایه‌تمانی (لا إله إلاّ الله)له‌سه‌رت پێویست ده‌كات، كه به ته‌واوی ته‌سلیمی ویستی خودا بی، پاشان هه‌نگاوی دووه‌م دێت، كه (محمد رسول الله)یه، ئه‌مه‌یش ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نێت، كه بۆ به‌دیهێنانی ته‌سلیم بونی ته‌واو، هیچ ئامراز و شێواز و ڕێگایه‌ك له شوێنكه‌وتنی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی چاكتر نییه)، لا٥٦.

پاشان ده‌ڵێت: (..ئیسلام یارمه‌تی مرۆڤ ده‌دات به‌بێ ئه‌وه‌ی خۆی له‌ده‌ست بدات ژیانی بگوزه‌رێنێت، به‌وپێیه‌ی دڵنیایی ده‌رون و په‌یوه‌ندیه مرۆڤایه‌تییه‌كان له‌گه‌ڵ به‌دیهێنانی ئامانجی هه‌ره‌گه‌وره كه خودا له‌پێناویدا وه‌دیهێناوین، كۆمانده‌كاته‌وه)لا٥٦.

له به‌رهه‌مه‌كانی: (تحدّي العصر، إظهار الإسلام).

# سیاسەتمەداران

﴿ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ البقرة: ٦٤ واتە:جائەگەر زیادە میهرەبانیی خودا نەبوایە لەگەڵتان ئەکەوتنە زیانەوە، خودا بەمیهرەبانیی خۆی لێ گەڕا تاتۆبەتان کردو عەفوی کردن.

*ماڵکۆڵم ئێکس، پێشەوای ڕەگەزپەرستە یاخیبوەکان بو بۆ دژایەتی کردنی سپی پێستان، بەڵام دوای مسوڵمان بونی وازی لەم شتەهێنا.

بەمەبەستی حەج کردن گەشت دەکات و، برایەتی مسوڵمانان لەخۆی دەگرێت، نامەیەك بۆشوینکەوتوانی دەنێرێت، تێیدا دەنوسێت: (تائێستا ڕێزو خانەدانی ڕاستەقینەم نەدیبو، وەك لێرەدا لەنێوئەوخەڵکەدا دەبینم کە هەریەکەی لەڕەنگ و ڕەگەزو نەتەوەیەکە، لەم خاکەپیرۆزەدا، خاکی ئیبراهیم و محمد.)

گۆڤاری(الفیصل)ژمارە . ٢٧.

هەروەها دەڵێت:(ئەمەریکا پێویستی بەتێگەیشتن لەئیسلام هەیە، چونکە تاکە ڕێبازو ئاینە، کەبتوانێت کێشەی ڕەگەزپەرستی لەکۆمەڵگاکەیدا بسڕێتەوە.من لەگەڵ سپی پێستە مسوڵمانە ئەمریکییەکاندا گفتوگۆم کردوەو، خواردنم لەگەڵدا خواردون، ئایینی ئیسلام بەتەواوی بیری ڕەگەز پەرستی لەمێشکدا سڕیونەتەوە.)

هەمان سەرچاوە.

بەکورتی وەسفی کۆمەڵگای ئیسلامی دەکات و دەڵێت:( لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا هیچ مرۆڤێك هەست بەجیاوازی ناکات، لەئیسلامدا نەهەستی خۆبەگەورە

زانين هەيه، نەهەست كردن بەكەموكورِی)موسوعة(مقدمات العلوم والمناهج)، أنور الجندی:٨/ ١٤٠

(د.موراد ويلفريد هۆفمان)، دكتۆرای لەياسا هەيەو، ديبلۆماسێكی ئەڵمانییە، لەساڵی ١٩٣١، لەدايك بووە، زۆر كتێبی هەن كە لەچوارچێوەی شارستانیەتی رۆژئاوادا باسی لەئايندەی ئيسلام كردوە، لە خێزانێكی كاسۆليكی دا لەدايك بوە، لەساڵی ١٩٨٠بۆته مسوڵمان، لەبواری بەرگری ئەتۆمی وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانيادا كاری كردوە، مسوڵمانبوونی مشتومرِێكی زۆری دروست كرد، بەهۆی ئەو پێگە بەرزەی لەحكومەتی ئەڵمانيادا هەيبوو، هەروەها بەرِێوەبەری بەشی زانياری ناتۆ بو لە(برۆكسل)، لەساڵی١٩٨٣ز تا ١٩٨٧، پاشان بوە بەباڵيۆزی ئەڵمانيا لە(مەغريب) لەساڵانی ١٩٩٠تا١٩٩٤.

* * *

(هۆفمان)دەڵێت، بابەتە دژيەكەكان لەبيروباوەرِی مەسيحيدا لەگرنگترين هۆكارەكانی مسوڵمان بونم بو .

لەبەرهەمەكانی :(الإسلام كبديل)، (الإسلام فی الألفية الثالثة)، (يوميات مسلم ألماني). (رجال ونساء أسلموا) ل٣٩٣.

*كيپ ئيليسۆن، پارێزەرێكی ئەمريكيیە، لەساڵی ١٩٦٣ی ز. لەدايك بوە، لەتەمەنی ١٩ساڵيدا مسوڵمان بووە، يەكەمين جێگری ديموكراتی مسوڵمانە لەكۆنگرێسی ئەمريكا لەويلايەتی (مينيسۆتا)، لەهەڵبژاردنی نۆڤێمبەری٢٠٠٦ز دا بووە ئەندام، لەكاتی سوێندخواردندا توشی كێشەيەكی گەورە بووەوە، چونكە دەبو دەست لەسەر(ئينجيل) دابنێت، ئينجا سوێند بخوات، بەڵام ئەو دەستی لەسەر قورئان دانا، ئينجا سوێندی خوارد، يەكەم جاربو لەپارتی ديموكراتيدا، كەسێكی مسوڵمان بۆ



کۆنگرێس کاندید بکرێت به ئاسانی توانی ئه‌ندامێتی له ئه‌نجومه‌نی نوێنه‌رانی ئه‌مریکی و ویلایه‌تی (مینیسوتا) به‌ده‌ست بێنێت.

کۆفهی لال جابا (خالید له‌تیف جابا)، پیاوێکی سیاسه‌تمه‌دارو نوسه‌رو رۆژنامه‌نوسه، له شاری (لاهور) له‌خێزانێکی ده‌وڵه‌مه‌ندو زانست دۆستی هیندۆسی له‌دایك بوه، له‌نێو هیندۆسه‌کاندا، دوای ئه‌وه‌ی مسوڵمانبونی خۆی ڕاگه‌یاند، بڕیاری دا له‌شاری (مۆمبی ) دا ژیان به‌سه‌ر بیات. له‌به‌رهه‌مه‌کانی: (الأصوات العامرة)، (رسول الصحراء). "رجال ونساء أسلموا"، لا٩٥.

*د.ڕۆبێرت گرین (فاروق عه‌بدوالحه‌ق)، دکتۆرای له‌یاسای نێوده‌وڵه‌تی و به‌راوردکاریدا هه‌یه، و سه‌رۆکی کۆمه‌ڵه‌ی هارڤارده بۆ یاسای نێوده‌وڵه‌تی و، ڕاوێژکاری سه‌رۆکی کاروباری ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریکی(نیکسۆن)ه و، به‌رێوه‌به‌ری پێشوی ئاسایشی نه‌ته‌وه‌یی بوله‌کۆشکی سپی و، دامه‌زرێنه‌ری کۆمه‌ڵه‌ی پارێزه‌ره مسوڵمانه ئه‌مریکییه‌کانه، له‌ساڵی ١٩٨٠ز مسوڵمان بوه .

ده‌ڵێت :(ئه‌گه‌ر خه‌ڵك ڕۆژنامه‌کانی ئه‌مریکا بخوێنه‌وه، ئه‌وا ترسیان له‌هه‌مبه‌ر ئیسلام له‌لا دروست ده‌بێت).أمریكا و الاسلام تعايش أم تصادم؟ د.عبدالقادر طاش، لا٦٦.

* * *

## وەرزشوانان

﴿ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ الجمعة: ٤

واته: ئەمیش فەزڵی خوایەبەهەرکەسێکی ئەدا کەمەیلی لێ بێ و، خوا خاوەنی فەزڵی گەورەو مەزنە.

* * *

*کاسیۆس مارسیلۆس کلای (محمد عەلی کلای)، یاریزانێکی مشتەکۆڵە(ملاکمة)ی ئەمریکییە، لە(١٧)ی ژانیوەری ١٩٤٢ز لەخێزانێکی ئەمریکیدا لەشاری (لۆلیڤیل) لە ویلایەتی (کەنتاکی) لەدایکبووە، لەماوەی بیست ساڵدا، کەلەنێویاریگاکانی مشتەکۆڵەدا بەسەری برد(سێ)جار بووە پاڵەوانی جیهانی کێشی قورس، لەساڵی ١٩٩٩ز(محمد عەلی کلای )بە(وەرزشوانی سەدە) هەڵبژێردرا، کاتێ لەساڵی ١٩٦٥ز. بووە مسوڵمان هەمو جیهانی سەرسام کرد.

*فێردیناند لویس ئارکەندۆر(کریم عبدالجبار)، لە١٦ی ئیپریڵی ساڵی ١٩٤٧ز. لەشاری نیویۆرك لەدایك بووە، یاریزانێکی بەناوبانگی تۆپی باسکەبوو بەیەکێك لەبەناوبانگترین پاڵەوانانی ئەو یاریە دادەنرێت بەدرێژایی مێژو.. کاتێ لەزانکۆ دەیخوێند لەخولی زانکۆکان لەساڵانی ١٩٦٧و١٩٦٩ز دا بەباشترین یاریزان هەڵبژێردرا، پاشان چووە تیپی (لۆس ئەنجلۆس لیکەرز)و باشترین ئەنجامی لەگەڵدا تۆمارکرد، توانی لەگەڵ تیپەکەیدا پێنج جار نازناوی(ئێن بی ئەی) بەدەست بێنێت، لەساڵی ١٩٨٩لەتەمەنی ٤٢ساڵی وازی لەیاری کردن هێناوە، لەسەر دەستی یەکێ



لەبانگخوازە ئیسلامیەکان لەواشتنۆن مسوڵمانبووەو، هەر ئەو ناوی (کریم عبداجبار)ی بۆ هەڵبژارد، دەستی کرد بە هەوڵدان بۆ فێربونی زمانی عەرەبی و چەند وڵاتێکی عەرەبی وەکو لیبیاو سعودیە گەڕاوە بۆ ئەوەی زمانی عەرەبی بەباشی فێربێت و ئیسلام لەشوێنی خۆیدا ببینێت.

*فریدریك کانۆتی، لەساڵی ١٩٧٧ز لە فەرەنسا لەدایك بووە، یاریزانێکی تۆپی پێی مالی بەرەگەز فەرەنسیە، لەتەمەنی ٢٠ساڵیدا مسوڵمان بوە، یەکێك لەکارە خێرخوازییەکانی کردنەوەی گوندێکی منداڵان بو لەساڵی ٢٠٠٦دا لە مالی.

*فرانك ریبێری، لەساڵی ١٩٨٣ز لەفەرەنسا لەدایك بووە، یاریزانی هەڵبژاردەی تۆپی پێی وڵاتەکەیەتی، کاتێ بوو بەمسوڵمان سەرنجی ڕاگەیاندنی بۆخۆی ڕاکێشا.. ریبێری دەڵێت:( ژیانێکی زۆر قورس و ناخۆشم هەبوو، بڕیارمدا بەدوای ئارامیدا بگەڕێم، لەکۆتاییدا ئیسلامم دۆزییەوە).

هەروەها دەڵێت:(ئیسلام سەرچاوەی هێزی منە، لەناوەو دەرەوەی یاریگادا).

*ئیریك ئەبیداڵ یاریزانێکی فەرەنسییە مسوڵمان بوە و لەگەڵ کچێکی جەزائیریدا هاوسەرگیری کردووە، لەلێدوانێکدا بۆ ڕۆژنامەی (ستاد الدوحە)ی وەرزشیدا لەژمارەی دەرچوی (٢٠٠٧/٨/٣٠ز)دا، دەڵێت:(بەهیچ شێوەیەك مسوڵمان بونم مەرجێك نەبو لەمەرجەکانی هاوسەرگیرییەکەم لەگەڵ ئافرەتێکی مسوڵماندا، بەڵکو ئەوە چیرۆکێکی کۆنی سەردەمی لاویمە، من هەمو کات ئارەزوم ئەوە بو مسوڵمان بم، لەکۆتاییشدا بەئەنجامم گەیاند).

*برۆنۆ میتسۆ(کەریم میتسۆ)، بەرەگەز فەرەنسییە، ڕاهێنەری تۆپی پێیە، شوێن پەنجەی بەسەر ئەو تیپانەوە دیارە، کەڕاهێنەریان بووە، مسوڵمان بونیشی دەگەڕێتەوە بۆ بڕیارێکی تایبەتی خۆی، مرۆڤیش سەربەستە لەوەی چی پێی باشە ئەوە هەڵبژێرێ، هەروەك چۆن ڕاهێنەرێکی تری فەرەنسی بەناوی (فیلیپ ترۆسیێ)، کە دواتر ناوەکەی



گۆڕی بۆ(عومەر ترۆسیێ)هەمان ڕای هەبووە، کەدوای ئەوەی مسوڵمان بوو هاوسەرەکەشی(دۆمینیك) لەگەڵیدا مسوڵمان بوو).

*فیلیب ترۆسیێ(عومەر ترۆسیێ)، ڕاهێنەرێکی فەڕەنسییە، لەگەڵ هاوسەرەکەی (دۆمینیك)دا لەبەهاری ٢٠٠٦ز مسوڵمان بوون و دو ناوی نوێیان بۆخۆیان هەڵبژارد، (عومەر) و (ئەمینە).

*نیکۆلاس ئەنێلکا (بیلال ئەنێلکا)، لە١٤ی مارسی ١٩٧٩ز دا لە(ڤێرسای)لەدایك بووە، یاریزانێکی تۆپی پێی فەڕەنسییە..لەتەمەنی(١٦)ساڵیدا مسوڵمان بووە، دەڵێت:(پێش حەوت ساڵ لەڕێگەی هاوڕێیەکی تونسیم مسوڵمان بوم، کەناوی (ئیسماعیل) بوو پێکەوە لەپاریس سان جێرمان یاریمان دەکرد، هەمیشە دەربارەی ئایینی ئیسلام و بنچینەو دروشمەکانی گفتوگۆی لەگەڵ دەکردم، سوپاسگوزاری خودام، کەئێستا تاکێکم لەکۆمەڵەی مسوڵمانان).

هەروەها دەڵێت:(نازناوی بیلالم هەڵبژارد، چونکە یەکەمین شت لە ئیسلامدا کەسەرنجی منی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا (بانگ)بو).

***

# هەندێ کەسایەتی دی..

﴿ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾ آل عمران: ٧٤.

واتە: خودا مەیلی لە بەرزکردنەوەی هەر کەس بێ بەتایبەتی لەناو خەڵکدا هەڵیئەبژێرێ و ڕووی میهرەبانی و ڕەحمەتی خۆیی تێ ئەکات، خودا خاوەنی بەخشش و بەهرەی گەورەیە و، هەر ئەو ئەتوانێ بەڕاستی چاکە لەگەڵ خەڵك بکات.

* * *

لۆرد هێدلی، یەکێکە لە دەوڵەمەندترین و خانەدانترین کەسی بەریتانیا، لە زانکۆی کامبریدج بەشی ئەندازیاری خوێندووە، مسوڵمان بوە و گۆڤاری The Islamic Renewی دەرکرد و مسوڵمان بونی دەنگۆی زۆری بەدوای خۆیداهێنا.

هێدلی دەربارەی کاتی مسوڵمان بونی دەڵێت: (گومان لەوەدا نییە، کە خۆشترین ڕۆژەکانی ژیانم ئەو کاتە بو کە لەبەردەم خەڵکدا ڕامگەیاند کە من بومەتە مسوڵمان و ئاینی ئیسلام پەیڕەو دەکەم) آفات جديدة للدعوة الاسلامية، أنور الجندي، ل١٣٩.

هەروەها دەڵێت: (ئەگەر بە مەسیحی لەدایك بووم، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بە درێژایی ژیانم بە مەسیحی بمێنمەوە، من نەمدەزانی چۆن باوەڕ بەو بنچینەیە بکەم کە



دەڵێت ئەگەر جەستەی مەسیح نەخوێت و خوێنی نەخوێیەوە ئەوا لە سزای دۆزەخی هەمیشەیی ڕزگارت نابێت! من ئێستا لە نێو ئیسلامدا زۆر زیاتر لە جاران خۆم لە مەسیحییەتی ڕاست بە نزیکتر دەزانم، هەرکەسێکیش دژایەتی مەسیحییەتی ڕاست بکات ئەوا جێگای ئومێد نییە)مسوعة النهضة الاسلامية، دكتور محمد رجب البيومي، ١/ ١٢٠.

*ئیتین دینێت، یەکێکە لە گەورە هونەرمەند و وێنەکێشە بەناوبانگەکانی جیهان، کارەکانی لە فەرهەنگی(لارۆس) تۆمارکراون، نیوەی هەموساڵێکی لە جەزائیر دەبردەسەر، لەساڵی ١٩٢٧ز مسوڵمان بوە و ناوی خۆی گۆڕی بۆ(ناسرەددین) و لە ساڵی ١٩٢٨ز حەجی ماڵی خوای کرد.

لە کتێبەکەی کە بەناوی(محمد رسول الله)یە دەڵێت: (ئیسلام هەر لە ساتی یەکەمی دەرکەوتنیدا ئەوەی سەلماند کە ئایینێکی گونجاوە بۆ هەمو کات و شوێنێك، چونکە ئایینی سروشت و فیترەتی مرۆڤە، سروشتی مرۆڤەکانیش جیاوازیان نییە، بۆیە بۆ هەمو ئاستێکی شارستانییەت شیاوە)لا ٣٤٥.

بەرهەمەکانی: (أشعة خاصة بنور الإسلام، الشرق كما يراه الغرب، الحج الى بيت الله الحرام).

* ئیڤلین گۆبوڵد، خانمێکی خانەدانی ئینگلیزە، مسوڵمان بوەو سەردانی حیجازی کردووە و حەجی ماڵی خواشی کردووە، دەربارەی ئەو گەشتەی کە لەساڵی ١٩٣٤ز ئەنجامیدا یادەوەریەکانی بەناوی (الحج الى مكة) نوسیوەو بەناوی (البحث عن الله)وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

گۆبوڵد لە کتێبی (محاسن الإسلام)دا دەڵێت: (مسوڵمانان دوبارە دەگەڕێنەوە لوتکە، لە ڕێگەی سەرچاوە پاك و بێگەردەکەیانەوە:قورئان).



له به‌رهه‌مه‌كانی: (تقدم الاسلام السریع).

*ماریا ئالاسترا، له سالّی ١٩٤٩ز له ئه‌نده‌لوس له‌دایك بووه، ڕێپێدراوه له بواری فه‌لسه‌فه‌و ده‌روونناسی له زانكۆی مه‌درید، سالّی ١٩٧٨ز مسولّمان بوه ، به‌ڕێوه‌به‌ری ناوه‌ندی(التوثیق والنشر) بو له ئه‌نجومه‌نی ئیسلامیدا، سالّی ١٩٩٨ز له غه‌رناته له‌سه‌ر ده‌ستی تاوانبارێكی ئیسپانی شه‌هید كرا، دوای ئه‌وه‌ی وتارێكی بلّاوكردەوه به‌ناوی(ئافره‌تێكی مسولّمان له گوندێكی جیهانیدا)...له‌و وتاره‌یدا ده‌لّێت:

(من باوه‌ڕم به خوای تاقانه هه‌یه، باوه‌ڕیشم به‌وه هه‌یه كه محمد پێغه‌مبه‌ری خوایه و باوه‌ڕیشم به‌ڕێبازه‌كه‌ی هه‌یه كه ڕێبازی ئاشتی و چاكه‌خوازییه.. له ئیسلامدا مرۆڤ به‌پاك و بێگه‌ردی و به‌ئازادی و به‌بێ تاوان له‌دایك ده‌بێت، تا خوی پێگه‌و پله‌وپایه‌ی خوی له‌جیهاندا ده‌ستنیشان بكات)وه‌رگێڕدراوی صلاح یحیاوی، گوڤاری(الفیصل)ژماره١٩٢.

*جه‌میله قه‌رار، له‌سالّی ١٩٤٩ز له نه‌مسا له دایك و باوكێكی بێباوه‌ڕ له‌دایك بووه، سه‌ره‌تا ویستی ببێته مه‌سیحی به‌لّام قه‌ناعه‌تی به مه‌سیحییه‌ت نه‌هات، دواتر به‌ره‌و ئیسلام هات و دوای ئه‌وه‌ی ده‌رباره‌ی ئه‌و ئایینه زۆری بیست و زۆری خوێنده‌وه له ته‌مه‌نی بیست سالّیدا مسولّمان بوه.

*فاتیمه سی لامیر، ئافره‌تێكی ئه‌لّمانییه، قه‌ناعه‌تی به مه‌سیحییه‌ت نه‌هات، بۆیه له سه‌ره‌تاكانی سالّی ١٩٥١ز له‌ڕێی نامه‌و پۆسته‌وه پێوه‌ندی به هه‌ندێ مسولّمانه‌وه كرد، ئه‌وانیش بنچینه‌كانی ئیسلامیان بۆ ڕونكرده‌وه‌و ئه‌ویش باوه‌ڕی له‌لا دروست بو و مسولّمان بو.

*موتیكا ترڤسكن(فاتیمه ترڤسكن)، له سالّی ١٩٤٣ز له چیكوسلوڤاكیا له‌دایك بووه، پسپۆڕی وێنه‌ی ئه‌ندازه‌یی بو، زۆری ده‌رباره‌ی ئیسلام خوێنده‌وه و پێوه‌ندی به



هەندێ مسوڵمانی ئەڵمانیاوەكرد، تا ئەوكاتەی باوەڕی تەواوی لەلا دروست بو و لەساڵی ١٩٦٣ز مسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند.

*بریشا بەنكمەرت(عوسمان عەبدوڵلاّ) یەكێكە لە پسپۆڕانی پەروەردەو فێركردن لە تایلاند، لە خێزانێكی بوزی لە دایك بووە كە تاكەكانی ئەو خێزانە بەتەواوی پەیوەست بون بە ئامۆژگاری و فەلسەفەی(بوزا) بەلاّم ئەو باوەڕی بەوە نەبو، دوای تەواوكردنی خوێندنەكەی دەستی كرد بە گەڕان بەدوای ئایینێك كە شایەنی ئەوەبێت ببێتە ئایینی مرۆڤایەتی و پەیڕەوی ژیان، جاكاتێك ئەوەی لە ئیسلامدا بەدیكرد مسوڵمان بو و لە سەرەتای ساڵی ١٩٧١ز مسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند.

*كات ستیڤنس، گۆرانیبێژێكی بەریتانی بە ڕەچەڵەك نەمساوییە، لە كۆتایی شەستەكان و سەرەتای حەفتاكان زیاتر لە ملیۆنێك كاسێت لە بەرهەمەكانی فرۆشرا، دوای ئەوەی بە قورئانی پیرۆز ئاشنابو لەساڵی ١٩٧٦ز مسوڵمان بو، ئێستا زۆربەی كاتەكانی لە مزگەوتدا بەسەردەبات و ڕۆڵێكی كارا و گرنگ لەگەڵ ڕەوەندی ئیسلامی لە لەندەندا دەگێڕێت.

(ستیڤنس) دەڵێت: (كاتێك لە قوتابخانەبوم دركم بەوەدەكرد كە جیاوازییەكی زۆر هەیە لەنێوان وانەی ئایین و وانەكانی تری وەكو بیركاریدا، لە وانەی ئاییندا وا فێركراین، كە ٣=١[1] بەلاّم ئەوە لە وانەی بیركاریدا ڕاست نییە، بەلاّم لە كۆتاییدا لە ئیسلامدا ئەوەم دۆزییەوە كە ١=١)لم أسلم هؤلاء الأجانب، محمد عثمان١/ ١٩.

*دیبۆرا پوتەر، ئافرەتێكی ڕۆژنامەنوسە لە ساڵی ١٩٥٤ز لە شاری(ترافیرز) لە ویلایەتی مشیگانی ئەمریكا لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩٨٠ز دوای هاوسەرگیری لەگەڵ یەكێك لە بانگخوازە ئیسلامییەكاندا كە لە ئەمریكا كاری بانگخوازی دەكرد

(١) مەبەست لە ٣=١ بیروباوەڕی مەسیحییەكانە، كە باوەڕیان بە سێ خوایی هەیە.(وەرگێڕ.



مسوڵمان بوە، دوای ئەوەی باوەڕێکی تەواوی لەلا دروست بو کە هیچ ئایینێك نیە وەکو ئیسلام بەتەنگ داخوازییەکانی مرۆڤەوە بێت، جا نێربێت یان مێ.

*کریستیان بێل(عیسی أبو الهدی)، دەرهێنەرێکی سینەمایی بەرەچەڵەك فەرەنسییە، لە بواری دەرهێنان و بەرهەمهێنانی سینەماییدا کاری کردووە، زیاتر لە حەفتا فیلمی سینەمایی هەیە، لەوانە دو فیلمی بۆ(ئەنتونی کرێن) دەرهێناون.

بێل کەسێکی دەوڵەمەند بو، لە لوس ئانجلوس و نیویۆرك و پاریسدا بە خۆشگوزەرانی دەژیا، بەڵام سەرەڕای ئەوەش مسوڵمان بوە و وەك خۆی دەڵێت هەرگیز ئاسودەیی جەستەیی و ڕۆحی نەدۆزییەوە تا ئەوکاتەی مسوڵمان بو.

لە دیمەشق لە کۆڕێکدا کە لەژێر ناوونیشانی(ئاشنابونی ژیار و پەیامەکان) ڕێکخرابو بە دیداری شادبوم، پیاوێکی زۆر خۆبەکەمزان بو، بە ئاسانی هەست بە نوری ئیسلام دەکەی کە لە ڕویدا دەدرەوشێتەوە، دواتر دەربارەی مسوڵمان بونی قسەمان کرد و داوام لێکرد کە ڕێگا بدات لە کتێبەکەمدا لەو بەشەدا ئاماژە بە چیرۆکەکەی بکەم.

*کۆلین کیس، خانمێکی ئەمریکییە لە خێزانێکی کاسۆلیکیدا گەورەبووە، ماستەری لە بواری(فێربونی زمانی دووەم) دا هەیە لە زانکۆی(فێرفیڵد) و ماستەری لە توێژینەوە ئیسلامییەکاندا هەیە، پسپۆڕە لە توێژینەوەی ئیسلامی و مەسیحی، لە ساڵی ٢٠٠١ەوە تا ئێستایش ڕاگری کۆلێژی (تەنکسیس)ە بۆ کاروباری ئەکادیمی، بەهۆی دو قوتابی سوری کە زمانی ئینگلیزییان لەلا دەخوێند مسوڵمان بو، کاتێك پێناسەیەکی سادەی ئیسلامیان بۆکرد و نوسخەیەکی قورئانی پیرۆزیان بەدیاری پێدا.

لە(پاشکۆی کلتوری) باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە دیمەشق ئامادەی کۆڕێکی بوم، تێیدا باسی لە هەڵوێستی هەندێ لە نەیارانی حیجاب و تێڕوانینی دوژمنانی بۆ خۆی و بیروباوەڕەکەی دەکرد، بەڵام ئەو-سەرەڕای ئەوەش-ڕۆڵێکی کاریگەری هەیە



لەسەر ڕونکردنەوەو خستەڕوی وێنەی ئیسلام و ڕەواندنەوەی هەرچی درۆ و دەلەسە و توند و تیژیە کە دەدرێنەپاڵ ئیسلام.

*جۆن ئاورد(محمد ئیسلام) چالاکوانێکی نایاسایی بو لە حیزبی گەلی بەریتانی، لەساڵی ١٩٩٢ز نوسخەیەکی قورئانی پیرۆزی کڕی تا چەند هەڵەیەکی دەستبکەوێت و مسوڵمانانی پێبناسێنێت..جۆن دەڵێت: (وامزانی قورئانی پیرۆزیش وەك هەمو کتێبەکانی دی بەدەستی مرۆڤ نوسراوە و هەردەبێ هەڵەو دژیەك و شتی پێچەوانەی تێدابێت).

بەڵام پارێزگاری خوای پەروەردگار بۆ قورئانی پیرۆز و ئەو ئیعجازەی تێیدایە بووە هۆی ئەوەی باوەڕی تەواوی لەلا دروست بێت کە قورئانی پیرۆز فەرمودەی خوایەو بەهیچ جۆرێك شتی نادروستی تێنەکەوتووە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٦ز ببێتە مسوڵمان، دەڵێت: (لە کوتاییدا بۆم دەرکەوت و دڵنیابوم لەوەی کە من دەمەوێ مسوڵمان بم جا کاتێ ئەو بڕیارەمدا و یەکلابومەوە بۆم دەرکەوت کە ئیتر هەمو شتێکم بۆ ڕون بووەتەوەو لە باشترین باروودۆخدام).

*یوسف خەتتاب(یوسف کۆهین)، ئەندامی بزوتنەوەی (شاس)ی بەریتانی بو، لەساڵی ١٩٩٨ز خۆی و خانەوادەکەی هاتنە قودس و لەوێ چونە کەمپی غادیر لە کۆمەڵگەی (گۆش قەتیف) نیشتەجێبون، دوای ماوەیەك دەستی کرد بە نامەناردن لەڕێی ئینتەرنێتەوە لەگەڵ پیاوانی ئاینی مسوڵمان و دەستیکرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز بە زمانی ئینگلیزی، پاشان کۆهین بڕیاریدا هەمو سنورەکان ببەزێنێت و خۆی و هاوسەرەکەی و منداڵەکانی مسوڵمان بونی خۆیان ڕاگەیاند، ئێستا منداڵەکانی لە قوتابخانەی ئیسلامی دەخوێنن و عەرەبییەکی زۆرباش قسە دەکەن، پاشان کۆهین ناوی خۆی گۆڕی بۆ(یوسف خەتتاب)و لە گەڕەکی جەبەل تورِ لە قودسی ڕۆژهەڵاتدا



نیشتەجێ بو و دەستی کرد بە کارکردن لە کۆمەڵەیەکی خێرخوازی ئیسلامیدا، سەرەڕای ئەوەی سەرانی ئیسرائیل دوای مسوڵمان بونی پاڵەپەستۆیەکی زۆریان خستەسەر) رجال ونساء أسلموا، لا٣٧٣.

*خۆسێ خافێر گیگۆ(ئەبوبەکر گیگۆ)، لە شاری (سەرەقەستە)ی ئیسپانی لەساڵی ١٩٥٥ز لەدایك بووە، دوای گەشتێکی دورودرێژی سەخت بەرەو ئیسلام هیدایەت دراو، لەساڵی ١٩٩٥ز خۆی و هاوسەرە پۆلۆنییەکەی(بیبیانا رۆشکۆ) و منداڵەکانی مسوڵمان بون و پاشان چونە ئەستەنبوڵ و لەوێ نیشتەجێبون، لەوێ گۆڤارێکی هزری ئیسلامی ئیسپانی تایبەت بە ڕەخنەگرتن لە مێژو بەناوی (سکانداتی)دەرکرد، سەرەڕای چەندین کاری تری لە بواری ئەدەب و فەلسەفەو ئیسلامدا، لە ساڵی ٢٠٠٠ز هاتە دیمەشق و لەوێ درێژەی بە کارەکانی دا و لەوکاتەوە لەوێ نیشتەجێیەو بەڕێوەبەری بەشی زمانی ئیسپانییە لە کۆمەڵگەی فەتحی ئیسلامی و ڕاوێژکاری ڕۆشنبیرییە لە پەیمانگای (سربانتس)، بەر لە ماوەیەك لەگەڵی ئاشنابوم و داوام لێکرد کە چیرۆکی مسوڵمان بونی خۆیم بۆ باس بکات، ئەویش ڕێنمونی کردم کە بگەڕێمەوە بۆ کتێبی(رحلة الى نور المعرفة)، کە تێیدا باسی مسوڵمان بونی خۆی و چەندین کەسی تری کردووە، ئەوانەی بەرەو نوری ئیسلام هیدایەت دراون.

*جۆناسان بێرت(یەحیا بێرت):کوڕی (جۆن بێرت)ی بەڕێوەبەری ڕادیۆی بەریتانیایە، مێژوی نوێ و زانستی سیاسی لە زانکۆی(مانچستەر)ی بەریتانیا خوێندووە، پاشان وزۆر بە قوڵی ئیسلامی دیراسە کردووە، دوای بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەیەکی ورد و دورودرێژ مسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند، دوای مسوڵمان بونیشی ناوی (یەحیا)ی بۆخۆی هەڵبژارد..جۆناسان دەڵێت:

(ئیسلام فەرمانمان پێدەکات کە بە دانایی و ئامۆژگاری بۆ ڕێبازی خودا بانگەواز



بکه‌ین و به چاکه گفتوگۆ بکه‌ین).

به‌و پێیه‌ش یه‌حیا ماندونه‌ناسانه گفتوگۆ له‌گه‌ڵ خه‌ڵکدا ده‌کات و دانایانه به‌ره‌و ڕێبازی خوا بانگه‌وازیان ده‌کات)رجال ونساء أسلموا، لا٣٥٧.

*ئیلینا شرۆمۆڤا، خانمێکی ڕوسییه له ژینگه‌یه‌کی مه‌سیحیدا گه‌وره‌بووه، به‌ڵام ئه‌و بیروباوه‌ڕه‌ی قه‌بوڵ نه‌بو، که ده‌ڵێت: خودا کوڕێکی هه‌یه. بۆیه سه‌رگه‌ردان مابو نه‌یده‌زانی چۆن جێگره‌وه‌یه‌ك بۆ ئایینی مه‌سیحی پێشوی بدۆزێته‌و، له‌به‌رئه‌وه به‌دوای زانیاری ده‌رباره‌ی ژیانی دوای مردندا ده‌گه‌ڕا، پاشان به‌دوای خودادا، تا له‌کۆتاییدا له‌گه‌ڵ (لۆرا)دا که خانمێکی ئیتاڵی بو و مسوڵمان بوبو ئاشنابو و، پۆشته‌یی و قسه ڕێکوپێکه‌کانی لۆرا ورده‌ورده له دڵی ئیلینادا جێگای خۆیان کرده‌وه‌و، تا له مانگی کانونی یه‌که‌می ساڵی ٢٠٠٥ز مسوڵمان بونی خۆی ڕاگه‌یاند.

ئیلینا ده‌ڵێت: (زۆر دڵخۆش بوم که هاوڕێ مسوڵمانه‌کانم زانیان که که‌وتومه‌ته داوی خۆشه‌ویستییه‌وه ..خۆشه‌ویستی خوا و ئیسلام) .

*ئیبراهیم کارلسۆن: وێنه‌گرێکی ڕوسی بێباوه‌ڕبو، دوای چه‌ند گفتوگۆیه‌ك له‌سه‌ر بونی خوا له‌گه‌ڵ ئافره‌تێکی ئه‌مریکی مسوڵمان که ناوی(شه‌هیده)بو مسوڵمان بو، به‌ڵام پاڵنه‌ری سه‌ره‌کی له‌پشت مسوڵمان بونی چیرۆکێك بو که له ئینته‌رنێتدا خوێندبویه‌وه به‌ناوی(دوای دوازده کاتژمێر) که (کاترین پۆڵۆك)ی خانمی مسوڵمان بوی که‌نه‌دی نوسیبوی.

*ماریا جۆ، خانمێکی پرتوگالی کاسۆلیکی بو، دڵسۆزی ئایینه‌که‌ی بو، به‌ڵام ئه‌و بیروباوه‌ڕه‌ی که ده‌ڵێت خودا کوڕه‌که‌ی خۆی له‌پێناو تاوانه‌کانی مرۆڤه‌کان کردوته قوربانی و مه‌سیح کوڕی خوایه‌و له‌هه‌مان کاتدا خواشه، ئه‌م پایه‌یه‌ی بیروباوه‌ڕ وای لێکرد که گومان له بیروباوه‌ڕه‌که‌ی بکات.

ماریا ده‌ڵێت: (چومه لای قه‌شه‌یه‌ك، ده‌رباره‌ی گومانه‌کانم پرسیارم لێکرد، من



دڵنیابوم که وه‌ڵامه‌که‌ی ده‌زانێت، به‌ڵام سه‌رسام بوم، کاتێك پێی گوتم: ئه‌مانه له نهێنیه‌کانی کاسوڵیکین.. هه‌روه‌ها پێی گوتم که ده‌بێ پاره بده‌م له‌به‌رانبه‌ر لێخۆشبون له گومانه‌کانم).

هه‌مو ئه‌مانه وایان لێکرد که ئیسلام هه‌ڵبژێرێت، که تیایدا یه‌کتاپه‌رستی و دڵسۆزی ته‌واوی بۆ خوا تێدا بینیه‌وه.

ماریا ده‌ڵێت: (لای من ئیسلام وه‌ك وێنه‌یه‌کی ئه‌ندازه‌یی(هندسی)وایه پڕه له ڕه‌نگ و هه‌ر به‌شێکی تری ته‌واوده‌کات.

*مارما دوك باکتاڵ:محمد باکتاڵ به‌ریتانییه، مسوڵمان بوه و به‌یارمه‌تی محمد غه‌مراوی واتاکانی قورئانی پیرۆزی کردوته ئینگلیزی، ئه‌و وه‌رگێڕانه‌ش له باشترین وه‌رگێڕانه‌کانه‌و یه‌که‌مین وه‌رگێڕانه که که‌سێکی مسوڵمانی ئینگلیز بیکات.

(باکتاڵ) ده‌ڵێت: (مسوڵمانان ده‌توانن ژیار و شارستانییه‌ته‌کەیان وه‌ك سه‌رده‌مانی پێشو به خێرایی بڵاوبکه‌نه‌وه، به‌ڵام به‌مه‌رجێك ئه‌گه‌ر بگه‌ڕێنه‌وه سه‌ر هه‌مان ڕه‌وشت و ئاکاری پێشویان، چونکه ئه‌و جیهانه شێواوه ناتوانێت له به‌رانبه‌ر ڕه‌وشتی مسوڵماناندا خۆی بگرێت).

له به‌رهه‌مه‌کانی: (الثقافة الإسلامية).

*مۆری که‌یل(عبدالصمد کیل)، که‌سێکی که‌نه‌دییه، چه‌ند بڕوانامه‌یه‌کی له بواری توێژینه‌وه‌کانی ئیسلامی و ئیسپانیدا هه‌یه، زمانه‌کانی عه‌ره‌بی و ئینگلیزی و فه‌ره‌نسی ده‌زانێت، له وته‌یه‌کی گرنگدا ده‌ڵێت: (ئیسلام هاوسه‌نگی له ژیاندا پێبه‌خشیم، ئه‌و که‌سه‌ی ئیسلام به‌ده‌ستبێنێت هیچی نه‌دۆڕاندووه، به‌ڵام ئه‌و که‌سه‌ی ئیسلامی نه‌بێت چی به‌ده‌ستهێناوه؟! له ئیسلامدا ئه‌وه‌م دۆزییه‌وه که له‌گه‌ڵ ئه‌قڵدا ده‌گونجێت و ئه‌وه‌ش فێربوم که مرۆڤ چی به ئه‌قڵی ئیمانی و ئیمانی ئه‌قڵی ده‌به‌خشێت)عظماء و مفكرون يعتنقون الاسلام، محمد طماشي، لا ٢٣٥.



*واسیف راعی، توێژەرێکی ئوردنییە دوای ململانێیەکی دەرونی سەختی چەند ساڵەی مسوڵمان بو.. واسیف دەڵێت: بۆماوەی نزیکەی بیست ساڵ من بە مەسیحی دادەنرام..کاتێ ڕاستی هەڵوێستی خۆمم لەو ژیانەدا بۆ دەرکەوت و ڕێگاکەمم دۆزییەوە.. مسوڵمان بوم..هەستم بە ئاسودەییەکی بێئەندازەکرد..بەجۆرێك هەستم بە ئارامی دەرونم کرد کە ناتوانم وەسفی بکەم..گەیشتمە ڕاستی..گەیشتمە لوتکەی ئەو ئامانجەی داوام دەکرد..وەك بڵێی هەر لە سەرەتای گەشتەکەمەوە ئیسلام ئامانجم بوبێت..ئەوکات دەرکم بەو سەرگەردانییە کرد کە پێشتر تێیدا ژیابوم..ئەوکات زانیم کە هەمو ژیانم لە خەوێکی قوڵ و تاریکییەکی ئەنگوستەچاودا بەڕێکردووە..بەڵام بەیانی گزنگیدا..لەخەوی بێئاگایی بێداربومەوە.. هەستم کرد کە هەمو شتێك لە دەرونمدا خەریکە دەگۆڕێت و ڕون دەبێتەوە..ئەستەمە کەسێك هەست بەو خۆشییە بکات کە ئەو ئەزمونەی نەدیبێت..)

هەروەها دەڵێت: ئەگەر بڵێم: بەڕاستی من لە تاریکییەکی ئەنگوستەچاودابوم، کاتێ لەناکاو بەرچاوم ڕون بووەوەو..هەمو شتێکی دەوروبەری خۆمم بە ڕاستی بینی..ئەوکات گوتم من لە خەون و خەیاڵدا ژیاوم و ئێستا بێداربومەتەوە..لەوانەیە بەتەواوی مافی باسکردنی ئەو هەڵوێستەم نەدابێت..بەڵام دەتوانم بڵێم ئەوکات هەستم بە مرۆڤێتی خۆم کرد و..خۆمم دۆزییەوە).

هەروەها دەڵێت: (ئەو ترس و گومانانەی لە بیروهۆشمدا دەخولانەوە هەموی ڕەوینەوە..توانا و ئازایەتییەکی تەواوم لەلا دروست بو بۆ ئەوەی ڕوبەڕوی هەمو ئەو ئەگەرانە ببمەوە، دڵنیابوم ئەو کارەی کردومە کارە ڕاست و دروستەکەیەو..ئەو کارەیە کە وەدیهێنەری گەردونی گەورە لە منی دەوێت، ئیتر چ هێزێك هەیە من بترسێنێت؟!).

لە بەرهەمەکانی: (کنت نصرانیاً).



*(قرّة العين)، خانمێكی مه‌سیحییه‌و له‌ خێزانێكی مه‌سیحی دینداردا ژیاوه‌، له‌ زانكۆی (په‌نسلڤانیا) خوێندویه‌تی، مسوڵمان بوه‌، ئاره‌زوێكی زۆری بۆ خوێندنه‌وه‌و گه‌ڕان هه‌یه‌، به‌ تایبه‌تی له‌ ئایینه‌كاندا و توانی له‌ ئیسلامدا هه‌مو وه‌ڵامه‌كانی ده‌ستبكه‌وێت.

*میخائیل هێمز، ئینگلیزه‌، چه‌ند خاڵێكی سه‌رنجڕاكێش ئه‌ویان به‌ره‌و ئیسلام هێنا، دوای گه‌ڕان و توێژینه‌وه‌یه‌كی دورودرێژ له‌ دوای ئاینێك، كه‌ هیچ گۆڕانكارییه‌كی به‌سه‌ردا نه‌هاتبێت و له‌گه‌ڵ عه‌قڵ و مه‌نتیقدا تێكنه‌گیرێت.

*ماری ئۆلیڤه‌ر: خانمێكی مه‌سیحی بو، باوه‌ڕه‌كه‌ی نه‌یتوانی قه‌ناعه‌تی ته‌واوی پێبێنێت، بۆیه‌ ده‌ستیكرد به‌ لێكۆڵینه‌وه‌ له‌ ئایینی بوزی و هیندۆسی، به‌ڵام كاتێك ئه‌وه‌ی به‌دوایدا ده‌گه‌ڕا ده‌ستی نه‌كه‌وت گه‌شته‌كه‌ی به‌ ئیسلام كۆتایی هات، چونكه‌ باوه‌ڕی وایه‌، كه‌ ئیسلام تاكه‌ ئایینه‌ كه‌ وه‌ڵامی هه‌مو داواكارییه‌كانی مرۆڤ ده‌داته‌وه‌.

*تۆماس محمد كلایتۆن، ئه‌مریكییه‌كی مه‌سیحی بو، ئایینه‌كه‌ی قه‌ناعه‌تی ته‌واوی ئه‌وی به‌ده‌ستنه‌هێنا بۆیه‌ وازی لێهێنا، وارێكده‌كه‌وێت كه‌ ڕۆژێكیان وه‌رگێڕدراوێكی واتاكانی قورئانی پیرۆزی ده‌كه‌وێته‌ ده‌ست، ئه‌وه‌ش ڕێگای حه‌قیقه‌تی بۆ والا كرد و ده‌ستیكرد به‌ لێكۆڵینه‌وه‌ له‌ كتێب و دانراوه‌ ئیسلامییه‌كان و پێوه‌ندیكردن به‌ كۆمه‌ڵێك بانگخواز، تا له‌ كۆتاییدا هه‌مو ئه‌و هۆكارانه‌ به‌ره‌و ئیسلامیان برد و له‌ ساڵی ١٩٤٧ز مسوڵمان بو.

*عائیشه‌ بریگێت هۆنی، له‌ خێزانێكی مه‌سیحی ئینگلیزیدا گه‌وره‌بووه‌و ئاره‌زوی له‌ فه‌لسه‌فه‌ بوه‌و له‌و بواره‌دا كاری كردووه‌، به‌ مه‌به‌ستی ته‌واوكردنی خوێندنه‌كه‌ی گه‌شتی كرد بۆ كه‌نه‌دا، له‌وێ له‌ زانكۆدا هه‌لی ئه‌وه‌ی بۆ ڕه‌خسا كه‌ به‌ ئیسلام ئاشنابێت و مسوڵمان ببێت.. عائیشه‌ ده‌ڵێت: (هه‌رچه‌ند هه‌وڵ بده‌م ناتوانم وه‌سفی ئه‌و كاریگه‌رییه‌ بكه‌م كه‌ قورئانی پیرۆز له‌سه‌ر دڵی منی دانا، هه‌ر سوره‌تی سێیه‌مینم



له قورئانی پیرۆزدا ته‌واوكرد و یه‌كسه‌ر كڕنوشم بۆ وه‌دیهێنه‌ری ئه‌و گه‌ردونه برد، ئه‌وه یه‌كه‌مین نوێژی من بو له‌ناو ئیسلامدا). رجال ونساء أسلموا، لا١٩٧.

زۆر كه‌سی تر ماون له‌وانه‌ی به‌ره‌و نوری ئیسلام هیدایه‌ت دراون، له‌وانه:

– هونه‌رمه‌ند: جێرمن جاكسۆن.

– شاعیر: (ئیلیاس ته‌عمه(أبو الفضل الوليد)).

– ده‌رهێنه‌ری سینه‌مایی ئه‌مریكی: دكس ئینگرام.

– خانمه پێشكه‌شكاری ئه‌ڵمانی: كریستیانی باكر.

– هه‌ردو لاوی فه‌ره‌نسی: عه‌بدولره‌حمان و كاترین تۆرێز، نه‌وه‌كانی دامه‌زرێنه‌ری پارتی شیوعی فه‌ره‌نسی(مۆریس تۆرێز).

– بانگخواز: ئه‌حمه‌د فۆن دنڤه‌ر، خاوه‌نی كتێبی: (الإسلام و عيسى) و (يوم مع الرسول).

– مۆسیقاری فه‌ره‌نسی: جوڵیان نارس.

– بیرمه‌ندی سویسری: تیتۆس برۆكهاردت، خاوه‌نی كتێبی (الفنّ في الإسلام).

– خانمه پرۆفیسۆری سویدی: ئان سۆفی ڕۆلۆ، سه‌رۆكی به‌شی ئایینه‌كانی زانكۆی (مالمۆ).

– خانمه پرۆفیسۆری ڕوسی: ڤالێریا بوروخوڤا، مامۆستای فه‌لسه‌فه و زمانه‌كان له زانكۆی (مۆسكۆ).

– پرۆفیسۆری یابانی: مورته‌زا كوراساوا.

جگه له‌مانه‌ش زۆر كه‌سی تر هه‌ن كه ئێمه نایانناسین.. به‌ڵام خوا ده‌یانناسێت.

به‌ڕاستی ئه‌وانه.. محمد(ﷺ)یان به‌ده‌ستهێنا و.. مه‌سیحیشیان له‌ده‌ست نه‌دا.



ئەوانە حەقیان ناسی و بە فەزڵی خوا لە تاریکییەوە بەرەو ڕوناکی چون..

ئەوانە ڕاستگۆ بون و شوێنی ڕەزامەندی خودا کەوتن..

ئەوانە خودا لەنێو بەندەکانیدا هەڵی بژاردون.

* * *

وها إنا وإن كنا غفلنا فإنا بعد صحوتنا نقول
هو الإسلام دين الله يبقى ويحمل صرحه جيل فجيل
وإنا في العقيدة قد غرسنا كما غُرست بطيبتنا النخيل
مع الهادي و صحبته هوانا وشرح الحب أمر يستحيل

بەسەریـــانا بەسەر بـــاقی سەحـــابەو ئـــال و یـارانـــا
باریَیْ خـــودا هـــەر ئـــان و وەقـــت و ساعـــە(رضوانه)
باریَ، یـــارەبی هەر لەحـــزە سەد لــــەك بارشی رەحمەت
لەسەر ئەو، هەم لەسەر ئەو جەمعی ئال و سەحب و یارانه[1]

**تەواو..**

لەسەرەتا و کۆتاییدا سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگار و درود و سەلامیش برژیَ بەسەر (محمد)ی پێغەمبەرمان و هاوەڵ و یارە دڵسۆز و پاك و ماندونەناسەکانی..

(١) دیوانی مەحوی، قەسیدەی بەحری نور لا٤٨٣-٥٠١.

# سەرچاوەکان

القرآن الكريم

١. صحيح البخاري.

٢. صحيح مسلم.

٣. مسند أحمد.

٤. سنن الترمذي.

٥. سنن أبي داود.

٦. سنن ابن ماجه.

٧. العهد القديم والعهد الجديد.

٨. الأبطال وعبادة الأبطال. توماس كارلايل.

٩. الإسلام. هنري ماسيه.

١٠. الإسلام: خواطر وسوانح. هنري دي كاستري.

١١. الإسلام الصادق، .الإسلام بعد مئه عام. جورج برنارد شو.

١٢. الإسلام في قفص الاتهام. د. شوقي أبو خليل.

١٣. الإسلام والعرب. روم لاندو.

١٤. الإسلام منهج الحياة. فيليب حتّي.

